ناوی کتێب: دڵت بێنەوە

ناوی نووسەر: یاسەمین موجاهید

وەرگێڕانی بۆ کوردی: ئاراس عیزەدین

دیزاینی بەرگ: ناوەندی ڕێنوێن

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: سێیەم ٢٠٢١

چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

تیراژ: (١٠٠٠) دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٩٢٢)ـی ساڵی (٢٠١٩)ـی پێ دراوە.



RENWEN

**ناوەندی ڕێنوێن**

07701932749 - 07501269689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

# دڵت بێنەوە

دیدگایەکی تایبەت لە بارەی
ڕزگاربوون لە کۆت و بەندەکانی ژیان

یەکێکە لە پڕفرۆشترین پەرتووکەکان

# دڵت بێنەوە

پەرتووکی دڵت بێنەوە، باس لە ئاوێتەبوونی ڕۆح و جەستە دەکات لە ڕێی خۆشەویستی و ئاشتییەوە. هەمووومان پێویستمان بەم پەرتووکەیە.

پرۆفیسۆر تاریق ڕەمەزان

ئەم پەرتووکە پەیامێکی لێوانلێوە لە هێز و توانا بۆ هەموو تاقم و گرووپەکانی ئەم جیهانە. بە شێوەیەکی ڕێک و جوان و مرۆڤانە داڕێژراوە تاکو هەمووان سوودی لێ وەربگرین لە قۆناغە جیاجیاکانی ژیانماندا.

ذە موسلیم ئۆبزێرڤە

## پێڕست

«پەرتووکی (**دڵت بێنەوە**)، ڕەنگدانەوەی پەیامی ڕۆحیی ئایینی ئیسلامە: سادە و کاریگەر و باڵانوێنە. لە ڕێی گەشتێکی تایبەت و گیانیبەگیانییەوە، یاسەمین موجاهید خوێنەرانی بە ڕێچکەیەکی زۆر تایبەتدا گوزەر پێدەکات. لە قووڵایی دڵەوە قسە بۆ دڵەکان دەکات و سەرکەوتووە لە ئارامکردنەوە و قایلکردنی مێشکەکان. ئەم پەرتووکە شایستەی ئەو سەرکەوتنانەیە کە بەدەستی هێناوە، ئەم چاپە نوێیەی (کە چوار بەشی بۆ زیاد کراوە)، خەڵاتێکە و تژییە لە هیوا و ئومێد. پەرتووکێکە دەستباری هەموو کەسێکە بۆ نزیکبوونەوە لە پەروەردگار و نزیکبوونەوە لە دڵی کەسانی تر. پەرتووکی (**دڵت بێنەوە**)، باس لە ئاوێزانبوونی ڕۆح و جەستە دەکات لە ڕێی خۆشەویستی و ئاشتییەوە. گشتمان پێویستمان بەم پەرتووکەیە.»

**پرۆفیسۆر تاریق ڕەمەزان**

«پەرتووکی (**دڵت بێنەوە**)، دڵەکان لە هیوا و ڕووناکی پڕ دەکات، پەرتووکێکی نایاب و ناوازەیە. ئەم پەرتووکە وەک هاوسەفەر و هاونشینێکی ئازیز وایە لە گەشتی پێشبینینەکراوی ژیاندا. بۆچوون و زانیاری و چیرۆکە سەرنجڕاکێشەکانی خاتوو یاسەمین بووژانەوە و سروشی بە خوێنەرانی لە سەرانسەری جیهان بەخشیوە.»

**پیتەر گڵاود - دیزاینەری براوەی خەڵات**

«بە کورتی ئەم پەرتووکە زۆر وشە بە وشەی پڕ بە پێست و مانایە. خاتوو یاسەمین بە شێوەیەکی جوان و ناوازە لە شوێنی خۆیدا باسی هەموو دڵشکان، ئازار، هیوابڕاویٰ و لەدەستدانەکانی کردووە کە بەسەرماندا دێن. دەتوانم بڵێم وات لێ دەکات جارێکی تر بە هەمان شێوەی پێشوو لە نارەحەتییەکان ناڕوانیت.»

**ساهیل یو کەی**

«نووسینەکانی یاسەمین موجاهید ئامۆژگارین لە لایەن ڕاوێژکارێکی ژیر و زانا، یاخود هاوڕێیەکی متمانەپێکراوەوە، ئەم پەرتووکە ڕێگە بە خوێنەرانی دەدات لەگەڵ هەڵدانەوەی ڕووپەڕەکانی، ئارامی و سووکنایی بەدەست بهێنن کاتێک نارەحەتی و ئاستەنگیەکانی ژیان تەنگیان پێهەڵدەچنێت. پوخت بگوفتین ئەم پەرتووکە پێویستە لە کتێبخانەی هەموو ئافرەتێکی مسوڵماندا هەبێت.»

**گۆڤاری عزیزە**

«پەیڤەکانی نێو ئەم پەرتووکە لە تواناییاندا هەیە فرمێسک لە چاوەکانت بچۆڕێنن، فرمێسکێک بەهۆی تێگەیشتن و دیدەنکردنی حەقیقەت و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی ئەو ڕاستییە لە خۆتدا دروست دەبێت. ئەم پەرتووکە پەیمانی گەشتێکی بەرەو ڕووناکی دەدات بە خوێنەرانی، پەیمانەکەیشی بەجێ گەیاندووە.»

**موسلیم ومێن ئێکسپەوزد**

«پەرتووکی (**دڵت بێنەوە**) تێڕوانینێکی تەواو جیاوازی پێبەخشیم لەبارەی مەبەستی ئەم ژیانەوە. بڕوا ناکەم کەسێک هەبێت ئەم پەرتووکە بخوێنێتەوە و کەڵک لە داناییەکەی وەرنەگرێت.»

**گۆڤاری سیستەرز**

«لە سەرووی جوانییەوەیە... زۆر سوپاس خاتوو یاسەمین بۆ ئەم پەرتووکە سەرنجڕاکێشە. دیدگای منت لە بارەی ئەم ژیانەوە بە تەواوی گۆڕی، فێرت کردم دەستبەرداری ئەو خەیاڵاتانە بم کە تێیدا دەژیم و تەنها سەرنجم لەسەر ڕۆژیی دوایی بێت. سوپاس بۆ بەڕێزتان واتان لێ کردم بڕوام بە دەرفەتی دووەم هەبێت. دەزانم کامڵ و بێ کەموکوڕی نیم، بەڵام هەوڵ دەدەم ببم بە کەسێکی باشتر. وتەکانت سوکنایین، پارمەتیان داوم بە خەندەوە و بە ئارامی بنووم تەنانەت لە ناڕەحەتترین شەوەکانی ژیانمدا. هیوای باشترینت بۆ دەخوازم.»

**داليا ئی. ئێن**

«ئەم پەرتووکە ڕەنگدانەوەی ناوەکەیەتی. پەرتووکێکە زۆر یارمەتی داوم و تامەزرۆم چەندبارە بیخوێنمەوە. پەرتووکێکی زۆر بەسوودە بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی کە بە قۆناغێکی سەختی ژیانیاندا تێدەپەڕن. پەرتووکێکە کە خوێندنەوەی پێویستە.»

**ئەبو ف.**

«خاتوو یاسەمین موجاهید بە شێوازێکی زۆر جوان و ڕێک ئەم پەرتووکەی نووسیوە، پەیامێکی پێویست و هەمیشەیی دەگەیەنێت بە خوێنەران. بە شێوەیەک بابەتەکانی نووسیوە وەک ئەوەی قسە بۆ هاوڕێیەکی بکات، بۆچوونەکانی بە شێوەیەکی هاوڕێیانە دەگەیەنێت. زۆر لام سەخت بوو واز لە خوێندنەوەی پەرتووکەکە بهێنم. ئەم پەرتووکە پێشنیار دەکەم بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە هەست دەکەن شتێک لە ژیانیاندا ونە. بڕوام وایە خاتوو یاسەمین بابەتەکەی بە تەواوی پێکاوە. ئەگەر هەست دەکەیت خەریکە لەسەر ڕێگا ڕاستەکە لادەدەیت، یاخود لەسەر ڕێگاکە لات داوە، ئەم پەرتووکە توانای هەیە بتگەڕێنێتەوە سەر ڕێگا ڕاستەکە. پەرتووکێکی زۆر پڕمانایە و تێگەیشتن لێی ئاسانە.»

دریو

«ئەم پەرتووکە ژیانی بە تەواوی گۆڕیم، یەکێکە لە ناوازەترین ئەو پەرتووکانەی تاکو ئێستا خوێندومەتەوە. سەرەتا یارمەتی دام بە خۆمدا بچمەوە و خۆمم خۆش بوێت، هەروەها فێری کردم هیچ شتێک لەم جیهانەدا هەمیشەیی نییە جگە لە پەروەردگار، پەروەردگار تاکە کەسە کە دەبێت بۆ هەموو شتەکان پشتی پێ ببەستین. هەندێک جار سەخت بوو خوێندنەوەی، چونکە هێندە ئاسان نییە شتەکان ڕاستەوخۆ بچێتە قوولایی دڵ و دەروونتەوە، بە گشتی پەرتووکێکی زۆر پڕ مانا و بەسوودە.»

ئەمیرە جی

«ئـەم پەرتووکـە یادخەرەوەیەکـی زۆر بەسـوودە بـۆ چۆنێتـی بیرکردنـەوە و ژیانکـردن. لـە ڕاسـتیدا دەتوانرێـت بەسـەر مسـوڵمان و نامسـوڵماندا پەیـڕەو بکرێت. تێگەیشـتن لـە نووسـراوەکانی خاتـوو یاسـەمین زۆر ئاسـانە. پەرتووکێکە دەتوانیت بە ئاسـانی لێی تێبگەیت، بـەڵام سـوودێکی باشـت پـێ دەگەیەنێـت، ئەگـەر دابنیشـیت و بیـر بکەیتـەوە چۆن ئـەم شـتانە لـە ژیانی خۆتـدا پەیڕەو بکەیت. ناوبەنـاو ئـەم پەرتووکـە دەخوێنمـەوە.»

**جولی ٤٠٨**

«ئەم پەرتووکە تێڕوانینی منی لەبارەی ئەم ژیانـەوە بە تـەواوی گۆڕی. کاتێک پەرتووکەکـەم دەخوێنـدەوە لـە چەندین شـوێندا (ئەهـا) م بـۆ باسـەکان دەکـرد. نموونەکانـی نـاو پەرتووکەکـە تێگەیشـتن و خوێندنـەوە و بەسـتنەوەی بـە ژیانـی ڕۆژانـەوە ئاسـان دەکات. پێویستە پەرتووکی (**دڵت بێنەوە**)، لـە کتێبخانەکەتدا هەبێت، چونکە یارمەتیت دەدات لـە نەهێشـتنی ئـەو ئازارانـەی ڕۆژانـە تووشـی دەبیت. هەروەهـا یارمەتیت دەدات بۆ تێگەیشـتن لـە نارەحەتـی و لەدەسـتدان و خۆشەویسـتی و خەمـەکان، کاتێک پەیوەسـتی دەکات بە قورئان و فەرمـوودە و چیرۆکەکانـی ژیانـی پەیامبەرمـان موحەمـەد و هاوەڵـە بەڕێزەکانیـەوە.»

**ئەمەزۆن کەستەمە**

«خوێندنەوەیەکی هاندەرانەیە. پەرتووکێکی نایابە، باس لەوە دەکات پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگاردا چۆن بێت. باسەکان پەیوەست کراون بە قورئانی پیرۆز و سونەتەکانی پەیامبەرمان موحەمەدەوە. پەرتووکێکی زۆر بەسوودە بۆ هەمووان، بە تایبەت ئەو کەسانەی هاوشێوەی خۆم پێشبینی شتانێکی زۆر دەکەن لەم ژیانە و پەیوەندییەکانی ئەم ژیانە. تێڕوانینێکی دروستمان دەداتێ لەبارەی ئەوەی سەرنجەکانمان بخەینە سەر چ شتێک. زۆر لام نارەحەت بوو پەرتووکەکە دابنێم کاتێک دەستم بە خوێندنەوەی کرد. بەڕاستی پەرتووکێکە تەواو هانت دەدات.»

**دانا ئێم**

«بەرهەمێکی زۆر نایابە. سوپاس بۆ پەروەردگار بەهۆی ئەم پەرتووکەوە توانیم لە ماوەی یەک هەفتەدا کۆتایی بەو شتە بهێنم کە لە ماوەی دوو ساڵی دوای جیابوونەوەم لە مێردەکەم شکستم تێیدا هێنا. زۆر سوپاس خوشکە یاسەمین.»

**رایفە بی**

«السلام عليكم! ئەم پەرتووکە زۆر بێوێنەیە. لە سیمینارێکدا گوێم لە نووسەری پەرتووکەکە بوو، پەرتووکەکەم لەوێ کڕی. ئەم پەرتووکەم زۆر خۆش دەوێت، تەنانەت بۆ کچەکەم و خوشکێکم کڕیم. پێشنیار دەکەم هەمووان ئەم پەرتووکە بخوێننەوە. خاتوو یاسەمین موجاهید کێشە و گرفتی دڵەکان بە شێوەیەک ڕوون دەکاتەوە کە دڵت پێی دەکرێتەوە. داواکارم لە پەروەردگار دڵەکانتان پڕ بکات لە خۆشەویستی خۆی. شتانێکی زۆر باش و بەسوود لەم پەرتووکەدا هەن. پەروەردگار پاداشتی بەخێرتان بداتەوە خوشکە یاسەمین، بەهۆی باسکردنی تێڕوانینە بەسوود و چێژبەخشەکانت بۆمان، بۆ فێرکردنمان و گرنگیپێدانمان.»

کەی پۆڵمان

«ئەم پەرتووکە پێشنیار دەکەم بۆ هەموو خوێنەران و ئاشقانی پەرتووک. ئەم پەرتووکەم خوێندۆتەوە، بەڵام ڕۆژانە بەشێکی لێ دەخوێنمەوە کە نزیکەی پێنج خولەکێک دەخایەنێت و ژیانی ڕۆژانەم بیر دەهێنێتەوە. ئەم پەرتووکە یادخەرەوەیەکی زۆر باشە، هاوکارێکی باشە لە ساتی تووشبوون بە ناڕەحەتی لەم جیهانەدا، هەروەها هیوامان پێ دەبەخشێت لەبارەی ژیانی دواییەوە. پێویستە ئەم پەرتووکە بخوێنرێتەوە، چونکە هاندەرێکی زۆر باش و بەسوودە.»

ڕێجینا ئۆ

«سـاڵێک لەمەوبـەر مێردەکـەم بڕیـاری دا جێـم بهێڵێـت، زۆر داڕووخـام، پەشـۆکاو و خەمبـار و بێـزار بـووم، سـوپاس بۆ پەروەرێنم کە ڕێنوێنی کردم و چاوم بـە نووسـینەکانی بەڕێزتـان کـەوت. سـاڵی ڕابـردوو سـاڵێکی زۆر ناخۆش بـوو بۆ مـن، هەرچەندە بە پڕۆسـەیەکی زۆر باشدا تێپەڕیم تاکو فێر ببم چۆن دڵم چاک بکەمەوە. فێر بووم کە دەبێت تەنها پەروەرێن لە دڵەکانماندا بێت، هەموو شـتەکانی تری ژیانمـان بەخششـێکن بـۆ خزمەتی خۆمـان، تەنانـەت ئەگـەر شـتانێکی حەڵاڵیش بن. نووسـینەکانت زۆر یارمەتیان دام. سێ هەفتە لەمەوبەر باوکـم (پەروەرێـن لێـی خـۆش بێـت)، کۆچـی دوایـی کـرد، تـەواوی خێزانەکـەم و ناوچەکەیشـی تووشـی شـۆک و نائومێدی کرد.

یەکەمین شـتێک بـە دڵمدا هـات بریتـی بـوو لـە (إنا لله و إنا اليه الراجعون)، «ئێمـە موڵکـی پەروەردگاریـن و هـەر بـۆ لای ئـەو دەگەڕێینەوە»، إن شـاء الله باوکم گەڕاوەتەوە بۆ ماڵە سـەرەکییەکە کە بەهەشـتە. لەبری ئـەوەی بێزار بـم، زۆر سـوپاسگوزاری پـەروەردگار بـووم کە ئـەوی کـرد بـە باوکـم و بۆ ماوەیەکی زۆر لـە ژیانمـدا بـوو. هەروەها پەروەرێنمان هەمیشە باشترین شتەکان هەڵدەبژێرێت بۆمان، بۆیە باوەڕم وایە ئەوە باشترین کات بووە بۆ باوکم کە جێمان بهێڵێت. دەمەوێت لـە ناخـی دڵمـەوە سوپاست بکـەم، چونکە لـەو بڕوایـەدام ئەم کەسـەی ئێسـتا نەدەبووم، کە توانیـم بەرگـەی لەدەسـتدانی یەکێک لـە ئازیزترین کەسـەکانم بگرم، ئەگـەر نووسـینەکانتم نەخوێندایەتـەوە. ویسـتم بڵێـم یەکێـک لـە نووسـینە تایبەتەکانت هانـی دام، بـەڵام وانەبوو، هەمـوو نووسـینەکانت کاریـان تێکـردم و لـە ڕووی دەروونییـەوە هانیـان دام. لـە پـەروەردگار دەپاڕێمـەوە پاداشـتی بەخێرت بداتـەوە و بەردەوامـت بـکات لەسـەر کارەکانت. پـەروەردگار ڕەحمـت پێ بـکات و خۆشـەویسـتانت بپارێزێت. تکایـە نـزای بەخێـر بـۆ باوکـم بکـەن.»

ئالا

«حەز دەکەم سوپاسێکی بێپایانت بکەم، چونکە تەواوی ژیانت گۆڕیم، پەروەردگاری مەزن ڕەحمەت پێ بکات. بە قۆناغێکی سەخت و ناخۆشی ژیانمدا تێدەپەڕیم، تووشی نیگەرانی، خەمۆکی، فەراغی ڕۆحی و نائومێدی زۆر بووم. پاشان چاوم بە یەکێک لە بابەتەکانت کەوت، ئێستا زۆر دڵخۆشم. سوپاسی بێپایان بۆ پەروەردگاری مەزن. زۆر سوپاست دەکەم، تکایە بەردەوام بە لە نووسین، چونکە پەروەردگار توانا و بەهرەیەکی باش و بێوێنەی پێ بەخشیویت. هیوادارم پەروەردگار هەموو نزاکانم قبووڵ بکات کە بۆ تۆی دەکەم. لە ڕاستیدا تەنها توانیم ئەوەندە بڵێم، چونکە نووسینەکانت بە وشە وەسف ناکرێن.»

**مریم**

«وشەکانت زۆر کاریان تێکردم، دەبوو لەسەرخۆ بیانخوێنمەوە و هەناسەی قووڵ هەڵمژم. هەمیشە شانازی دەکەم بەوەی ماددەپەرست نەبووم، بەڵام زۆر پەیوەست بووم بەو کەسانەوەی کە خۆشم دەویستن تاکو دڵخۆشم بکەن. کاتێک نائومێدیان دەکردم، یاخود جێیان دەهێشتم، ژیانم دەهەژا. پێویستییەکی بەردەوام هەیە بۆ ئەوەی خۆش بویسترێی، لە ڕێی ئەو خۆشەویستییەوە دڵخۆشیم بەدەست دەهێنا. زۆری خایەند تاکو تێبگەم پێویستە ئەم خۆشەویستییە بەهۆی پەیوەندیم لەگەڵ پەروەردگارەوە دەستەبەر ببێت نەک خەڵکی. کەسێکی نموونەییم، بەخشەرێکم، دڵخۆشکردنی کەسانی دی دڵخۆشم دەکات، بەڵام سەختە تێبگەیت لەوەی کە نابێت پێشبینی هیچ شتێک لە خەڵکی و ئەم ژیانە بکەیت. سوپاس بۆ پەروەرێن، خوێندنەوەی وشەکانت وەک ئەوە بوو بە وردی پێداچوونەوەیەک بە خۆمدا بکەم کە پێشتر ئامادەی ئەنجامدانیم نەبوو، ئەمەیش زۆر یارمەتی دام. پەروەردگار ڕەحمەت پێ بکات، چونکە کەسێکی ڕاستەقینەی.»

**میهر**

«دەمەوێت بڵێم کە زۆر تامەزرۆی بابەتەکانتم. لە تەمەنی هەشت ساڵییەوە خوێنەرێکی باش و چالاک بووم، بە خێرایی پەرتووکم لە کتێبخانەکاندا خوێندۆتەوە. نووسەرەکانی وەکو (ڕۆمی، غەزالی، ئیقبال و زۆرێک لە نووسەرە بەناوبانگەکانی تر)م خۆش دەوێت، چونکە بۆ ڕۆحەکان دەدوێن. بۆچی ئەمە بە تۆ دەڵێم؟ چونکە دوای خوێندنەوەی نووسینەکانی زۆر کەسی بەتوانا و بلیمەت، دڵ و ڕۆحم لە بابەتەکانی بەڕێزتاندا دۆزییەوە. بە دڵنیاییەوە یەکێکیت لەو نووسەرانەی کە زۆر لام پەسەندیت. هەرکاتێک پێویستم بە هاندانی ڕۆحی و دەروونی بێت، دەگەڕێمەوە بۆ سەر بابەتەکانت. هەروەها کەسێکی زۆر خۆشەویستم دۆزییەوە، بە هاوڕوحی خۆمی دەزانم، خۆشەویستیم بۆ ئەو زۆر پەیوەستی کردووم بەوەوە. تەنها لە ڕێی نووسینەکانی تۆوە فێری خۆشویستنی ئەو دەبم کە هەرگیز لەدەست ناچێت و دەست بەو پەیوەندییەوە بگرم کە هەگیز ناشکێت. فێرت کردم خۆشەویستی ڕاستەقینە واتای چییە. تامەزرۆی نووسینەکانتم، زۆر هانم دەدەیت. بەڵێ! براکەم و هاوڕێکانیشم تامەزرۆ و شەیدای نووسینەکانتن. داواکارم لە پەروەردگاری مەزن باشترینی شتەکانت پێ ببەخشێت و بەردەوامت بکات لەوەی هۆکارێک بیت بۆ هاندانمان بەرەو ئەو. لەگەڵ خۆشەویستییەکی بێپایان و لەئامێزگرتنێکی گەرم و نزاکانمان بۆ بەڕێزتان!»

**موحسینە - باشووری ئەفریقا**

«ماوەیەک لەمەوبەر دەرفەتی چوونە ویبسایت و ڤیدۆکانتم هەبوو. پێش ئەوە بە دوای خۆراکی ڕۆحمدا بگەڕێم، بە دوای ئەو وشانەدا دەگەڕام کە دڵە ژەنگاوییەکەم چارەسەر بکات، پاشان هاتمە سەر ڤیدۆکانت و ماڵپەڕەکەت. ماشاء اللە خوشکی بەڕێزم! هیچ وشەیەک شک نابەم بۆ ستایشکردن و وەسفکردنی کاریگەری نووسینەکانت کە لەسەر دڵەکان و ڕۆحەکان هەیانە. هەر وشەیەک کە دەینووسیت کار دەکاتە سەر دڵم، نەفس و خۆبەگەورەزانیم تێکدەشکێنێت و دەمخاتە گریان. ناتوانم بە تەواوی سوپاسگوزاری خۆم دەربڕم بۆ کارە هاندەرەکانت و یادخستنەوە بەردەوامەکانت لە ڕێی کارەکانتەوە. پەروەردگاری باڵا بە بەهەشتی فیردەوست شاد بکات، لەم دونیا و لەو دونیادا پاداشتی بەخێرت بداتەوە.»

**منیرە - سەنگافورە**

«تەوەکول کارمان، یاسەمین موجاهیدم بیر دەهێنێتەوە. یەکەمیان شۆڕشێکی دەرەکی بەرپا کرد، دووەمیان شۆڕشێکی ناوەکی بەرپا کرد.»

**ما**

«خاتوو یاسەمین! بەڕێزتان ناناسم، بەڕێزیشتان من ناناسن، بەڵام هەست دەکەم زۆر لێمەوە نزیکیت! هەر وشەیەک کە دەینووسن زۆر کار دەکاتە سەر دڵم.»

**نوور**

«هەست دەکەم کە لە ژیانێکی دووڕوویيدا دەژیام، دەموت پەروەرێنم خۆش دەوێت، بەڵام کارەکانم ڕەنگدانەوەی وتەکەم نەبوون. گۆڕانکاری لە ژیانمدا ڕوویدا کاتێک مانای ڕاستەقینەی خۆشەویستی پەروەردگار و گرنگی ئەو خۆشەویستیەم بۆ دەرکەوت لە ڕێگای بابەتەکان و وانەکانتەوە. پاشان هەموو شتێک لە ژیانمدا بە باشی و ڕێکی بەڕێوە دەچوو.»

نەزیر

"ماشاء اللە! پەروەردگار توانایەکی زۆر باشی پێ بەخشیویت بۆ چوونە ناو دڵەکان و هەژاندنیان، وایان لێ بکەیت بەو شێوەیە کار بکەن کە پێویستە. سوپاس بۆ پەروەردگاری مەزن کە کەسانی وەک خاتوو یاسەمین موجاهیدی هێناوەتە بوون."

غازی أ

«پەروەردگار ڕەحمەت پێ بکات و بۆ هەمیشە بتپارێزێت، بە بەهەشتت شاد بکات و بۆ هەمیشە لە بەهەشتدا بە شادی بژیت. هەرگیز ئەو کاریگەریانە بە کەم مەزانە کە وشەکانت لەسەر کەسەکان هەیانە. داواکارم پەروەردگار لێت ڕازی بێت. ئەگەر شوێنێک هەبوایە قووڵتر لە دڵەکان، ئەوا وشەکانت پێی دەگەیشتن. تەنها دەمەوێت بزانیت چەندە خەڵاتێکی مەزن و هاندانێکیت بۆ کۆمەڵگای مسوڵمانان بەتایبەت گەنجان و لاوان. ڕەنگە هەستی پێ بکەیت یاخود هەستی پێ نەکەیت، بەڵام زۆرێک لە بابەتەکانت کاریگەری دەکەنە سەر ماڵەکان کە بەدەست کێشە و گرفتەوە دەناڵێنن. لە جیهانی ئێستاماندا کە هەموو شتێک بەرەو خراپی دەڕوات، نەک تەنها نموونەی نووسەرێکی باش، یاخود وتاربێژێکی

باشیت، بەڵکوو نموونەی هیوایت. هیوایەک کە هێشتا کەسانی پاک و باش ماون. ڕەنگە ئەمە نەزانیت، بەڵام ئەوەی خەڵکی زۆر جار لە بارەتەوە دەیڵێن، ئەوەیە کە ئامادەبوونت ئاسوودەیی بە هەموان دەبەخشێت. خۆم دان بەو ڕاستییەدا دەنێم، کاتێک کەسێک باسی ئەم وشە حەقیقیانەت بۆ دەکات، دڵ ناتوانێت پێی کاریگەر نەبێت.

یارمەتی زۆر کەست داوە تاکو ساتە ناخۆشەکانیان تێپەڕێنن، پەروەردگار پاداشتی بەخێرت بداتەوە. زۆر کەس هەن کاری باش و خێر ئەنجام دەدەن لەکاتێکدا پێشتر ئەنجامیان نەدەدا. بە پشتیوانی پەروەرێن کارە چاکەکانت هەمیشە زیاد دەبن هاوشێوەی زیادبوونی دۆلارەکانی ملیۆنێرێک، بەڵام جیاوازییەکە لە ڕۆژی قیامەتدا دەردەکەوێت. إنشاء الله ملیۆنەها جار لە ئەوان دەوڵەمەندتر دەبیت، هیوادارم لەو دونیادا شایەتی ئەوە بدەم و بە چاوەکانی خۆم ئەوە ببینم. هیوادارم پەیامبەرمان موحەمەد(ﷺ) بە خەندە و لەئامێزگرتنەوە پێشوازیت لێ بکات، چونکە یەکێکیت لە شوێنکەوتووانی پەیامبەرمان کە زۆر هەوڵت داوە جیاوازییەک لەم جیهانەدا دروست بکەیت و کردویشتە. ببورە ئەگەر کەمێک زیادەڕەویم کردبێت، بەڵام لە نووسینەکانتدا هێزم بەدەست هێنا تاکو پشت بە پەروەردگار ببەستم لە لاوازترین ساتەکانی ژیانمدا. خۆزگە لە نزیکی تۆدا گەورە دەبووم و دەبووم بە هاوڕێیەکی پڕ ئیمان و باوەڕ. ئەم پەیامەم لەبری هەزاران کەسی دانیشتووی لەندەنە کە بەهۆی تۆوە هان دراون. پەروەرێن پاداشتی بەخێرتان بداتەوە! هەست دەکەم پێویستە لێرەدا بوەستم، یاخود دەبێت بۆ هەمیشە بەردەوام بم لە نووسین... السلام علیکم!»

محمد ا

«دوای ساڵێک ئەم بابەتە دەخوێنمەوە، هەست دەکەم ئەو بابەتەیە کە گۆڕانکاری لە مندا دروست کرد. هەرگیز بەڕاستی نەچووبوومە ناوەڕۆکی ئایینی ئیسلامەوە و بە باشی پێوەی پابەند نەبووم. ژیانم لە تاریکیدا بوو لەگەڵ کەسانێکدا کە تەنها کەمیان دەکردمەوە بۆ ئاستێک کە نەدەبوو وابم. بە تەواوی کەوتمە ناو قووڵایی ئەم دونیایەوە. شتانێکم ئەنجام دەدا کە هەرگیز شانازییان پێوە ناکەم. بەردەوام شکستم دەهێنا. پێم هەڵدەکەوت و چی دی خۆم نەدەناسیەوە. شەوێکیان شتێکی ناخۆش ڕوویدا، لەو کاتەدا زانیم پەروەردگار هەمیشە لەگەڵمدایە، بەڵام ئەوە من بووم پەروەردگارم فەرامۆش کردبوو، ئافرێنەر و دروستکاری مەزنم فەرامۆش کردبوو. ئەو شەوە بە خۆمم وت ئیتر بەسە و گەڕامەوە بۆ ناو ئیسلام. گەڕامەوە بۆ لای پەروەرێنم. لەدوای ئەو شەوەوە، بەردەوام بووم لە گەشتی گۆڕانکاریکردن لە ژیانمدا. لەو گەشتەدا کە پەروەرێنم کاپتنەکەم بوو، توانیم ٣٦٠ پلە ژیانم بگۆڕم. بیرم نایەتەوە ڕۆژێک بێ حیجاب بووبم.

بیرم نایاتەوە ڕۆژێک نوێژەکانم ئەنجام نەدابێت، یاخود نەچووبم بۆ مزگەوت، یاخود بەشداری وانە ئایینییەکانی ڕۆژانەم نەکردبێت. خاتوو یاسەمین، ناتوانم تەواو سوپاست بکەم بۆ داگرتنی ئەم بابەتە، بەڕاستی ڕاستەوخۆ کار دەکاتە سەر دڵەکان. گوێم لەوە بوو کە وتت: کلیلەکانم لەم دونیایەدا هەڵگرت و دامە دەست پەروەرێنی مەزن. ئافرەتێکی زۆر کاریگەریت و ئومێدم پێتە. زۆر سوپاس!»

حومەیرە!

«پەروەرێنی مەزن بە بەهەشتی فیردەوست شاد بکات کە بەرزترین شوێنی بەهەشتە، ئامین! تەنانەت ناتوانم باسی ئەوە بکەم چەندە بەخششێکی گەورەیت خوشکە یاسەمین. لە ڕێگای نووسینەکانتەوە هاتیتە نێو ژیانمەوە و بەردەوام بیروباوەڕم بەهێز دەکەن. سوپاس و ستایش بۆ پەروەرێن! هانی زۆر لە هاوڕێکانم و خۆشەویستانت داوم کە زۆر جار باسی نووسینەکانی تۆیان بۆ دەکەم. بەڕاستی پەروەرێن وەڵامی نزاکەتی داوەتەوە، ئەگەر نزات کردبێت تاکو ببیتە هۆکارێک و ئامرازێک بۆ ڕێنماییکردنی ئەم ئوممەتـە.»

**هاجەرە م.**

«سەرەتای ئاشنابوونم بە خاتوو یاسەمین موجاهید لە ڕێگای چەند کورتە ڤیدۆیەکیەوە بوو کە لە یوتوب بڵاو کرابوویەوە. وتەکانی و شێوازی باسکردنی بابەتەکان زۆر سەرنجی ڕاکێشام و پێیان کاریگەر بووم. لە کاتی گەڕانم بە دوای بەرهەمەکانیدا، چاوم بە پەرتووکی (**دڵت بێنەوە**) کەوت، دوای خوێندنەوەی پەرتووکەکە، ئامەزرۆییەکی زۆرم هەبوو بۆ وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی، تاکو بتوانم لەم ڕێگەیەوە سوودێک بگەیەنم، هەروەها خاتوو یاسەمین زیاتر بە کەسانی چواردەورم بناسێنم. پێشنیار دەکەم پەرتووکی (**دڵت بێنەوە**)، بخوێننەوە، چونکە ڕێنوێیتان دەکات بەرەو ڕێگای پەروەرێن، هەروەها ئاسوودەیی دەبەخشێتە دڵەکان.»

**وەرگێڕ- ئاراس عیزەدین**

*دەمەویت بە هەر مرۆڤێک بڵێم ئەگەر لە ژیانتدا بوارت هەبوو یەک کتێب بخوێنیتەوە، ئەوا با کتێبی (**دڵت بێنەوە**) بێت ..

بەڕاستی شایەنی خوێندنەوەیە، نکوڵی لە ڕاستی و دروستی پەیڤەکانی ناکرێ دەربارەی ژیان و مەبەستی بوونمان لەم دنیایە و کۆی ئەو شتانەی لە ژیندا دێتە ڕێمان. هەمووی تاقیکردنەوەی ئیلاهیە و ژیانی فانی و کاتی دنیایی درەنگ یان زوو کۆتایی دێت و بەرەو جیهانێکی هەمیشەیی کە تێیدا پاداشتی تاقیکردنەوە دوونیاییەکانمان وەردەگرینەوە...

کتێبێکە ئەستەمە لە کاتی خوێندنەوەی لە زۆر کار پەشیمان نەبیت کە تا ئێستا کردووتە، لە کەمتەرخەمیت لە پەرستشەکانت پاشگەز نەبیت کە فەزڵی کۆمەڵێک شتی دنیایت داوە بەسەر پەیوەندییەکانتدا لەگەڵ کردگار ...خۆزگە بتوانین وشە بە وشەی ئەو کتێبە لە ژیانماندا ڕەنگ بداتەوە، ئەوا بێگومان تێڕوانینی ژیانکردنمان بە جارێک دەگۆڕێت و ئامانجی بوون و ژیانکردنمان ڕوونتر دەبێت.

شنیا سەباح

خوێندکاری زانکۆ

* سـەرەتا هەندێک لـەو ناسـاندنانەم خوێندنـەوە کە بۆ کتێبەکە کرابـوو، چـوو بـە دڵمـدا، چونکـە کۆمێنتـی کۆمەڵێـک کـەس بـوو لـە سـەری، گوایـە ژیانـی ئەوانـی گۆڕیـوە! جـا ئینسـان چـی دەوێـت لـە کتێبێـک جگـە لـەوەی بیرکردنـەوە و ژیانـی بگۆڕێـت بـۆ باشـتر؟

هـەر کـەس ئـەم کتێبـە بخوێنێتـەوە هەسـت دەکات بـە جۆرێـک قـەرزداری نووسـەر بـووە، ئـەوەی نووسـەر بـەو ئاسـانییە داویەتـی بـە خوێنـەر، زۆر بـە نرختـرە لـەو شـتانەی ئێمـە ڕۆژانـە نرخیـان بـۆ دادەنێیـن، بەنرختـر لـە سـەفەری وڵاتـان تـا دڵمـان خـۆش بێـت.

نووسـەر وا دەردەکەوێت کە قوتابی ئیبنولقەیـم بێت، بە جارێک دڵ داگیر دەکات بـە وتـە سـادە و جوانەکانـی. زۆر کـەم نەبێـت جگـە لـە ئایەتـی قورئـان هیـچ نابینیـت کـە ئیلهامـی نووسـەر بێـت، جـار جارێکیـش دەچێتـە خزمەتـی پێغەمبـەری نـازدار(ﷺ) و، ئیبنوتەیمییـە و ئیبنولقەییـم.

زۆر کات ئەوانـەی دەیانەوێـت لەسـەر ڕۆح و دڵ و عیرفـان بنووسـن، وا گێـژت دەکـەن نەزانـی لـە کوێـوە دەتبـەن و سـەرت لـە کوێوە دەردەکـەن، نەزانـی قسـەکەنیان چەنـی شـەرعییە و کتێبەکانیـان چـەن ئایەتـی قورئانـی تێدایـە! بـەڵام دادە یاسـەمین وەکـو دایـک وانەکانـی ئێژێتـەوە، زۆر سـادە و ڕەوان، زۆر شـیرین و ڕاسـتەقینە. باسـەکانی ئاوێتـەن بـە باسـەکانی تەوحیدەوە. وەک ئـەوەی کـە خـۆی ڕۆژنامەنووسیشـە، بـاش ئـاگاداری جیهـان و بـاری سیاسـییە.

بـە هـەر لاپەڕەیەکـی زیاتـردا گـوزەرم دەکـرد، زیاتـر دەمـوت خۆزگـە لـەو جیهانـە جوانـەی نووسـەردا دەژیـام، بیـرم لـەوە دەکـردەوە دادە یاسـەمین نەکێشـەی لێ عاسـی دەبێـت و نـە خەفەتیـش دەخـوات، چونکـە ئەوانـەی ئـەو باسـی فەرمووبـوون بەشـێکی کـەم بـوون لـەو جیهانـە ئاوەدانـەی ئـەو تێیـدا دەژی، جیهانێکـی دوو کەسـی، بەندەیـەک و پـەروەردگاری.

کتێبەکە وا دیارە ڕۆژانە نووسیویەتییەوە، بە جۆرێک هەر شتێک ڕۆژانە کاریان تێکردووە ئەو دیوە ڕاستەقینەکەی بینیوە و چێژی لە هەمووی وەرگرتووە، وەکو کە پێغەمبەری خودا (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (سەیرم لە کاری مسوڵمان دێت، هەموو کارێکی خێرە، کە تووشی خۆشییەک دەبێت و سوپاسگوزاری دەکات پاداشتی لەسەر وەردەگرێت، کە تووشی کێشەیەک دەبێت و سەبری لەسەر دەگرێت پاداشتی لەسەر وەردەگرێت)، بەڵام دادە یاسەمین جگە لە سوپاس و سەبر لە بچووکترین شتەکانیش ڕادەمێنێ و پەندەکانی دەکاتە نوقڵانە بۆ خۆی، بە جۆرێک بڕوام نەکرد چەند جوان پەندی لەوە وەرگرتبوو کە منداڵە ۲۲ مانگانەکەی ویستی دەرگای ئۆتۆمبێلەکەی داخات کاتێک دابەزی، بەڵام ئەم نەیهێشت نەوەک دەرگاکە بەری بکەوێت، منداڵەکەیشی گریا.. بیخوێننەوە دەبینن چۆن لەو ڕووداوە سادانەوە هەموو ساتێکی بووە بە ڕامان، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾﴾ (سورة آل عمران)

سەربەست ئەحمەد

خوێندکاری زانکۆ

* سـلام عليـک خاتـوو ياسـەمين، مـن کچێکـی کـوردی گوڵچنـم، بڕيـارم داوە وتەکانت لەگەڵ گوڵی ياسـەمين بچنـم و بيکـەم بـە تابلۆ، بـە ديـاری بيبەخشـم بـەو کەسـانەی کـە ئازيـزن لام. هيـوادارم ڕۆژێک بێيـت بـۆ کوردسـتان و تابلۆيـەک لـە وتەکانـی خۆتـت بـۆ بچنـم و بـە گوڵـی ياسـەمين ديزاينـی بکـەم...

زۆر قسـەم هەيە بۆت کە نانووسرێن ..

داواکارم لـە خـوای گـەورە بينينـی تـۆی لـە نزيکـەوە لـە قەدەرمـدا نووسـيبێت...

**ديما ئەحمەد ڕەسول**

*هـەر وشـەيەک لـەم کتێبـە وەک خۆراکێکـە بـۆ ڕۆحـی مـرۆڤ، بريـا هـەر مرۆڤێـک بـۆی بڕەخسـايە بـۆ جارێـک لـە ژيانـی ئـەم نووسـينانەی بخوێندايەتـەوە، بـۆ هەسـتکردن بـە بەهـای مرۆڤبوونـی خـۆی و ئامانجـی لـەم ژيانـەدا و پەرەوەردەکردنـی ڕۆحـی بە پەيوەندی بـە پەروەرێنيـەوە، هـەر وەک نووسـينە جوانەکـەی خاتـوو ياسـەمين کـە دەڵێـت: «بـە جيهـان ڕابگەيەنـن بەنـدەی هيـچ شـتێک نيـن تەنهـا بەنـدەی پەروەردگاريـن. ئێـوە لێـرەن تاکـو پـەروەردگار لـە خۆتـان ڕازی بکـەن."

سوپاس بـۆ پـەروەردگار کـە ئـەم هەلـەی بـۆ ڕەخسـاندم لـە ژيانـم، کتێبێکـی ئـاوا جـوان و بەسـوود بـۆ تێرکـردن و پەروردەکردنـی ڕۆحـم خوێندەوە.

**قەدەر**

**خوێندکاری زانکۆ**

* کتێبی «**دڵت بێنەوە**»، جیاواز لە کتێبەکانی تر، هەر لە پەڕەکانی سەرەتاوە باسکردن و دەردەدڵی ئەوانەی کە ئەو کتێبە ژیانی گۆڕیون تووشی فزولیت دەکات و حەز دەکەی بزانی دەبێ چ شتێک هەبێت ئەوانی بەم شێوەیە گۆڕیبێت.

زۆر نابا و تێدەگەیت و ڕادەچڵەکێیت وەک ئەوەی نووسینەکان بە تایبەت هاتوون و ئاماژە بە تۆ دەکەن، پەنجە بۆ هەڵەکانت ڕادەکێشن و یارمەتی چارەسەرکردنیت بۆ دەدەن.

**دڵت بێنەوە** زەنگی ئاگادارکردنەویە بۆ ئەو دڵانەی کە سەرگەردان بوون، ئەو دڵانەی کە زۆر دەمێکە دوورن لە بەختەوەری، ئەو دڵانەی کە لە واتای دڵخۆش بوون تێنەگەیشتوون.

**دڵت بێنەوە** جوانتر خودات پێدەناسێنێت، دووبارە وانەکانی یەکتاپەرستیت فێر دەکاتەوە، ئاگادارت دەکاتەوە لەو بتانەی کە بێئاگا دەیانپەرستی.

**دڵت بێنەوە** فێرت دەکات کە چیتر بۆ خەڵک نەژیت، یارمەتیت دەدات بە شێوەیەکی ئاسانتر سەیری کێشەکانت بکەیت.

**دڵت بێنەوە** پێت دەڵێ کە خووگرتن و دڵبەستنەوە بە مرۆڤەکانەوە، جگە لە دڵتەنگی و بێئومێدی هیچی ترمان بۆ ناهێڵێتەوە، زۆر سوپاس خاتوو یاسەمین بۆ ئەو وتە جوانانەت، من لەمەودوا هەوڵ دەدەم بە لای کەمەوە ببم بە کەسێکی باشتر لە جاران.

**محەمەد قوباد**

**خوێندکاری زانکۆ**

* لێرەوە سوپاسی گەرمی وەرگێڕ و ناوەندی ڕێنوێن دەکەم، کە ئەم بەرهەمەی نووسەر خاتوو یاسەمینیان وەرگێڕاوە، بەڕاستی کتێبی «**دڵت بێنەوە**»، دڵی منی هێنایەوە، ئەم وێنە جوانانەی لەم کتێبەدا تێکستەکان بۆتی دروست دەکەن ڕەنگدانەوەی ژیانی هەریەکێکمانە.

کتێبی «**دڵت بێنەوە**»، فێری کردم کە ئەو شتانەی من خستوومەتە دڵمەوە هی ئەوەن لەناو دەستەکانم بن، نەک لەناو دڵم، باش تێی گەیاندم کە مرۆڤ دەبێ چی لە دڵیدا دابنێت.

کتێبی **دڵت بێنەوە** فێری کردم خەم بۆ شتانێک نەخۆم کە شایەنی خەمخواردن نین، منی خستە ناو گەشتێکی درێژ لەگەڵ ناخی خۆمدا، بۆی ڕوون کردمەوە لەناو ئەم پارچە گۆشتەی پێی دەڵێن دڵ تەنها دەبێت خودا هەبێت.

کتێبی **دڵت بێنەوە** منی لە بنی زەریایەکی تاریکدا کە خەریک بوو دەخنکام و هەناسەم لێدەبڕا و خۆم خەریک کردبوو بە کۆکردنەوەی ژەنگ و ژاڵ و بێخەبەر بووم لە حاڵی پەشێوی خۆم، منی ڕزگار کرد بە باسکردنی ڕەحمەت و بەزەیی خودا، بە چنگێک مرواری و گەوهەرەوە منی بەرز کردەوە و لە خنکان ڕزگاری کردم.

کتێبی **دڵت بێنەوە** گەلاڵەی چەندان بابەتی تری گرنگن و باسی زۆر پێویست بۆ کۆمەڵگای کوردی باس دەکات، هیوام وایە خودا تەمەنی نووسەر پڕ بەرەکەت و ئیمان بکات و پارێزراوی بکات.

دووبارە سوپاس بۆ ناوەندی ڕێنوێن و ماندووبوونیان.

**ئاسۆ حەسەن**

**خوێندکاری زانکۆ**

*بەڵێ، پەرتووکەکەم بە دڵێکی شووشەئاسای شکاو و پڕ درزەوە گرت بە دەستەوە، ئەو کات باری ژیانم لەوپەڕی قورسی و فشاری دەوامدا بوو، وێڕای مووددەتێکی زۆر پەرەی لایەنی ڕۆحیم فەرامۆش کردبوو، بەڵام هەر لەگەڵ هەڵدانەوەی ئەم لاکێشە سپی و مۆرە خنجیلانەی ژێر دەستم، وشەبارانی نێو کتێبەکە خاکی دڵمی بە چەشنی بەهار ڕەنگین کرد و درزەکانی بە گیراوەیەکی ئاڵتوونی پێکەوە لکاند و وەها دڵمی لە گێژاوی دونیاییەوە گێڕایەوە کە ئێستا و ئێستایش تامەزرۆی دووبارە خوێندنەوەی (**دڵت بێنەوە**)م.

سپاس خاتوو یاسەمینەکەی ئێمە.

**مەئوا عەزیز**

**خوێندکاری کۆلێژی پزیشکی**

* **دڵت بێنەوە** بەئاگاهێنانەوەیەکە، کە هەموو مرۆڤێک لەم سەردەمەدا پێویستی بەو بەئاگاهێنانەوە هەیە، دڵنیام لە دوای خوێندنەوەی تۆوی ئومێدێکی تازە و جیاواز لە ناختدا چەکەرە ئەکات. ئەم پەرتووکە جیاوازییەکی تێدایە، قورسە بتوانی بە چەند دێڕێکی کەم باسی ئەو جیاوازییەی بکەیت، یاسەمین خاتوون زۆر شارەزایانە و هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ ناختدا گفتوگفۆ ئەکات لەم کتێبەدا.

**دڵت بێنەوە=** ڕۆحت بێنەوە.

گەوهەر یاسەمین ماندوونەبێت، ماندوونەبێت بۆ خۆت و بۆ نووسینت، من لێرەوە دوعات بۆ ئەکەم خودا بەرەکەت بخاتە پێنووس و دەستەکانت و نووسینتەوە، بمێنیت بۆ ئێمە نازدار خاتوون.

**نازە جەزا - مامۆستا**

## پێشکەشە بە

«ئەم پەرتووکە پێشکەشە بەو کەسەی پەروەردەی کردم، تەنانەت پێش ئەوەی لە منداڵدانی دایکمدا بم. پێشکەشە بەو کەسەی لە ژیاندا فێری کردووم، هانی داوم و ڕێنمایی کردووم. ئەم پەرتووکە پێشکەش دەکەم بە پەروەرێنم، نزام وایە قبووڵ بکرێت سەرەڕای لاوازی و کرچوکاڵییەکانم، هەروەها پێشکەشە بە خێزانەکەم کە بە درێژایی ئەم گەشتەم پاڵپشتییان کردووم و هانیان داوم.»

# پێشەکی نووسەر

پەرتووکی (**دڵت بێنەوە**)، پەرتووکێکی ئاسایی نییە. پەرتووکێکە لەبارەی گەشتی دڵ لە ناوەوە و دەرەوەی زەریای ئەم ژیانەدا. پەرتووکێکە لەبارەی ئەوەی چۆن دڵت لە نقومبوون، لە قووڵایی ئەو زەریایەدا بپارێزیت، چی بکەیت کاتێک نقوم بوو. پەرتووکێکە لە بارەی ڕزگاربوون و هیوا و نوێبوونەوەوە.

هەموو دڵێک دەتوانێت چاک ببێتەوە، هەموو چرکەساتێک دروست کراوە بۆ نزیککردنەوەمان لەو گۆڕانکارییە. پەرتووکی (**دڵت بێنەوە**)، لەبارەی دۆزینەوەی ئەو ساتەیە کە هەموو شتێک دەوەستێت و لەناکاو جیاواز دەردەکەوێت. ئەم پەرتووکە باس لە بەئاگاهاتنەوەت دەکات، پاشان گەڕانەوەت بۆ بارێکی باشتر و ڕاستەقینەتری خۆت.

# هۆگربوونەکان

ئـەم جیهانـە ناتوانێـت تێکـت بشـکێنێت، ئەگـەر خـۆت ڕێگـەی پـێ نەدەیـت. ناتوانێـت دەسـتت بـە سـەردا بگرێـت، ئەگـەر کلیلـەکان و دڵتی پێ نەبەخشیت. کەوایە ئەگـەر بـۆ ساتێـک ئـەو کلیلانـەت داوەتـە دەست دونیـا، خێـرا وەریانبگـرەوە. ئەمـە کۆتایـی نییـە. نابێـت لێـرەدا بمریـت، دڵـت بێنـەوە و بیـدەرەوە دەسـت خاوەنـی ڕاسـتەقینەی خـۆی، کـە پـەروەردگارە.



## بۆچی دەبێت خەڵکی یەکتر جێبهێڵن؟

کاتێک تەمەنم حەڤدە ساڵان بوو، خەوێکم بینی، لە خەوەکەمدا لەناو مزگەوتێکدا دانیشتبووم، کیژۆڵەیەکی ڕۆحسووکی بچکۆلانە بەرەو ڕووم هات و پرسیاری لێ کردم:

«بۆچی دەبێت خەڵکی یەکتر جێبهێڵن؟» هەرچەندە پرسیارێکی تایبەت بوو، بەڵام لام ڕوون بوو بۆچی ئەو پرسیارە بۆ من هەڵبژێردراوە.

کەسێک بووم زۆر پەیوەست دەبووم بە کەسەکان و شتەکانی چواردەورمەوە. هەر لە منداڵیمەوە ئەم سیفەتە ڕوون و ئاشکرایەم تێدا بەرجەستە بوو. لە کاتێکدا منداڵانی تری خوار تەمەن پێنج ساڵان زوو ژێر دەبوونەوە کاتێک دایک و باوکیان دەڕۆیشتن، بەڵام من نەمدەتوانی بەو شێوەیە بم. ئەو دەمەی فرمێسکەکانم دایان دەکرد بە ئاسانی نەدەوەستان، کاتێک گەورە بووم، وەها ڕاهاتبووم وابەستەی هەموو شتەکانی چواردەورم بم.

هەر لە پۆلی یەکەمەوە، پێویستم بە هاوڕێیەکی باش هەبوو.

کاتێک گەورەتر بووم، هەر دابڕانێکم لە هاوڕێکانم تێکی دەشکاندم، نەمدەتوانی دەستبەرداری هیچ شتێک ببم. خەڵکی، شوێنەکان، بۆنەکان، وێنەکان، چرکەساتەکان و تەنانەت دەرئەنجامەکانیش بوونە هۆگرییەکی بەهێزم. نائومێد دەبووم کاتێک شتەکان بە باشی بەڕێوە نەدەچوون وەک ئەوەی دەمویست، یاخود خەیاڵم دەکرد. بەمە نائومێد دەبووم، نائومێدیی بە لای منەوە هەستێکی ئاسایی نەبوو، کارەسات بوو. کاتێک نائومێد دەبووم، هەرگیز بە تەواوی چاک نەدەبوومەوە، هەرگیز لە بیرم نەدەچوویەوە، برینەکەیشم هەرگیز چاک نەدەبوویەوە. هاوشێوەی گوڵدانێکی شووشە کە لە لێواری مێزێکدا دایدەنێیت، کاتێک شکا، پارچەکانی هەرگیز جارێکی تر یەکناگرنەوە و وەک خۆی لێ نایەتەوە.

کێشەکە لە گوڵدانەکە، یاخود لە شکانی گوڵدانەکەدا نەبوو، کێشەکە لەوەدا بوو لە لێواری مێزەکەدا دامدەنا. لە کاتی هۆگربوونەکەمدا، پشتم بە پەیوەندییەکانم دەبەست بۆ پڕکردنەوەی پێویستییەکانم. ڕێگەم دەدا ئەو پەیوەندیانەم دڵخۆشی، خەمباری، ڕازیبوون، فەراغ، ئارامی، تەنانەت بەها و گرنگیشم دیاری بکەن. هەر وەک چۆن گوڵدانەکە لە شوێنێکدا دانراوە کە دڵنیاین لەوەی دەکەوێت، لە ڕێی ئەو پەیوەستبوونەوە خۆم تووشی نائومێدی دەکرد، خۆم تووشی تێکشکان دەکرد. بە تەواوی ئەوەم بۆ دەرکەوت: نائومێدی و تێکشکاوی یەک لە دوای یەک تووشم دەبوون.

ئەو کەسانەی کە نائومێدیان دەکردم، یاخود دەیانشکاندم هیچ شایستەی لۆمەکردن و سەرزەنشتکردن نەبوون، هەر وەک چۆن نابێت لۆمە و سەرزەنشتی هێزی ڕاکێشانی زەوی بکەین بۆ شکانی گوڵدانەکە. ناتوانین سەرزەنشتی یاسا فیزیاییەکان بکەین کاتێک لقە دارێک دەشکێت، چونکە خۆمان پێوە هەڵواسیوە. لقە دارەکە هەرگیز

بۆ ئەوە دروست نەکراوە کە ئێمە ڕابگرێت. کێش و قورساییمان دەبێت تەنها لە لایەن پەروەرێنی مەزنەوە ڕابگیرێت. لە قورئانی پیرۆزدا پێمان دەفەرموێت: ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٥٦﴾ (سورەتی البقرة).

«هەر کەسێک تاغوت و خراپەکاری ڕەت بکاتەوە و باوەڕی بە پەروەردگار هەبێت، ئەوا دەستی بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە گرتووە و شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هەرگیز ناشکێت و لەناو ناچێت. پەروەردگاری مەزن بیسەر و زانایە.»

وانەیەکی زۆر گرنگ لەم ئایەتەدا هەیە: تەنها یەک ڕاگر هەیە کە هەرگیز ناشکێت. تەنها یەک شوێن هەیە کە پێویستە هۆگری و پەیوەستبوونمان هەبێت بۆی. تەنها یەک پەیوەندی هەیە کە نرخ و بەهای ئێمە دیاری بکات، تەنها یەک سەرچاوە هەیە کە لە ڕێیەوە خۆشبەختی و ئارامی و پارێزگاری تەواوی تێدا بەدەست بهێنین، ئەوەیش تەنها پەروەردگاری باڵادەستە.

ئەم جیهانە هەمووی بریتییە لە گەڕان بۆ ئەم شتانە لە هەموو شوێنەکاندا، هەندێکمان لە کارەکانماندا، هەندێکمان لە سەروەت و سامانەکەماندا، هەندێکمان لە پلە و پۆستماندا بەدوایدا دەگەڕێین. هەندێکمان هاوشێوەی من لە پەیوەندییەکانمان لەگەڵ کەسانی تردا بەدی دەکەین. (ئیلیزابێس گیلبرێت)، لە پەرتووکەکەیدا بە ناوی «بخۆ، نزا بکە، خۆشت بوێ»، باسی گەڕانی خۆی دەکات بە دوای خۆشبەختیدا، باسی دروستکردنی پەیوەندی و بچڕانی پەیوەندییەکان دەکات، تەنانەت گەشتی بۆ جیهان دەکرد بۆ گەڕان بە دوای خۆشبەختیدا. بە ناسەرکەوتوویی بە دوای خۆشبەختیدا دەگەڕێت لە پەیوەندییەکانی و بیرکردنەوە و تەنانەت لە خواردندا.

ئەوە ئەو شوێنەیە کە زۆرێک لە ژیانم تێیدا بەسەر برد: گەڕان بە دوای ڕێگەیەکدا بۆ پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی ناخم. هیچ جێی سەرسامی نییە کە ئەو کیژۆڵەیەی ناو خەوەکەم ئەم پرسیارەی لێکردم. پرسیارێک بوو لە بارەی لەدەستدان و نائومێدییەوە، لەبارەی گەڕان بە دوای شتێکدا و گەڕانەوە بە دەستی خاڵی. پرسیارەکە پەیوەست بوو بەوەی چی ڕوودەدات کاتێک هەوڵ دەدەیت بە دەستەکانت کۆنکرێت هەڵبکۆڵیت، نەک ئەوەی تەنها بە دەستی خاڵی و بەتاڵ دەگەڕێیتەوە، بەڵکوو پەنجەکانت دەشکێنیت و خوێنیان لێ دەڕژێت. ئەم ڕاستییە لە ڕێی خوێندنەوەوە فێر نەبووم، لە کەسێکی ژیرەوە گوێبیستی نەبووم، بەڵکوو لە ڕێی هەوڵدان و تاقیکردنەوەی بۆ چەندین جار فێر بووم. بۆیە پرسیاری کیژۆڵە بچووک و نازدارەکە پرسیاری خۆم بوو و لە خۆم کرا.

پرسیارەکە لەبارەی سروشتی دونیاوە بوو وەک شوێنێکی کاتی و هۆگربوونێکی کاتی. وەک شوێنێک کە خەڵکی ئیمڕۆ لەگەڵتدان، بەڵام سبەی جێتدەهێڵن، یاخود دەمرن. ئەم ڕاستییە ئازارمان دەدات، چونکە دژی سروشتی ئێمەیە. ئێمەی مرۆڤ دروست کراوین بۆ گەڕان و خۆشەویستی و هەوڵدان بۆ ئەو شتەی کامل و بێ کەموکوڕی و هەمیشەییە. ماڵی یەکەم و ڕاستەقینەمان بەهەشت بوو: نیشتیمانێک کە هەم کامل و تەواو بوو، هەم هەمیشەیی. بۆیە هەوڵدان بۆ ئەو جۆرە ژیانە بەشێکە لە بوونمان. کێشەکە ئەوەیە هەوڵ دەدەین لەم دونیایەدا بیدۆزینەوە. بۆیە کرێمی گەنجکردنەوە بەرهەم دێنین و نەشتەرگەری جوانکاریی ئەنجام دەدەین وەک هەوڵێکی بێئەنجاممان بۆ بەردەوامبوون و گۆڕینی ئەم جیهانە بۆ شتێک کە وا نییە و هەرگیز وا نابێت.

ئەگەر بە پێی ویست و ئارەزووی دڵەکانمان لەم دونیایەدا

بژین، ئەوە دەمانشکێنێت، بۆیە ئەم دونیایە ئازاری هەیە. پێناسەی ئەم دونیایە وەکو شتێکی ناتەواو و کاتی دژی ئەو شتانەیە کە بۆی دروست کراوین. پەروەرێنمان ویستێکی دروست کردووە لە ئێمەدا کە تەنها لە ڕێی شتێکی هەمیشەیی و کامل و تەواوەوە بەدەست دەهێنرێت. هەوڵدانمان بۆ بەدەستهێنان لە شتێکی کاتیدا وەک ئەوەیە بەشوێن سەرابێکدا ڕابکەین، یاخود بە دەستەکانمان کۆنکرێت هەڵبکۆڵین. هەوڵدانمان بۆ گۆڕینی شتێک کە بە شێوەیەکی سروشتی کاتییە بۆ شتێکی هەمیشەیی، وەک هەوڵدانە بۆ دەرهێنانی ئاو لەنێو ئاگردا، تەنها دەسووتێین. کاتێک ئەم دونیایە دڵەکانمان ناشکێنێت کە بوەستین لە پەیوەستکردنی هیواکانمان بەم دونیایەوە، بوەستین لە هەوڵدانمان بۆ گۆڕینی ئەم دونیایە بۆ شتێک کە لە بنچینەدا وا نییە و هەرگیز نابێت کە ئەویش بەهەشتە.

پێویستە تێبگەین هیچ شتێک بەبێ مەبەست ڕوونادات تەنانەت دڵشکانەکان و ئازارەکانیش. ئەو دڵشکان و ئازارە پەند و ئاماژەن بۆمان. بریتین لە ئاگادارکردنەوەمان لەوەی شتێکی هەڵە هەیە. ئاگادارکردنەوەن بۆمان بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لە خۆماندا ئەنجام بدەین. هاوشێوەی ئازاری سووتان کە ئاگادارمان دەکاتەوە تاکو دەستەکانمان لەسەر ئاگرەکە لابدەین، ئازاری هەستەکانمان ئاگادارمان دەکەنەوە لەوەی پێویستە گۆڕانێکی ناوەکی ئەنجام بدەین. پێویستە خۆمان دابڕین. ئازار شێوەیەکی دابڕانی ناچارییە، وەک چۆن کەسە خۆشەویستەکانت یەک لەدوای یەک ئازارت دەدەن، ئەم دونیایەیش ئازارمان دەدات. تاکو زیاتر لێی دابڕێین، خۆشەویستیمان بۆی کەم دەبێتەوە.

ئازار ئاماژەیەکە بۆ هۆگرییەکانمان. هۆگربوونە هەڵەکانمان وامان لێ دەکەن بگرین، وامان لێ دەکەن زۆرترین ئازار بچێژین.

بەربەستەکانی سەر ڕێگەکەمان بەرەو پەروەردگار بەهۆی ئەو شتانەوەیە کە هۆگر و پەیوەستیان بووین لە کاتێکدا پێویستە تەنها پەیوەست بین بە پەروەردگارەوە. ئازارەکە خۆی لە خۆیدا دەرخەری ئاشکرای پەیوەستبوونە هەڵەکانمانە. ئازارەکە بارودۆخێک لە ژیانماندا دەخوڵقێنێت تاکو بە دوای گۆڕانکاریدا بگەڕێین. ئەگەر شتێک لە بارودۆخماندا هەیە کە حەزی لێ ناکەین، ئاماژەیەکی پەروەردگارە بۆ گۆڕینی ئەو شتە.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ ۝١١﴾ (سورەتی الرعد).

«بەڕاستی پەروەرێن بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێک ناگۆڕێت تاکو خۆیان ئەوە نەگۆڕن کە بە خۆیان دەکرێت.»

دوای چەندین ساڵ کەوتنە نێو هەمان بارودۆخی نائومێدی و دڵشکاوی، لە کۆتاییدا لە شتێکی گرنگ تێگەیشتم. هەمیشە بڕوام وابوو خۆشەویستی ئەم دونیایە، واتا هۆگربوون و پەیوەستبوون بە شتە ماددییەکانەوە. دەی منیش هۆگری شتە ماددییەکان نەبووم، بەڵکوو هۆگر و پەیوەست بووم بە خەڵکییەوە، پەیوەست بووم بە چرکەساتەکانەوە، پەیوەست بووم بە هەستەکانەوە. وا بیرم دەکردەوە خۆشەویستی ئەم دونیایە بە سەر مندا جێبەجێ ناکرێت. تێبینی ئەوەم نەکردبوو کە خەڵکی و چرکە ساتەکان و هەستەکان بەشێکن لەم دونیایە. تێبینی ئەوەم نەکردبوو هەموو ئەو ئازارانەی لە ژیاندا دەیچێژم بەهۆی یەک شتەوە بوو، ئەو شتەیش تەنها خۆشویستنی دونیا بوو.

کاتێک لەوانە گەیشتم، پەردەی سەر چاوەکانم لاچوون و هەڵگیران، بینیم گرفتەکەی من لە کوێدایە. پێشبینی ئەوەم دەکرد

ئەم ژیانە بە شێوەیەک بێت کە خۆی وەها نییە و هەرگیز بەو شێوەیەیش نابێت: کامڵ بوون و تەواو بوون.

کەسێکی نموونەیی بووم، هەوڵم دەدا هەموو خانەکانی لاشەم کامڵ و تەواو بن، دەبوو کامڵ بن. هەرگیز وچانم نەدەدا لە کامڵبوون. خوێن و ئارەقە و فرمێسکەکانم لەم هەوڵدا ڕژاند، گۆڕینی ئەم دونیایە بۆ بەهەشت، واتا چاوەڕێی خەڵکانی چواردەورم بووم تاکو کامڵ و تەواو بن. چاوەڕێ بووم تاکو پەیوەندییەکانمان کامڵ و تەواو بن. چاوەڕێی زۆر شت بووم لە کەسانی چواردەورم و لەم دونیایە. چاوەڕێ بوون، ئەگەر تاکە ڕەچەتەیەک هەبێت بۆ خەمباریمان، ئەوا ئەو چاوەڕوانییە، بەڵام هەڵەکەم لەمەدا نەبوو، هەڵەکەم لەو چاوەڕوانییەدا نەبوو، چونکە ئێمەی مرۆڤ نابێت هەرگیز هیوا لەدەست بدەین. کێشەکە بریتی بوو لەو شوێنەی کە هیوا و چاوەڕوانیم لەسەری هەبوو. لەو ڕۆژەدا هیوا و چاوەڕوانیم بە پەروەردگار نەبەستبوویەوە، هیوا و چاوەڕوانیم بە خەڵکی و پەیوەندییەکان و هۆکارەکانەوە بەستبوویەوە. لە کۆتاییدا هیواکانم بەم دونیایەوە بەستووە، نەک بە پەروەردگارەوە.

کاتێک گەیشتم بە ڕاستییەکە، ئایەتێکی قورئانی پیرۆز بە خەیاڵمدا هات. ئایەتێک بوو کە پێشتر بیستبووم، بەڵام بۆ یەکەمجار تێگەیشتم ئەو ئایەتە باسی من دەکات. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَٱطْمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمْ عَنْ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ٧﴾ (سورەتی یونس).

«بەڕاستی ئەوانەی بەنیازی ئامادەبوونی بەر بارەگای ئێمە نین و ڕازی بوون بە ژیانی ئەم دونیایە و پێی دڵخۆش بوون و ئەوانەیش کە خۆیان غافڵ و بێئاگان لە ئاماژە و نهێنی دروستکراوەکانمان».

بە بیرکردنەوە لەوەی کە دەتوانم لێرەدا هەموو شتێکم

هەبێت، سەرنج و هیوام لەسەر بینینی پەروەردگار نەبوو. هیوام بەم دونیایە بوو. مانای چییە کاتێک هیوا و ئومێدت لەسەر ئەم دونیایەدا دادەنێیت؟ چۆن خۆمان لەوە بەدوور بگرین؟ واتا کاتێک هاوڕێیەکت هەیە، چاوەڕێی هاوڕێکەت مەبە بۆشاییەکانت بۆ پڕ بکاتەوە. کاتێک هاوسەرگیری دەکەیت، چاوەڕێی هاوسەرەکەت مەبە هەموو پێویستیەکانت پڕ بکاتەوە. کاتێک چالاکوانێکیت، هیواکانت لە ئەنجامەکاندا مەبینە. کاتێک لە کێشەدایت، تەنها پشت بە خۆت مەبەستە، پشت بە خەڵکی مەبەستە، بەڵکوو پشت بە پەروەرێن ببەستە.

داوای یارمەتی لە خەڵکی بکە، بەڵام بزانە ئەوە خەڵکی، یاخود خۆت نیت کە دەتوانن ڕزگارت بکەن، بەڵکوو تەنها پەروەردگار لە توانایدایە ئەم کارە ئەنجام بدات. خەڵکی تەنها ئامراز و هۆکارن لە لایەن پەروەردگارەوە بەکار دەهێنرێن، بەڵام ئەوان سەرچاوەی یارمەتییەکە نین، تەنها پەروەردگاری باڵادەست سەرچاوەی هەموو یارمەتی و پاڵپشتییەکانە. خەڵکی ناتوانن تەنانەت باڵە مێشێکیش دروست بکەن، (سورەتی الحج:٧٣). بۆیە کاتێک پەیوەندی لەگەڵ خەڵکیدا دروست دەکەیت، دڵت پەیوەست بکە بە پەروەردگارەوە. تەنها ڕوو بکەرە پەروەرێنی مەزن، هەر وەک چۆن پەیامبەر ئیبراهیم (درود و سەلامی خوای لەسەر) بێت بە جوانی فەرموویەتی: ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ٧٩﴾ (سورەتی الانعام.)

«بەڕاستی و تەواوی ڕووم کردۆتە پەروەرێن کە ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، هەرگیز لە هاوبەشپەیداکەران نیم.»

بەڵام چۆن پەیامبەر ئیبراهیم بەو شێوەیە وەسفی گەشتەکەی

دەکات؟ لێکۆڵینەوەی لە مانگ و خۆر و ئەستێرەکان کرد، تێگەیشت لەوەی هیچ کامیان کامڵ و تەواو نین، ئاوا دەبن، نائومێدمان دەکەن. بۆیە پەیامبەر ئیبراهیم تەنها ڕووی کردە پەروەرێنی باڵادەست. پێویستە ئێمەیش هاوشێوەی پەیامبەر ئیبراهیم هیوا و ئومێد و پەیوەستی تەواوەتیمان بخەینە سەر پەروەردگار. ئەگەر ئەوە بکەین، تێدەگەین مانای چییە کاتێک ئارامی و جێگیری لە دڵەکانماندا هەست پێ دەکەین. تەنها ئەو کاتە لەنگەری ئەو کەشتییە بەرزونزمییەی کە ژیانمانی پێناسە دەکرد دەگات بە کۆتایی. ئەگەر باری دەروونی خۆمان پەیوەست بێت بە شتێکی کاتییەوە، ئەو بارە دەروونییە کاتی دەبێت. ئەگەر دەروونمان پەیوەست بێت بە شتێکی گۆڕدراو و کاتییەوە، باری دەروونیمان بەردەوام ناجێگیر و نیگەران و نائارام دەبێت. واتا یەک سات و یەک خوولەک دڵخۆشین. کاتێک خۆشبەختیمان پەیوەستە بە شتە گۆڕاوەکانەوە، خۆشبەختیەکەیشمان دەگۆڕێت و خەمبار دەبین، هەمیشە لە دڵتەنگییەکەوە بۆ دڵتەنگییەکی تر دەچین و نازانین بۆچی وایە.

تووشی ئەم بەرزونزمی هەستییە دەبین، چونکە هەرگیز ناتوانین جێگیری و سەقامگیری و ئاشتی و سووکنایێکی هەمیشەیی بەدەست بهێنین تا ئەوەی ڕموودەیی[1] و پەیوەستیمان بە شتانێکەوە دەبێت کە سەقامگیر و هەمیشەیین. دەی چۆن دەتوانین هەمیشەیی بەدەست بهێنین لەکاتێکدا خۆمان هەڵواسیوە بە شتانێکی کاتی و لەناوچووەوە؟ هەر وەک چۆن وتەکەی ئەبوبەکر (خودا لێی ڕازی بێت)، ئەم ڕاستییە ڕوون دەکاتەوە. دوای ئەوەی پەیامبەرمان (صلى الله عليه و سلم)، کۆچی دوایی کرد، خەڵکی تووشی شۆک بوون و نەیاندەتوانی بەرگەی هەواڵەکە بگرن. هەرچەندە کەس

[1] ) ڕموودەیی: واتە ئاڵودەبوون

وەکو ئەبوبەکر پەیامبەری خۆش نەدەویست، وەلێ ئەبوبەکر باش تێگەیشتبوو ئەو مەقامە کوێیە کە دەبێت تەنها پەیوەست بین پێوەی.

فەرمووی: **مَنْ كَانَ مِنكُمْ يَعْبُدُ مُحَمَّدًا صلى الله عليه وسلم فَإِنَّ مُحَمَّدًا قَدْ مَاتَ ، وَمَنْ كَانَ مِنكُمْ يَعْبُدُ اللَّهَ فَإِنَّ اللَّهَ حَيٌّ لاَ يَمُوت.**

«ئەگەر موحەممەدتان دەپەرست، ئەوا موحەمەد مرد و وەفاتی کرد، ئەگەر پەروەرێنی موحەممەدتان دەپەرست، بزانن کە پەروەردگار زیندووە و هەرگیز نامرێت.» (رواه البخاری).

بۆ گەیشتن بەو بارودۆخە پێویستە نەهێڵیت ژێدەری قایلبوونت هیچ شتێک بێت جگە لە پەیوەندیت لەگەڵ پەروەردگاردا. مەهێڵە پێناسەی سەرکەوتن و شکست و بەهای خۆت هیچ شتێک بێت جگە لە پلە و جێگەت لە لای پەروەردگار. (سورەتی الحجرات: ١٣).

ئەگەر ئەوە ئەنجام بدەیت، ئەوا نەشکاو دەبیت، چونکە ئەو شتەی دەستت پێوە گرتووە، شتێکی تێکنەشکاوە. هیچ کات وردوخاش نابیت، چونکە پاڵپشتەکەت هەرگیز ناشکێت. هەرگیز بەتاڵ نابیت، چونکە سەرچاوەی قایلبوونت هەمیشەییە و هەرگیز لەناو ناچێت. بە گەڕانەوەم بۆ خەوەکەم کە لە تەمەنی حەڤدەساڵیدا بینیم، سەرسامم ئایا ئەو کیژۆڵە بچکۆلانەیە خۆم بووم.

سەرسامم چونکە ئەو وەڵامەی دامەوە وانە و پەندێک بوو، پێویستە چەند ساڵی پڕئازاری داهاتووم لە فێربوونیدا بەسەر بەرم. وەڵامەکەم بۆ پرسیاری کیژۆڵە بچۆکەڵەکە لە بارەی ئەوەی بۆچی خەڵکی یەکتر جێدەهێڵن بریتی بوو لە، «چونکە ئەم ژیانە کامڵ و تەواو نییە، ئەگەر کامڵ و تەواو بێت، کەوایە ئەی ناوی چی لە دونیاکەی تر دەنێین؟»



## خەڵکی دەڕۆن، بەڵام ئایا دەگەڕێنەوە؟

جێهێشتن زۆر سەختە، لەدەستدان سەختترە، چەند هەفتەیەک لەمەوبەر پرسیارێکم کرد:

«بۆچی دەبێت خەڵکی یەکتر جێبهێڵن؟» وەڵامەکە بردمی بۆ قووڵترین تێگەیشتنەکان و ململانێکانی نێو ژیانم. وای لێ کردم بپرسم، ئایا دوای ئەوەی خەڵکی دەڕۆن، دەگەڕێنەوە؟ دوای ئەوەی شتێک کە زۆر لامان خۆشەویستە و لێمان دەسەندرێتەوە، ئایا هەرگیز دەگەڕێتەوە بۆ لامان؟ ئایا لەدەستدان هەمیشەییە، یاخود تەنها هۆکارێکە بۆ مەبەستێکی باڵاتر؟ ئایا لەدەستدان واتای کۆتاییە، یاخود چارەسەرێکی کاتییە بۆ نەخۆشی و لاروولەوێری دڵەکانمان؟

شتێکی سەرنجڕاکێش هەیە لەبارەی ئەم ژیانەوە، هەمان تایبەتمەندی ئەم دونیایە کە تووشی ئازارمان دەکات، ئاسوودەییمان پێ دەبەخشێت: هیچ شتێک لێرەدا هەمیشەیی نییە. ئەمە مانای چییە؟ مانای ئەوەیە گوڵەباخە جوان و سەرنجڕاکێشەکەی ناو گوڵدانەکەم بەیانی دەژاکێ و وشک دەبێتەوە. مانای ئەوەیە گەنجیم فەرامۆشم دەکات. هەروەها مانای ئەوەیە ئەو خەمبارییەی ئیمڕۆ هەستی پێ دەکەم، سبەی دەگۆڕێت. ئازارەکەم لەناو دەچێت.

پێکەنینەکان و فرمێسکەکانم بۆ هەمیشە بەردەوام نابن. دەڵێین ئەم ژیانە کامڵ و تەواو نییە، بە تەواوی باش نییە، بەڵام بە تەواویش خراپ نییە. پەروەردگار لە ئایەتێکی پیرۆزی تێردا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۞﴾ سورة الشرح.

«بەڕاستی هاوڕێ لەگەڵ تەنگانە و ناڕەحەتیدا، خۆشی و ئاسوودەیی دێت.» ئەم خۆشی و ئاسوودەییە لە هەمان ساتی هاتنی تەنگانە و سەختییەکەدایە. مانای ئەوەیە کە لەم ژیانەدا هیچ شتێک تەواو خراپ، یاخود تەواو باش نییە. لە هەموو بارودۆخێکی خراپ و ناخۆشدا، هەمیشە شتێک هەیە کە بۆی سوپاسگوزار بین. پەروەردگار لە کاتی ناڕەحەتیدا هێز و ئارامیمان پێ دەبەخشێت تاکو بەرگەی بگرین.

ئەگەر لە سەختییەکانی ژیانمان ورد بینەوە، دەبینین هەمیشە پڕ بوون لە خێر و باشەی زۆر. پرسیارەکە ئەمەیە ئایا کامیان هەڵدەبژێرین تاکو سەرنج بخەینەوە سەری؟ بڕوام وایە ئەو تەڵەیەی تێیکەوتوین لەسەر ئەو بنەما هەڵەیە سەرچاوەی گرتووە کە ئەم ژیانە دەکرێت کامڵ و بێ خەوش بێت -واتا تەواو باش، یاخود تەواو خراپ بێت. هەرچەندە ئەوە سروشتی ئەم دونیایە نییە، بەڵکوو سروشتی ڕۆژی دواییە. ڕۆژی دوایی ڕۆژی کامڵبوونی شتەکانە. بەهەشت بە تەواوی تژییە لە باشە، هیچ خراپەیەکی تێدا نییە. دۆزەخ (پەروەرێن بمانپارێزێت لێی)، بە تەواوی خراپە، هیچ باشەیەکی تێدا نییە.

بەهۆی تەواو تێنەگەیشتنم لەم ڕاستییە، خودی خۆم نغرۆ دەبووم بە بارودۆخە کاتییەکانی ژیانم (باش بێت، یاخود خراپ). کاتێک تووشی هەر یەک لە بارودۆخەکان دەبووم، وەک ئەوە بوو

هەمیشەیی بێت و کۆتایی نەیەت. ئەو هەستەی هەمبوو لەو چرکە ساتەدا هەموو جیهان و شتەکانی ناوی گۆڕی.

ئەگەر دڵخۆش بوومایە لەو چرکە ساتەدا، ڕابردوو و ئێستا و تەواوی جیهان باش دەبوو بە لامەوە. وەک ئەوەی تەواویەتی لێرەدا بوونی هەبێت. هەمان شتیش بوو بۆ شتە خراپەکان. بیرکردنەوەیەکی نەرێیانە هەموو شتێکی دادەگرتەوە. دەبویە تەواوی جیهان بە ڕابردوو و ئێستایەوە، لەو چرکە ساتەدا تەواوی گەردوون خراپ دەردەکەوت، چونکە دەبوویە تەواوی گەردوونم، نەم دەتوانی دیوی دەرەوەی ببینم.

لەو چرکەساتەدا هیچ شتێکی تر بوونی نەبوو. ئەگەر ئیمڕۆ هەڵەیەکت بکردایە بەرامبەرم، مانای ئەوە بوو کە چیدی گرنگی و بایەخم پێ نادەیت، نەک ئەوەی ئەم چرکەساتە بەشێک بێت لەو چرکەساتانەی کە ڕوودەدەن بۆ شێوەکردنی ژیانمان بەو چەشنە، یا ئەوەی من و تۆ و ئەم ژیانە کامڵ و تەواو نین. ئەوەی لەو کاتەدا هەستم پێ دەکرد، یاخود تووشی دەبووم بارودۆخەکەی دەگۆڕی، چونکە شوێنی تەواوی تێڕوانینمی لەبارەی ئەم جیهانەوە دەگرتەوە.

هەست دەکەم ڕەنگە هەندێکمان تەواو بەگومان بین لە سروشتی ئەزموونکردنمان. ڕەنگە ئەمە هۆکار بێت بۆ ئەوەی بکەوینە داوی (هەرگیز باشە و چاکەم لە تۆدا بەدی نەکردووە).

پەیامبەرمان موحەمەد(ﷺ) لەم فەرموودەیەدا ئاماژەی بەم دیاردەیە داوە. ڕەنگە هەندێکمان ئەو شتە بڵێین، یاخود ئەو هەستەمان هەبێت، چونکە لەو چرکەساتەدا باشەمان نەبینیوە، چونکە هەستەکانمان لەو کاتەدا شوێنی هەموو شتێک دەگرێتەوە. ڕابردوو و ئێستا دەبنە یەک چرکەساتی ئەزموونی.

بە تێگەیشتنی تەواوەتیمان لەوەی هیچ شتێک لەم ژیانەدا کامڵ

و تەواو نییە، ئەزموونەکانمان لە بارەیەوە دەگۆڕێت. یەکسەر دەوەستین لەوەی بەو چرکەساتانە داگیر بکرێین.

بە تێگەیشتن لەوەی هیچ شتێک بێسنوور نییە لەم جیهانەدا، یاخود هیچ شتێک کامڵ و تەواو نییە، پەروەردگاری باڵادەست توانامان پێ دەبەخشێت بۆ هەنگاونان بەرەو دەرەوەی ئەو چرکەساتانە و ببینین کە چین: گەردوونی نین و ڕاستەقینە نین، ڕابردوو و ئێستا ئەو چرکەساتانەن لە زنجیرەیەکی بێسنووری چرکەساتەکان پێکهاتوون، ئەوانیش تێدەپەڕن.

کاتێک دەگریم، شتێک لەدەست دەدەم، یاخود برینداردەبم، تاکو لە ژیاندا مابم و زیندوو بم، هیچ شتێک کۆتایی نییە. هەتاکو سبەینێیەک هەبێت و چرکەساتی دواتر هەبێت، هیوا و ئومێدیش هەیە، گۆڕانکاری هەیە، ڕزگاربوون و دەربازبوون هەیە. لەدەستدان لەدەستدانی هەمیشەیی نییە.

لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا ئایا ئەو شتەی لەدەست دەچێت دەگەڕێتەوە؟ لێکۆڵینەوەم لە جوانترین و بەپێزترین نموونەکان کرد. ئایا پەیامبەر یوسف گەڕایەوە بۆ لای باوکی؟ ئایا پەیامبەر موسا گەڕایەوە بۆ لای دایکی؟ ئایا هاجەرە خاتوون گەڕایەوە بۆ لای پەیامبەر ئیبراهیم؟ ئایا تەندروستی ساغ و سامان و منداڵەکانی پەیامبەر ئەیوب گەڕانەوە؟ لەم چیرۆکانەوە وانە و پەندی جوان و شیرین فێر دەبین: هەر شتێک پەروەرێن لێتی وەرگرێتەوە هەرگیز بە لەدەستدان ئەژمار ناکرێت. لە ڕاستیدا ئەوەی لە لای پەروەرێن بێت، دەمینێتەوە. هەموو شتەکانی تر لەناو دەچن و نامێنن. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٍۗ وَلَنَجْزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ۝٩٦﴾ (سورەتی النحل).

«ئـەوەی لـە لای ئێوەیـە و بـە ئێـوە بەخشـراوە تـەواو دەبێـت و لەنـاو دەچێت، بـەڵام ئـەوەی لـە لای پـەروەردگار بێت و لەپێنـاو ئـەودا بەخشرابێت دەمینێتـەوە. بە دڵنیاییـەوە پاداشـتی ئەوانـەی کـە خۆڕاگر و ئارامگـر بـوون بـە باشـتر و جوانتـر دەدەینـەوە لـەوەی کـە ئـەوان دەیانکـرد.»

کەواتە ئەوەی لە لای پەروەردگار بێت هەرگیز لەدەست ناچێت.

لـە ڕاسـتیدا پەیامبـەر موحەمەد(ﷺ)، فەرموویەتی: «دەسـتبەرداری هیـچ شـتێک نابـن لەپێنـاوی پـەروەردگاری بـاڵادا، ئیـلا بـە شـتێکی باشـتر شـوێنەکەی پـڕ دەکاتـەوە.» ئـەی پـەروەردگار هاوسـەرەکەی لـە ئـوم سـەلەمە نەسـەندەوە تاکو جێـی پـڕ بکاتـەوە بـە پەیامبەرمـان موحەمـەد(ﷺ)؟ هەندێـک جـار پـەروەردگار شـتێکت لـێ دەسـەنێتەوە تاکـو شـتێکی باشـترت پـێ ببەخشـێت. گرنگـە لـە یـادت بێـت بەخشـینەکانی پـەروەردگار هەمیشـە ئـەو شـتە نییـە کـە دەمانەوێـت. پەروەردگار خۆی دەزانێت چی شتێک باشترینە بۆمـان. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيۡـٔٗا وَهُوَ شَرّٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ٢١٦ ﴾ (سـورەتی البقـرە).

«...... ڕەنگە حەزتـان بـە شـتێک نەبێت و خێری تێدا بێت بۆتـان و حەزتـان لـە شـتێک بێت کە خراپ بێت بۆتـان. پەروەردگار هـەر خۆی بـاش دەزانێت و ئێوە نایزانن».

ئەگـەر شـتێک بگەڕێتـەوە بـۆ لامـان جـا بـە هـەر شـێوەیەک بێـت، بۆچـی لێمـان دەسـەندرێتەوە؟ سـبحان اللـە. ئەوە لـە پرۆسـە و سـاتی لەدەسـتدانەکەدایە کـە پاداشـت دەکرێینـەوە. پەروەرێنمـان خەڵاتمـان دەکات، بـەڵام بۆچـی هۆگـر و وابەسـتەی ئـەو خەڵاتانـە دەبین؟ کاتێک پارەمـان پـێ دەبەخشـێت، وابەسـتەی پارەکـە دەبین، نـەک پەروەرێن

خۆی. کاتێک خەڵکی دەهێنێتە ژیانمانەوە، پشت بە خەڵکەکە دەبەستین و بەهۆی ئەو شتانەوە دادەبڕێین لە پەروەردگار. کاتێک تەندروستی ساغمان پێ دەبەخشێت، فریو دەخۆین، وا هەست دەکەین هەرگیز نامرین.

پەروەردگار خەڵاتمان دەکات، بەڵام دواتر تەنها ئەو شتانەمان خۆش دەوێت لە کاتێکدا پێویستە تەنها پەروەردگارمان خۆش بوێت. ئەو خەڵاتانە وەردەگرین و لە قووڵایی دڵماندا جێگیریان دەکەین تاکو تەواوی دڵەکانمان داگیر دەکەن، پاشان ناتوانین بێ ئەوان بژین. هەموو ساتێکمان لە بیرکردنەوە و تێڕامان لەو خەڵاتانەدا بەسەر دەبەین و ملکەچیان دەبین و دەیانپەرستین. مێشک و دڵمان لە لایەن پەروەرێنەوە دروست کراون و پێویستە تەنها بۆ ئەو بن، دەبنە موڵکی کەسێک، یاخود شتێکی تر. دواتر ترس دادەگرێت، ترسی لەدەستدانیان چۆکمان دەشکێنێت. ئەو خەڵاتانەی کە دەبوو تەنها لە دەستەکانماندا بمێننەوە، دەست بەسەر دڵەکانماندا دەگرن، بۆیە ترسی لەدەستدانیان دادەگرێت.

دواتر ئەو شتەی کە تەنها خەڵاتێک بووە، دەبێتە چەکێکی ئازاردان و زیندانێک کە لە لایەن خۆمانەوە دروست دەکرێن. چۆن خۆمان لەمە ڕزگار بکەین؟ کەواتە پەروەردگار بەو شێوەیە بە میهر و بەزەیی بێسنووری خۆی ڕزگارمان دەکات لە ڕێی لێسەندنەوەی خەڵاتەکەوە. لە ئەنجامی وەرگرتنەوەی خەڵاتەکەوە، پڕ بە دڵ دەگەڕێینەوە بۆ لای پەروەردگارمان. لەو نائومێدی و پێویستییەدا، داوا دەکەین و دەپاڕێینەوە و نزا دەکەین. بەهۆی لەدەستدانەکەوە دەگەین بە دڵسۆزی و ڕاستگۆیی و خشوع و پشتبەستنمان بە پەروەردگار. چی ڕوودەدات کاتێک بووکەڵەیەک دەدەیت بە منداڵێک، یاخود

یارییەکی ڤیدۆیی نوێی دەدەیتێ کە زۆر ئارەزووی لەسەرە؟ زۆر سەرقاڵ دەبێت پێوەی. دواتر نایەوێت هیچ شتێکی تر بکات، هیچ شتێکی تر ببینێت. نایەوێت کارەکانی ئەنجام بدات، یاخود تەنانەت نانیش بخوات. ئەو کاتە زیان بە خۆی دەگەیەنێت.

کەواتە تۆی دایک، یا باوک چی دەکەیت لەم حاڵەتەدا؟ ئایا بەجێی دەهێڵیت بەردەوام بێت لە هۆگربوونەکەی و لەدەستدانی سەرنج و هاوسەنگی خۆی؟ نەخێر! ئەو کاتە لێی وەردەگریتەوە. کاتێک منداڵەکە گرنگی بە ئامانجە لەپێشینەکانی دەدات و هاوسەنگی بەدەست دێنێتەوە، کاتێک شتەکان لە شوێنی گونجاوی خۆیاندا دادەنرێنەوە لە دڵ و ئاوەز و ژیانیدا، چی ڕوودەدات؟ خەڵاتەکەی پێ دەدەیتەوە، یاخود ڕەنگە شتێکی باشتری پێ بدەیت. ئەمجارە چیدی خەڵاتەکە لە دڵیدا جێگیر نابێت، لە شوێنی شیاوی خۆیدا دەبێت. خەڵاتەکە لە دەستەکانیدا دەبێت.

لەو کاری وەرگرتنەوەیەدایە کە گرنگترین شت ڕوودەدات. کەواتە لەدەستدان و وەرگرتنەوەی خەڵاتەکە مەترسیدار نییە. نەهێشتنی بێئاگاییت و پشتبەستن و سەرنجت لەسەر شتانی تر جگە لە پەروەردگار و جێگرتنەوەی بە یادکردنەوە و پشتبەستن و تیشکخستنەسەر پەروەردگار، خەڵاتە ڕاستەقینەکەیە. پەروەردگار ڕەتی دەکاتەوە ببەخشێت، هەندێک جار شتە باشترەکە گەورەترین خەڵاتە، «نزیکبوون لە پەروەردگارەوە». پەروەردگار کچەکەی مالیکی کوڕی دیناری بردەوە تەنها بۆ ئەوەی مالیک ڕزگار بکات. کچەکەی لێ سەندەوە، بەڵام شوێنی گرتەوە بە پاراستنی لە ئاگری دۆزەخ و ڕزگاربوون لە ژیانی پڕ ئازاری تاوانباری و دووربوون لە خۆیەوە. بەهۆی لەدەستدانی کچەکەیەوە، مالیکی کوڕی دینار

پاداشت کرا بە ژیانێکی نزیک لە پەروەردگارەوە. تەنانەت ئەو کچە لەدەستچووەی لە بەهەشتدا بۆ هەمیشە لەگەڵیدا دەمێنێتەوە.

ابن القیم (خودا لێی ڕازی بێت)، لە پەرتووکەکەیدا (مدارج السالکین)، باسی ئەم دیاردەیە دەکات، دەڵێت:

«فانه سبحانه لا یقضيٰ لعبده المؤمن قضاة الا کان خیرا له: ساءه ذلك اقضاء او سره، فقضاؤه لعبده المؤمن المنع عطاء و ان کان في صورة المنع، و نعمة و ان کانت في صورة المحنة، و بلاؤه عافیة و ان کان في صورة بلیة.»

«فەرمانی ئیلاهی کە پەیوەستە بە ئیماندارەوە هەمیشە پاداشت و خێرە، تەنانەت ئەگەر لە شێوەی پێنەبەخشینی شتێکدا بێت کە زۆر ئارەزووی لێی هەیە، ڕەحمەتە ئەگەر تەنانەت لە شێوەی بەڵا و ناڕەحەتیدا دەرکەوێت کە بەسەریدا دێت. لە ڕاستیدا چارەسەرە، تەنانەت ئەگەر لە شێوەی نەخۆشیدا دەرکەوێت.»

کەواتە وەڵامی ئەم پرسیارە، «کاتێک شتێکت لەدەست دەچێت، ئایا دەگەڕێتەوە؟» وەڵامەکە (بەڵێ! دەگەڕێتەوە. هەندێک جار لێرەدا و هەندێک جار لەوێ، هەندێک جار لە شێوەی شتێکی باشتر و جیاوازتردا، بەڵام گەورەترین خەڵات لە ساتی وەرگرتنەوە و گەڕانەوەکەدایە). پەروەردگار پێمان دەفەرموێت: ﴿قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ۝٥٨﴾ (سورەتی یونس).

«ئەی موحەمەد بە ئیمانداران بڵێ: با دڵشاد و شادمان بن بە فەزڵ و بەخشش و ڕەحمی پەروەردگار، (کە قورئان و بەرنامەی پەروەردگارە)، کەوا بوو با هەر بەوە دڵخۆش بن، هەر ئەوەیش چاکترە بۆیان لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی خەریکن کۆی دەکەنەوە و کەڵەکەی دەکەن».

## لە ساتی پڕکردنەوەی بۆشایی ڕۆحی و گەڕانەوە بۆماڵەوە (بەهەشت)

ئێمە لە بەهەشتدا بووین. پاشان لە ماڵەکەی خۆمان کە بەهەشتە دەرکراین. لابردراوین لە شوێنی بنچینەیی خۆمان، بە کات و بۆشاییدا تێپەڕ بووین بۆ جیهانێکی تر. جیهانێکی کەمتر و نزمتر، بەڵام لەو جیابوونەوەیەدا شتێکی پڕ ئازار ڕوویدا. چیدی لەگەڵ پەروەردگاردا نین لە بۆشاییە فیزیاییەکەدا. چیدی بە چاوی سەر پەروەردگار نابینین، یاخود قسەی لەگەڵدا ناکەین بە شێوەی ڕاستەوخۆ. بە پێچەوانەی باوکە ئادەممانەوە، (علیە سلام)، ناتوانین چیدی هەست بە هەمان ئاشتی و ئاسوودەیی بکەین.

کەواتە هاتینە خوارەوە و لە پەروەردگارمان دابڕاین. لە ئازاری ئەو دابڕانەدا، خوێنمان لێ ڕژا. بۆ یەکەمجار خوێنمان لێ ڕژا. ئەو دابڕانەمان لە پەروەرێنمان برینێکی قووڵی جێهێشت. برینێکی قووڵ کە هەمووومان پێوەی لەدایک بووین. کاتێک گەورە بووین، ئازاری ئەو برینە زیاتر و زیاتر بوو. بە تێپەڕینی کات زیاتر و زیاتر لە چارەسەری ئازارەکە دوور کەوتینەوە کە لە سروشت و فیترەتماندا هەیە: بە دڵ و ڕۆح و مێشک لە پەروەردگارەوە نزیک بین.

بۆیـە بـە گوزەرکردنـی کات زیاتـر و زیاتـر نائومێد دەبیـن لـە پڕکردنـەوەی ئـەو بۆشـاییە. لـە گەڕانمـان بـۆ پڕکردنـەوەی ئـەو بۆشـاییەدا هـەر یەکەمـان تووشـی شـتی جیاواز دەبیـن. زۆربەمـان بـە دوای سـڕکردنی ئـەو بۆشـاییەدا گەڕاوین. بۆیـە هەندێک لـە مرۆڤـەکان تووشـی بەکارهێنانـی دەرمانـی بێهۆشـکەر و کحـول دەبنـەوە، لەکاتێکدا هەندێکیـان بەشـوێن ماددەی سـڕکەری تـردا دەگەڕێـن. هەندێکمـان تووشـی پەرسـتنی چێـژ و پلـە و پـارە بوویـن. هەندێکمـان لـە پیشـەکانماندا خۆمـان ون کـردووە.

هەندێکمـان چاومـان بـە کەسـانی تـر کەوتـووە، هەندێکـی ترمـان خۆمـان لـێ ون بـووە. چـی دەبـوو هەمـوو چاوپێکەوتنێـک و هەوڵێـک و ئەزموونێکـی ژیانمـان تەنهـا بـۆ یـەک مەبەسـت و ئامانـج بوایـە: بـۆ ئـەوە بووایـە بگەڕێینـەوە بـۆ ئەسـڵیەتی خۆمـان. چـی دەبێـت ئەگـەر هـەر بردنـەوەیـەک، دۆڕانێـک، جوانییـەک، کەوتنێـک، دڵڕەقیـەک و خەندەیـەک تەنهـا بـۆ ئـەوە بێـت بەربەسـتێکی تـری نێـوان ئێمـە و پـەروەردگار ئاشـکرا بـکات؟ لەنێـوان ئێمـە و ئـەو شـوێنەی کـە لێـوەی دەسـتمان پـێ کـردووە و هـەوڵ دەدەیـن بـۆی بگەڕێینـەوە؟ چـی دەبـوو هەمـوو شـتێکمان تەنهـا لەپێنـاو بینینـی پەروەرێنمـان بوایـە؟

پێویسـتە بزانیـن هەمـوو ئەوانـەی لـە ژیانـدا ئەزموونـی دەکەیـن ئامانجێـک و مەبەسـتێکی لـە پشـتەوەیە. ئـەوە ئێمەیـن بڕیـار دەدەیـن درک بـەو مەبەسـتە بکەیـن یاخـود نـا، بـۆ نموونـە جوانـی، هەندێـک کـەس تەنانـەت هەسـت بـە جوانیـش ناکـەن کاتێـک ڕێـک لـە پێـش چاوەکانیاندایـە. بـە کاتـی ڕۆژئاوابوونـدا، یاخـود دارسـتانێکی پـڕ لـە داری پرتەقاڵدا تێدەپـەڕن بەبـێ ئـەوەی تەنانـەت سـەیری بکـەن و لێـی بنـوارن.

هەندێـک کەسـی تـر جوانـی دەبینـن و هەسـتی پـێ دەکـەن و پێـی

دەزانن. ڕادەوەستن و لێی دەڕوانن و هەست بە نرخ و بەهای دەکەن. تەنانەت ڕەنگە زۆر پێی کاریگەر ببن، بەڵام لێرەدا کۆتایی پێ دێت. ئەو کەسە ڕێک وەک کەسێکە کە بەهای هونەر دەزانێت، بەڵام هەرگیز لێکۆڵینەوەی نەکردووە لەبارەی هونەرمەندەکەوە. کاری هونەریی خۆی لە خۆیدا بۆ گەیاندنی پەیامێکە لە هونەرمەندەکەوە، بەڵام ئەگەر ئاشقانی هونەر خۆیان لە نیگارەکەدا بزر کرد، ئەگەر هەرگیز لە پەیامەکە نەگەیشتن، ئەو کاتە کارە هونەرییەکە ئامانج و مەبەستی سەرەکی و ڕاستەقینەی خۆی نەپێکاوە.

مەبەست لە خۆری درەوشاوە، یەکەمین کرێوەی بەفر، مانگی چواردە و زەریا دڵڕفێنەکان تەنها بۆ ڕازاندنەوە و جوانکردنی ئەم هەسارەیە نییە. مەبەستەکە زۆر لەوە قووڵتر و گرنگترە. پەروەردگارمان مەبەستەکەیمان لەم ئایەتە پیرۆزەدا بۆ ئاشکرا دەکات: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ١٩٠﴾ (سورەتی ال عمران).

«بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەویدا و هاتنی شەو و ڕۆژدا نیشانە و بەڵگە هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند.»

﴿ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٩١﴾ (سورەتی ال عمران).

«ئەوانەی یادی پەروەردگاریان دەکەن لە کاتێکدا بەپێوەن، یاخود دانیشتوون، یاخود ڕاکشاون و هەمیشە لە دروستبوونی ئاسمانەکان و زەوی تێدەفکرن و دەڵێن ئەی پەروەردگار هەموو ئەم شتانەت بەبێ مەبەست و ئامانج دروست نەکردووە. پاکی و بێگەردی شایستەی تۆیە، لە سزای ئاگری دۆزەخ بمانپارێزە.»

ئەم هەموو جوانی و ڕێکییە وەک ئاماژەیەک و بەڵگەیەک دروست

کراوە، بەڵام تەنها دەستەیەکی هەڵبژێردراو لێی تێدەگەن: ئەوانەی کە لێی ڕادەمێنین و پەروەردگاریان لە یادە لە هەموو سات و بارودۆخێکدا. بۆیە تەنانەت پێویستە لە ئاوابوونی خۆریش ڕابمێنین و بیر بکەینەوە بۆ ئەوەی خۆمان لێ ون نەبێت.

پێویستە سەیری ئەودیوی ئەو جوانی و ڕەنگە سەرسووڕهێنەرە بکەین، تاکو جوانییەکەی پشتی ئەو ئاوابوونە ببینین، چونکە ئەوە جوانی ڕاستەقینەیە، ئەوە سەرچاوەی هەموو جوانییەکانە. ئەوانەی دەیانبینین تەنها ڕەنگدانەوەی ئەو جوانییەن. پێویستە لە ئەستێرەکان و بەفری سەر لوتکەی شاخەکان ورد ببینەوە تاکو پەیامی پشتیان بخوێنینەوە. ئەگەر وا نەکەین هاوشێوەی ئەو کەسەین کە پەیامێک لەناو بتڵێکی جوان و ڕازاوەدا دەدۆزێتەوە، بەڵام تامەزرۆی بتڵەکە دەبێت و هەرگیز پەیامەکەی ناوی ناکاتەوە و نایخوێنێتەوە.

بەڵام ئەو پەیامە چییە لەناو ئەستێرەکاندا هەیە؟ نیشانە و بەڵگەیەک هەیە، بەڵام نیشانە و بەڵگە بۆ چی مەبەستێک؟ ئەم بەڵگە و نیشانانە ئاماژەیەکن بۆ پەروەردگاری مەزن و باڵادەست، بۆ گەورەیی و مەزنی و شکۆ و جوانی پەروەردگار. ئاماژەیەک بۆ توانا و دەسەڵاتی. وردبەرەوە و ڕابمێنە و تێبفکرە لە جوانی و دەسەڵاتی ئەوەی دروست کراوە، بەڵام لەوێدا مەوەستە. خۆت لە جوانییەکەدا ون مەکە. تەماشای پشتی ئەو جوانییە بکە و بیر بکەرەوە ئەگەر دروستکردنەکە هێندە مەزن و جوان و قەشەنگ و شکۆدار بێت، دەبێت خالقەکەی چەندە جوان و قەشەنگ و مەزن و شکۆدار بێت؟ پاشان تێدەگەیت کە، ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ﴾ (سورەتی ال عمران:١٩١)

«پەروەردگارا هیچ شتێکت لەم گەردونەدا نەخوڵقاندووە بەبێ مەبەست و ئامانجێک. سوپاس و ستایش هەر بۆ تۆیە.»

هەموو شتێک مەبەستێکی لە پشتە. هیچ شتێک لە ئاسمانەکان و زەوی و لاشـەی مـن و دەرەوەی تـۆدا بەبێ مەبەست دروست نەکراوە. تەنانـەت هیـچ ڕووداو و کارەساتێک، دڵتەنگییەک، شادمانییەک، ئازارێک، خۆشییەک و لەدەستدانێک بەبێ مەبەست دروست نەکراون. کەواتە پێویستە وەک چۆن (پەیامی ناو بتڵەکە)، خۆر و مانگ و ئاسمان بخوێنینەوە، ئاوایش پێویستە لە پەیامی ئەزموونەکانی ژیانمان ورد ببینەوە.

هەمیشە بە دوای ئاماژە و بەڵگەیەکدا وێڵین، هەمیشە داوا لە پەروەردگار دەکەین قسەمان بۆ بکات، بەڵام ئەم هەموو بەڵگانەی چواردەورمان نابینین و هەستیان پێ ناکەین کە لە هەموو شتەکاندا هەن. پەروەردگار هەمیشە قسەمان بۆ دەکات. پرسیارەکە ئەوەیە ئایا ئێمە گوێی بۆ دەگرین یاخود نا؟

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ لَوْلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوْ تَأْتِينَآ ءَايَةٌ ۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّثْلَ قَوْلِهِمْ ۘ تَشَٰبَهَتْ قُلُوبُهُمْ ۗ قَدْ بَيَّنَّا ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾﴾، (سورەتی البقرە).

«جا ئەوانەی نەفام و نەزانن دەیانگوت: بۆچی پەروەردگار گفتوگۆمان لەگەڵ ناکات؟ یاخود هیچ بەڵگە و نیشانەیەکمان بۆ نایەت؟ کەسانی تریش پێش ئەمان هەمان شتیان دەوت، ئەمانە دڵەکانیان هاوشێوەی یەکن. بێگومان چەندین نیشانە و بەڵگەی ڕوون و ئاشکرامان نیشان ئەو کەسانە داوە کە ڕاستیخوازن و بەشوێن حەقیقەتدا دەگەڕێن».

ئەگەر نەتوانین تەماشای پشتی هەموو شتەکان بکەین کە ڕوودەدەن بۆمان، ئەو شتانەی کە ئەنجامیان دەدەین، یاخود شکست دەهێنین لە ئەنجامدانیان تاکو پەروەردگار ببینین، ئەوکات لە مەبەستەکە تێناگەین. کاتێک شتێک ڕوودەدات کە حەزمان لێیەتی، وریابە مەبەستی سەرەکی

لە یاد نەکەیت. لە یادت بێت هیچ شتێک بەبێ مەبەست ڕوونادات. جوان لێی ورد بەرەوە. بە دوای ئەو مەبەستەدا بگەڕێ کە پەروەرێن دروستی کردووە لەو شتەدا کە پێی بەخشیویت.

ئایا پەروەردگار چی لایەنێکی گرنگی خۆیت پێشان دەدات لە ڕێی ئەو شتەوە؟ چ شتێکی لە تۆ دەوێت؟ بە هەمان چەشن کاتێک شتێک ڕوودەدات بۆت کە پێت ناخۆشە، یاخود ئازارت دەدات، وریابە ون نەبیت لەو خەیاڵاتەدا کە بەهۆی ئازارەکەوە دروست دەبێت. جوان لێی ورد بەرەوە. پەیامی ناو بتڵەکە بدۆزەرەوە، مەبەستەکە بدۆزەرەوە. بهێڵە بەرەو لای پەروەردگار ئاڕاستەت بکات. تەنانەت ئەگەر خزان و شکستێکە لە دینەکەتدا، مەهێڵە شەیتان فریوت بدات. بهێڵە ئەو خزانە ئاڕاستەت بکات بەرەو ئاشنابوون بە ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار بە شێوەیەکی واقیعی. پاشان بە نیازی ڕەحم و بەزەییەک بە تاکو لە تاوانەکانت و زوڵمکردن لە خۆت بتپارێزێت.

نائومێد مەبە ئەگەر کێشەیەکی بێچارەسەرت هەیە. بیر لە (الفتاح) بکەرەوە، ئەو کەسەی هەموو کێشەکان بۆ بەندەکانی چارەسەر دەکات. ئەگەر زریانێک بێت، مەهێڵە نقوم ببیت. بهێڵە بەرەو پەروەردگار ئاڕاستەت بکات کە دەتوانێت بەندەکانی لە زریانەکان بپارێزێت و ڕزگاریان بکات لەکاتێکدا کەسی تر لە دەورت نییە.

لە یادت بێت دوای لەناوچوونی هەموو شتەکان، هیچ شتێک جگە لە پەروەردگاری باڵا نامێنێت، پەروەردگار دەپرسێت: ﴿لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ﴾ (سورەتی غافر:١٦).

«ئیمڕۆ پاشایەتی و فەرمانڕەوایی شایستەی کێیە؟ کێ خاوەنی ئەم هەموو بوونەوەرەیە؟»

هەر لەو ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ هُم بَـٰرِزُونَ لَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِنْهُمْ شَىْءٌ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ ﴿١٦﴾﴾.

«لـەو ڕۆژەدا هەموویـان بـەدەرەوەن (ڕووت و ڕەجـاڵ، نهێنـی و ئاشکرا وەک یەکن)، هیچ شتێکیان لە پەروەردگار شاراوە نییە، پاشـان پـەروەردگاری مـەزن دەفەرموێـت: ئیمـڕۆ پاشـایەتی و فەرمانڕەوایـی شایسـتەی کێیـە؟ کێ خاوەنـی ئـەم هەمـوو بوونەوەرەیـە؟ کـەس نییـە وەڵام بداتـەوە، هـەر خـۆی دەفەرموێـت: پـەروەردگار هـەر خـۆی خـاوەن دەسـەڵاتە و خـاوەن هەمـوو شـتێکە.»

ئیمـڕۆ پاشـایەتی و فەرمانڕەوایـی شایسـتەی کێیـە؟ کـێ خاوەنـی ئـەم هەمـوو بوونەوەرەیـە؟ هـەوڵ بـدە تەنهـا بەشـێک لـە دەسـەڵاتی پـەروەردگار ببینـە لـەم ژیانـەدا. کێ خاوەنـی دەسـەڵاتە ئیمـڕۆ؟ کێـی تـر دەسـەڵات و هێـزی هەیـە ڕزگارت بـکات؟ کێـی تـر دەتوانێـت چارەسـەرت بـکات؟ کێـی تـر دەتوانێـت دڵـە شـکاوەکەت چێبکاتـەوە؟ کێـی تر دەتوانێت پاڵپشـتیت بکات؟ دەتوانیـت بـۆ لای کـێ ڕابکەیـت؟ کێی تر خاوەن دەسەڵاتە ئیمڕۆ؟ ﴿لِّمَـنِ ٱلۡمُلۡـكُ ٱلۡيَـوۡمَۖ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِـدِ ٱلۡقَهَّـارِ﴾ خـودای گـەورە و بەدەسـەڵات... بـۆ گـەڕان بە دوای کەسـێکی تـردا جگـە لـە پـەروەردگار وەک ئەوەیـە بـڵاو ببیتـەوە، بـەڵام هەرگیـز پـڕ نەبیـت. چـۆن دەتوانیـن کامڵـی و یەکگرتنـی دڵ، یـا ڕۆح و ئەقـڵ بەدەسـت بهێنیـن لـە شـتێکی تـردا جگـە لـە پـەروەردگار؟

بۆیـە لـە ڕێـگای گەڕانەوەمانـدا دەتوانیـن بـۆ لای کـێ ڕابکەیـن؟ بـە دوای کێـدا بگەڕێیـن؟ لـە کۆتاییـدا هەموومـان بـە دوای هەمـان شـتەوەین: دڵخـۆش و شـادوومان بین و جارێکی تر بڵێین: (گەڕاینەوە بـۆ مـاڵ).



## بەتاڵکردنەوەی گۆزەکە

پێش ئەوەی هەر گۆزەیەک پڕ بکەیت، پێویستە خاڵی بکەیتەوە. دڵ هاوشێوەی گۆزەیەکە. هاوشێوەی هەموو گۆزەیەک پێویستە خاڵی بکرێتەوە، پێش ئەوەی پڕ بکرێت.

ناکرێت دڵت لێوانلێو بکەیت بە پەروەردگار هەتاکو دڵت پڕبێت لە شتانی دی. خاڵیکردنەوەی دڵ مانای ئەوە نییە هیچ کەس و شتێکت خۆش نەوێت. بە پێچەوانەوە خۆشەویستی ڕاستەقینە وەک پەروەردگاری مەزن دەیەوێت پاکترین خۆشەویستییە ئەگەر لەسەر بنەمای هۆگربوونی هەڵەوە بنیات نەنرابێت.

پرۆسەی سەرەتای بەتاڵکردنەوە و خاڵیکردنەوەی دڵ لە سەرەتای شایەتوماندا بەدی دەکرێت. تەماشا بکە سەرەتای ئاشکراکردنی بیروباوەڕ بە نەرێیەکی گرنگ دەست پێ دەکات، خاڵیکردنەوەیەکی گرنگ، پێش ئەوەی بە هیوا بین بۆ گەیشتن بە یەکتاپەرستییەکی ڕاستەقینە، (تەوحید)، پێش ئەوەی باوەڕی خۆمان بە یەک پەروەردگار پەیوەست بکەین، سەرەتا دەڵێین (لا الە الا اللە)، هیچ خودایەک نییە جگە لە اللە.

«لا الە» شتێک نییە بۆ پەرستن، بەڵکوو بۆ تێگەیشتنە لەوەی کە

«الـه» تەنهـا شـتێک نییـه کـه دەیپەرسـتین. «الـه» شـتێکه کـه ژیانمـان بـه دەوریـدا دەخولێتـەوە و پەیوەسـته پێوەی، ئـەوەی فەرمانی جێبەجێ دەکەیـن و گوێڕایەڵـی دەکەیـن، ئـەوەی گرنگتریـن شـته بـه لامانـەوە. شتێکه کـه لەپێناویـدا دەژیـن و ناتوانین بەبێ ئـەو بژیـن. بۆیـه هەمـووان بـه مولحیـد و گومانکار لـه بوونـی پـەروەردگار و مسـوڵمان و مەسـیحی و جوولەکـه پەروەردگارێکیـان هەیـه. هەمـوو کەسـێک، شـتێک دەپەرستێ. زۆرێکمـان شـتانێکی ژیانـی ئـەم دونیایـه دەپەرسـتین. هەندێـک کـەس سـەروەت و سـامان دەپەرسـتن، هەندێکـی تـر پۆسـت و پلـه، یاخـود ناوبانـگ دەپەرسـتن، هەندێکـی تریـان ژیـری و زیرەکیـان دەپەرسـتن، هەندێکـی تـر کەسـانی تـر دەپەرسـتن. زۆرێکیـش وەکـو پـەروەردگاری مـەزن دەفەرموێـت، خۆیـان و هـەوا و ئارەزووەکانیـان دەپەرسـتن. پـەروەردگار لـه قورئانـی پیـرۆزدا دەفەرموێـت: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾﴾ (سـورةتی الجاثیـة).

«هەواڵـم بـدەرێ ئایـا چاوتـان بـەو کەسـانه کەوتـووە کـه حـەز و ئارەزووی خۆیـان کـردووە بـه خـودای خۆیـان؟ خـودای گـەورە باشـیان دەناسـێت و بـه گومڕایـی دەیانهێڵێتـەوە و مۆری هێنـاوە بەسـەر گوێ و دڵیانـدا و بـان چـاو و بیناییانـی داپۆشـیوە. جـا کـێ هەیـه ڕێنماییـان بـکات جگـه لـه خـودا؟ ئایـا بیـر ناکەنـەوە و تێنافکـرن؟»

ئـەم شـتانه دەپەرسـتین و وابەسـتەیان دەبیـن. هەرچەنـدە ئـەو شـتەی وابەسـتەی دەبیـن تەنهـا شـتێک نییـه کـه خۆشـمان بوێـت. شـتێکه بـه تـەواوی مانـا پێویسـتمان پێیەتـی. شـتێکه ئەگـەر لـه دەسـتی بدەیـن تووشـی داڕمانـی تەواوەتـی دەبیـن. ئەگـەر جگـه لـه پـەروەردگار، شـتێک، یاخـود کەسـێک هەبێـت کـه نەتوانیـن هەرگیـز دەسـتبەرداری ببیـن، ئـەوا

وابەستەبوونێکی هەڵەمان هەڵبژاردووە. بۆچی پەروەردگار بە پەیامبەر ئیبراهیم (درود و سەلامی خوای لەسەر بێت) فەرموو، کوڕەکەی بکاتە قوربانی؟ ئەو فەرمانە لەپێناو ڕزگارکردنی حەزرەتی ئیبراهیمدا بوو.

بۆ ڕزگارکردنی بوو لە وابەستەبوونێکی هەڵە. کاتێک ڕزگاری بوو، بابەتی خۆشەویستییەکەی، (نەک وابەستەبوونەکەی)، پێ بەخشرایەوە.

ئەگەر لەدەستدانی شتێک، یاخود کەسێک تێکمان بشکێنێت، ئەوا وابەستەبوونێکی هەڵەمان هەڵبژاردووە. وابەستەبوون و هۆگربوونی هەڵە، ئەو شتانەن کە بە ڕادەیەکی زۆر دەترسین لە دەستی بدەین. شتێکە کە تەنانەت لێمان دوور دەکەوێتەوە، نائومێدانە شوێنی دەکەوین.

شوێنی دەکەوین، چونکە لەدەستدانی شتێک کە وابەستەی بووین، دەبێتە هۆی تیاچوون و تێکشکانمان بە تەواوی، توندی و سەختی تێکشکانەکە پەیوەستە بە ڕێژەی وابەستەبوون و هۆگربوونەکەوە. ئەم وابەستەبوونانە دەکرێت پارە، کەلوپەل، کەسانی دی، بیرۆکە، خۆشی جەستەیی، دەرمانی بێهۆشکەر، پلە و پۆست، پیشەکانمان، وێنەکانمان، چۆن کەسانی دی لێمان دەڕوانن، شێوەی جەستەمان و جوانیمان، شێوازی خۆگۆڕینمان، یاخود دەرکەوتنمان بە لای کەسانی ترەوە، ئاستی خوێندنمان، پۆستی کارەکەمان، کۆنترۆڵکردنی خۆمان، ژیری و زیرەکیمان، یاخود مەنتیقمان بن. تاکو ئەم وابەستەبوونە هەڵانە تێک نەشکێنین، ناتوانین گۆزەی دڵمان خاڵی بکەینەوە.

ئەگەر گۆزەکە خاڵی نەکەینەوە، ناتوانین بەڕاستی پڕی بکەینەوە بە پەروەردگاری باڵادەست. ئەم هەوڵدانە بۆ ڕزگارکردنی دڵەکانمان لە وابەستەبوونی هەڵە و هەوڵی خاڵیکردنەوەی گۆزەی دڵمان گەورەترین هەوڵ و کۆششی ژیانی ئەم دونیایەیە. ئەم هەوڵدانە بنەمای سەرەکی تەوحیدە (یەکتاپەرستی ڕاستەقینە). ئەوە دەبینیت

ئەگـەر بـە وردی لێـی ڕابمێنیـت، هەمـوو پێنـج پایەکـەی ئیسـلام گرنـگ و جێـی بایەخـن بـۆ چۆنیەتـی دەربازبـوون و ڕزگاربـوون لـەو وابەسـتەبوونە هەڵانـە:

## «شایەتومان»

شـایەتومان، واتـا ئاشـکراکردن و ڕاگەیاندنـی بیروبـاوەڕ، کردارێکـی زارەکییـە بـۆ ڕزگاربـوون لـە وابەسـتەبوون: تاکـە شـتێک کـە بیپەرسـتین، خۆمانـی بـۆ تەرخـان بکەیـن، خۆشـمان بوێـت، بترسـین، هیوامـان پێـی هەبێـت، پـەروەردگارە. بـۆ سـەرکەوتن لـە ڕزگارکردنـی کەسێک لـە هەمـوو وابەسـتەبوونەکانی تـر، جگـە لـە وابەسـتەبوون بـە پەروەرێنمـان، ڕاسـتەقینەترین وێناکردنـی تەوحیـد و یەکتاپەرسـتییە.

## «نوێژ: پێنج نوێژە فەرزەکان»

پێویسـتە ڕۆژی پێنـج جـار لـە دونیـا دوور بکەوینـەوە بـۆ تێڕامـان لـە پەروەرێنمـان و گەورەتریـن مەبەسـتمان. ڕۆژی پێنـج جـار خۆمـان دادەبڕێنیـن لـەو کارە دونیایانـەی کـە خەریکیـن ئەنجامـی دەدەیـن و ڕوو دەکەینـە پـەروەردگاری باڵادەسـت. دەکـرا نوێـژ تەنهـا یەکجـار ئەنجـام بدرایـە لـە ڕۆژێکـدا، یاخـود هەفتەیەکـدا، یاخـود هـەر پێنـج نوێژەکـە لـە یـەک کاتـدا ئەنجـام بدرایـە، بـەڵام بـەو شـێوەیە نییـە. نوێژەکان دابەش کراون بەسـەر ڕۆژەکەدا. ئەگەر کەسێک نوێژەکانی لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا ئەنجام بدات، ئەوا هیچ دەرفەتێک نابێت بـۆ وابەسـتەبوون بـە شـتە دونیاییەکانـەوە. ئەگـەر سـەرقاڵ ببیـن بـە کێشـەکانی ئـەم دونیایـەوە، (کارەکانمـان کـە خەریکیـن ئەنجامیـان دەدەیـن و نمایشـەکان کـە تەماشـایان دەکەیـن، تاقیکردنـەوەکان کـە بۆیـان دەخوێنیـن، ئـەو کەسـەی کـە ناتوانیـن لـە بیـری بکەیـن)،

ناچارین لێیان داببڕێین و ڕوومان وەرگێڕین لەپێناو تاکە مەبەستی سەرەکیماندا.

## «ڕۆژوو»

ڕۆژوو واتا دابڕان، دابڕان لە خواردن و خواردنەوە و چێژی جنسی و قسەی پووچ و بەتاڵ. بە ڕێگریکردن لە جەستەمان، لایەنی ڕۆحیمان خاوێن دەکەینەوە. لە ڕێی ڕۆژووەوە ناچارین خۆمان لە پێویستییە جەستەییەکانمان و هەوا و ئارەزووەکانمان دابڕین.

## «زەکات: خێرکردن»

زەکات، واتا خۆدابڕینمان لە پارە و سامانەکانمان و بەخشینیان لەپێناوی پەروەردگاردا، بە بەخشینی سامانەکەمان ناچارین خۆمان دابڕین لە وابەستەبوون بە سەروەت و سامانەکانمانەوە.

## «حەج: گەشتی ماڵی پەروەردگار»

حەج یەکێکە لە گرنگترین و پڕماناترین کارەکان بۆ خۆدابڕین لە شتە دونیاییەکان. حاجییەک هەموو شتێکی ژیانی جێدەهێڵێت. دەست لە خێزان و منداڵ و ماڵەکەی و مووچەکەی و جێگا نەرم و گەرمەکەی و پێڵاوە بەهادارەکانی و جلە قەشەنگ و مارکەکانی هەڵدەگرێت تەنها لەپێناو خەوتن لەسەر زەویدا، یاخود لە خێمەیەکی قەرەباڵغ و جەنجاڵدا و پۆشینی تەنها دوو پارچە قوماشی سادە. هیچ پلە و پۆستێک لە حەجدا بوونی نییە. نە ئیحرامی [تۆمی هیلفیجەر] هەیە، نە خێمەی پێنج ئەستێرە. ئوتێلە پێنج ئەستێرەییەکان تەنها لە پێش، یاخود دوای حەجدا باس دەکرێن. لە کاتی حەجدا لە مینا، لەناو خێمەیەکدا لەسەر زەوی دەخەویت، لە موزدەلیفە لەژێر ئاسمانی شیندا دەخەویت.

تێبگە پەروەردگار بەوپەڕی ژیری و بەزەییەوە تەنها داوامان لێ ناکات خۆمان لەم دونیایە داببڕین، بەڵکوو پێمان دەفەرموێت چۆن و بە چی شێوەیەک خۆمان داببڕین. لە پشت هەر پێنج پایەکەوە، تەنانەت جلەکانیشمان دەبێت لێی دابڕێین. پەیامبەرمان(ﷺ) پێمان دەفەرموێت خۆمان جیا بکەینەوە لە قەرەباڵغی و جیاواز بین تەنانەت لە شێوازی دەرکەوتنماندا. بە پۆشینی حیجاب و کوفی، یاخود هێشتنەوەی ڕیش، ناتوانیت خۆت بگونجێنیت، تەنانەت ئەگەر ویستیشت لەسەر بێت. پەیامبەرمان(ﷺ) دەفەرموێت **«إِنَّ الإِسْلَامَ بَدَأَ غَرِيبًا، وَسَيَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ، فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ».**

«ئیسلام بە نامۆیی و غەریبی دەستی پێ کرد، دەبێتە شتێکی غەریب و نامۆ لە کۆتاییدا، کەواتە خۆشبەختی بۆ نامۆیان و غەریبەکان.» (رواه مسلم والترمذي و الطبراني).

بە نامۆبوون و غەریببوونمان لەم دونیایەدا، دەتوانین تێیدا بژین بەبێ ئەوەی ببینە بەشێک لێی. لە ڕێی ئەو دابڕانەوە دەتوانین گۆزەی دڵمان خاڵی بکەینەوە لەپێناو ئەو شتەی کە ژیان و خۆشی دەبەخشێتە دڵەکان. بە خاڵیکردنی دڵەکانمان ئامادەی دەکەین بۆ خۆراکی ڕاستەقینەی دڵەکان کە ئەویش پەروەردگاری باڵایە.



## خۆشەویستیی خەڵاتەکە

هەموومـان خەڵاتمـان خـۆش دەویـت. خەڵاتەکانمـان خـۆش دەویـت، چونکـە ژیانمـان ڕازاوە و قەشـەنگ دەکـەن. منداڵەکانمـان، هاوسـەرەکانمان، دایـک و باوکمـان و هاوڕێکانمـان خـۆش دەوێت. گەنجێتـی و تەندروسـتی خۆمـان خـۆش دەوێت. مـاڵ و ئۆتۆمبیـل و پـارە و جوانـی خۆمـان خـۆش دەوێت. چـی دەبێت کاتێـک خەڵاتێـک دەبێتـە زیاتـر لـە خەڵاتێـک لـە دڵمانـدا؟ چـی ڕوودەدات کاتێـک ئـەو شـتەی دەتەوێت دەبێتـە شـتێکی پێویسـت، پاداشـتێک دەبێتـە هۆگـری و وابەسـتەیی؟ چـی ڕوودەدات کاتێـک ئـەو خەڵاتـەی پێمـان بەخشـراوە چیـدی خەڵاتێـک نییـە لـە خەیـاڵ و دڵمانـدا؟

خـەڵات چییـە؟ خـەڵات شـتێکە کـە موڵکـی خۆمـان نییـە، بەڵکـوو پێمـان دەبەخشـرێت و دەکرێـت لێمـان بسـەندرێتەوە. خـودی خۆمـان خاوەنـی سـەرەکی خەڵاتەکە نین. خـەڵات پێویسـتییەکی بنچینەیـی نییـە بـۆ مانەوەمـان، بەڵکـوو دێـت و دەڕوات. دەمانەوێـت و حـەز دەکەیـن خـەڵات وەربگریـن، بـەڵام پێویسـتییەکی سـەرەکی نیـن بـۆ مانـەوە و بوونمـان. پشـتیان پـێ نابەسـتین.

ناژیـن بـۆ ئـەوەی خـەڵات بەدەسـت بهێنیـن، نامریـن ئەگـەر خـەڵات

وەرنەگرین. هەوا و خۆراکمان نین، بەڵام خۆشمان دەوێن. کێ حەزی بە خەڵات نییە؟ کێ حەز ناکات خەڵاتی زۆر بەدەست بهێنێت؟ داوا لە الکریم (بەخشندەترین)، دەکەین کە لە خەڵاتەکانی بێبەشمان نەکات، بەڵام نابێت هۆگری و وابەستەییمان بخەینە سەر خەڵاتەکان و بە نەبوونیان بمرین.

لە یادت بێت دوو شوێن هەن شتەکانی تێدا هەڵدەگرین: دەستەکانمان، یاخود دڵەکانمان. ئایا خەڵاتەکە لە کوێدا هەڵدەگرین؟ نابێت خەڵات لە دڵەکانماندا هەڵبگرین، بەڵکوو دەبێت لە دەستەکانماندا هەڵیبگرین. دەستەکانمان تووشی ئازار دەبێت نەک دڵەکانمان، کاتێک خەڵاتێکمان لێ وەردەگیرێتەوە. هەرکەسێک بۆ ماوەیەکی زۆر ژیابێت، دەزانێت ئازاری دەستەکان هاوشێوەی ئازاری دڵەکان نییە. ئازاری دڵەکان بریتییە لە لەدەستدانی شتێک کە وابەستەی بووین و هۆگری بووین. ئەو ئازارە هاوشێوەی ئازارەکانی تر نییە. ئازارێکی ئاسایی نییە. ئەو ئازارە بۆ ئەوەیە بزانین شتێکمان لەدەست چووە کە وابەستەی بووین، خەڵاتەکە لە شوێنێکی هەڵەدا هەڵگیراوە.

ئازاری دەستەکانیش ئازارن، بەڵام جیاوازن، زۆر جیاوازن. ئازاری دەستەکان بریتییە لە لەدەستدان، بەڵام شتێک نییە کە وابەستەی بووبین. کاتێک خەڵاتێک لە دەستەکانمان دەردەکرێت، یاخود هەرگیز پێمان نابەخشرێت، هەست بە ئازارێکی ئاسایی لەدەستدان دەکەین. خەمبار دەبین، دەگرین، بەڵام ئازارەکە تەنها لە دەستەکانماندایە، دڵەکانمان بە ساغ و سەلامەت دەمێنێتەوە، چونکە دڵەکان دەبێت تەنها بۆ پەروەردگار تەرخان بکرێن.

ئەگەر لە شتەکانی ژیانمان ورد ببینەوە کە تووشی زۆرترین ئازار، یاخود ترسیان کردوین، دەتوانین بزانین کام خەڵاتە لە

شـوێنێکی هەڵـەدا هەڵگیـراوە. ئەگـەر نەتوانیـن هاوسـەرگیری بکەیـن، لەگەڵ ئـەو کەسـەدا بین کـە دەمانەوێت، منداڵمـان هەبێت، کارێکمـان دەسـت بکەوێت، بـە شـێوەیەک دەربکەویـن، بڕوانامەیـەک بەدەسـت بهێنیـن، یاخـود بگەیـن بـە پلـە و پۆسـتێکی دیاریکـراو، پێویسـتە گۆڕانـکاری ئەنجـام بدەیـن. پێویسـتە شـوێنی هەڵگرتنـی خەڵاتەکـە بگۆڕیـن، پێوسـتە خەڵاتەکـە لـە دڵەکانمـان دەربهێنیـن و بیگەڕێنینـەوە بـۆ نـاو دەسـتەکانمان.

دەتوانیـن حەزمـان لـەم شـتانە بێت. مرۆڤـەکان حەزیـان لـە شـتانی هەمەجـۆرە. مـرۆڤ ئـەو خەڵاتانـەی دەوێـت کـە حـەزی لێیەتـی. گرفتەکەمـان لەوێـوە سـەرهەڵدەدات کاتێـک خەڵاتەکـە دەخەینـە نێـو دڵەکانمانـەوە، بـەڵام پـەروەردگار دەخەینـە نێـو دەسـتەکانمان. واتـا بڕوامـان وابێت کـە دەتوانین بەبێ پەروەردگارمـان بژین، بـەڵام ئەگەر خەڵاتێـک لەدەسـت بدەیـن تێکدەشـکێین و ناتوانیـن بـەردەوام بیـن.

لـە ئەنجامـدا دەتوانیـن بـە ئاسـانی پـەروەردگار بخەینـە لاوە، بـەڵام دڵەکانمـان ناتوانـن بەبێ خەڵاتەکـە بژیـن. لـە ڕاسـتیدا تەنانـەت دەتوانین پەروەردگارمـان بخەینـە لاوە و فەرامۆشـی بکەیـن لەپێنـاوی خەڵاتەکـەدا. ئـەو کات لامـان ئاسـان دەبێـت نوێژەکانمـان دوابخەیـن، یاخـود لەدەسـتی بدەیـن، بـەڵام کۆبوونەوەکـەم، فلیمەکـەم، چوونـە دەرەوەکـەم، بازاڕکردنەکـەم، وانەکـەم، ئاهەنگەکـەم، یاخـود یـاری باسـکەکەم لەدەسـت نەچێـت. ئاسـان دەبێـت سـوو بخۆیـن، یاخـود کهول بفرۆشـین، بـەڵام قازانج و پیشـەکەم لەدەست نـەدەم، ئۆتۆمبیلـە نوێیەکـەم و خانـووە خـۆش و دڵگیرەکـەم لەدەسـت نـەدەم. ئاسـان دەبێت بـۆم پەیوەنـدی حـەرام، یاخـود چاوپێکەوتنـی حەرامـم هەبێت، بـەڵام ئـەو کەسـە لەدەسـت نـەدەم کـە خۆشـم دەوێت. ئاسـان دەبێت حیجابەکـەم لابـەرم، یاخـود نەیپۆشـم، بـەڵام جوانـی و قەشـەنگی و

خوازبێنیکاران و دەرکەوتنم لە پێش چاوی خەڵکیدا لەدەست نەدەم. ئاسانە ئەو خشوع و پابەندییەم بخەمە لاوە و فەرامۆشی بکەم کە پەروەرێنمان خۆشی دەوێت و پێی جوانە، بەڵام پانتۆڵە تەسکەکەم لەدەست نەدەم کە کۆمەڵگە پێم دەڵێت جوانە.

ئەمە ڕوودەدات، چونکە خەڵاتەکە لەنێو دڵەکانماندایە، بەڵام پەروەردگار لەنێو دەستەکانماندایە. ئەو شتەی لەنێو دەستەکاندایە دەکرێت بە ئاسانی بخرێتە لاوە و فەرامۆش بکرێت. ناتوانین بەبێ ئەو شتانە بژین کە لەنێو دڵەکاندایە و هەموو شتێک دەکەینە قوربانی تاکو بەدەستی بهێنین. زوو یاخود درەنگ دەبێت لەخۆمان بپرسین ئەو شتە چییە کە دەیپەرستین؟ خەڵاتەکە یاخود بەخشەرەکەی «پەروەردگار»؟ جوانییەکە، یاخود سەرچاوە و پێناسەی جوانییەکە؟ بەخشراوەکە، یاخود بەخشەرەکە؟ دروستکراوەکە، یاخود پەروەرێن و ئافرێنەرەکەی؟

تراژیدیاکە ئەوەیە گەردنی خۆمان کۆت و بەند دەکەین لە ڕێی وابەستەبوون بە خەڵاتەکانەوە، پاشان دەپرسین بۆچی خنکاین؟ هەوای ڕاستەقینەی ژیانمان فەرامۆش دەکەین و پاشان دەپرسین بۆچی ناتوانین هەناسە بدەین؟ دەستبەرداری تاکە خۆراکی ژیانمان دەبین و پاشان سکاڵا دەکەین کاتێک خەریکە لە برسا دەمرین. لە کۆتاییدا چەقۆکە دەچەقێنینە سەر سینگمان و پاشان دەگرین، چونکە ئازاری زۆرە. هەرچییەکمان بەسەردا بێت خۆمان بەسەر خۆمانیدا دەهێنین. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ٣٠﴾ (سورەتی الشورى).

«هەر بەڵا و کارەساتێکتان بەسەردا بێت، دەرئەنجامی ئەو کار و کردەوانەیە کە بە ئارەزووی خۆتان ئەنجامتان دەدا. پەروەردگار

هێندە میهرەبانە لە زۆربەی تاوان و هەڵەکانتان خۆش دەبێت و دەبووڕێت.»

هەر شتێکمان بەسەردا هاتبێت خۆمان هۆکارین، بەڵام تەماشا بکە ئایەتەکە چۆن کۆتایی دێت، «پەروەردگار لە زۆربەی تاوان و هەڵەکانت خۆش دەبێت و دەبوریێت.» ئەو وشەیەی کە لەم ئایەتەدا بەکار هاتووە بریتییە لە «یعفو»، کە لە یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی پەروەردگارەوە وەرگیراوە «العفو». ئەمەیش تەنها مانای بەخشین و لێخۆشبوون نییە، بەڵکوو سڕینەوەیەتی بە تەواوی. کەواتە گرنگ نییە چەندجار ئەو چەقۆیە لەسەر سینگمان بچەقێنین، پەروەردگار شیفامان دەدات، وەک ئەوەی برینێک بوونی نەبووبێت. الجبار (چاککەرەوە) دەتوانێت چاکی بکاتەوە ئەگەر ڕووی تێبکەیت. چەند گەمژەیە ئەو کەسەی هەوای سازگار دەگۆڕێتەوە بە ملوانکەیەک؟ ئەو کەسەیە کە دەڵێت «ملوانکەکەم بدەرێ، دواتر هەموو هەوا سازگارەکەم لێ بسێنەرەوە. بمخنکێنە تەنها با دڵنیابم ملوانکەکەم لە ملدایە کاتێک دەمرم.»

واتا ئەوە ملوانکەکەیە کە دەمانخنکێنێت، ئەو شتەیە کە وابەستەی بووین، ئەو شتەی کە لە پەروەردگارمان زیاتر خۆشمان دەوێت، دەمانخنکێنێت و دەمانکوژێت. گرفتەکەمان لەوێوە دەست پێ دەکات، خەڵاتەکە وەک هەوا تەماشا دەکەین بۆ ژیانمان، نەک تەنها وەک خەڵاتێک تەماشای بکەین و بەس. لە بێئاگاییماندا، وابەستە دەبین بە خەڵاتەکەوە، هەوا ڕاستەقینەکە فەرامۆش دەکەین. لە ئەنجامدا کاتێک خەڵاتەکەمان لێ دەسەندرێتەوە، یاخود هەر پێمان نابەخشرێت، وا بیر دەکەینەوە کە ناتوانین چیدی بەبێ ئەو بژین و بەردەوام بین. ئەوە درۆیەکی شاخدارە بە خۆمانی دەڵێین تاکو وای لێ دێت باوەڕی پێ دەکەین. ئەوە ڕاست نییە. تەنها یەک لەدەستدان هەیە کە هەرگیز سارێژ نابێت.

تەنها یـەک هـۆکار هەیـە کـە بەبێ ئـەو ناتوانیـن بـەردەوام بیـن و بژیـن. ئـەوە کاتێکـە پـەروەردگار لەدەسـت دەدەیـن. زۆربەمـان پەروەردگارمـان لەدەسـت داوە لـە ژیانمانـدا و وا بیـر دەکەینـەوە کـە هێشـتا زیندوویـن. وابەسـتەبوونە هەڵەکانمـان بـە خەڵاتەکانـی پـەروەردگارەوە زۆر فریـوی داویـن. تەنهـا و تەنهـا پـەروەردگار سـەرچاوەی مانـەوە و ژیانمانـە، نـەک خەڵاتەکانـی.

پـەروەردگار هـەر خـۆی پاڵپشـت و پێویسـتی سـەرەکیمانە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبۡدَهُۥۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ٣٦﴾ (سورەتی الزمـر).

«ئایـا تەنهـا پەروەرێـن بـەس و کافـی نییـە بـۆ بەنـدەی خـۆی کـە پەیامبـەرە؟ بـەڵام ئـەوان هـەوڵ دەدەن بـە شـتێکی تـر جگـە لـە پـەروەردگاری باڵادەسـت بتترسـێنن. ئـەوەی پـەروەردگار گومـڕای بکات و سـەری لـێ بشـێوێنێت، کەسـی تر ناتوانێت دەستی بگرێت و ڕێنمویـی بـکات.»

هەمووـمان پێویسـتی و ئارەزوومان هەیـە. نەهامەتیەکانمان کاتێک دەسـت پـێ دەکـەن ئارەزووەکانمـان وەکـو پێویسـتییەکان دەبینیـن، تاکـە پێویسـتی ڕاسـتەقینەمان بریتییـە لـە «پـەروەردگاری گـەورە و میهرەبـان».

بـەڵام وا هەسـت دەکەیـن دەتوانیـن بەبێ ئـەو بژیـن و بـەردەوام بیـن لـە ژیـان. نەهامەتییـە ڕاسـتەقینەکە کاتێـک دەسـت پـێ دەکات کـە مەبەسـت و هۆکارمـان لـێ دەگۆڕێت. هەمـوو شـتەکانی ژیانمـان هـۆکارن. کاتێـک تووشـی نەهامەتـی دەبیـن کـە چاوەکانمـان لەسـەر مەبەسـتە سـەرەکییەکە لاببەیـن و ئاوێـزان و وابەسـتەی هـۆکارەکان بیـن.

لە ڕاستیدا مەبەستی سەرەکی خودی خەڵاتەکە بریتییە لە نزیککردنەوەمان لە پەروەردگاری مەزن. تەنانەت هەرچەندە خەڵاتەکە هۆکاریش بێت. بۆ نموونە ئایا پەیامبەرمان (ﷺ) نافەرمووێت کە هاوسەرگیری نیوەی ئیمانە؟ بۆچی وای فەرموو؟ ئەگەر بە شێوەیەکی دروست بەکار بهێنرێت، ئەوا چەند بەشێکی کەمی ئەم ژیانە دەکرێت هەمان کاریگەری هەبێت لەسەر گەشەپێدانی کەسایەتی کەسەکان.

دەتوانیت لەبارەی تایبەتمەندییەکانی وەکو ئارامگرتن، سوپاسگوزاری، بەزەیی، خشوع، بەخشندەیی، حاشاکردن لە خود و پەسەندکردنی تایبەتمەندییەکی تر بۆ خۆت بزانیت، بەڵام ناتوانیت ئەم تایبەتمەندییانە پەرە پێ بدەیت تاکو نەکەویتە بارودۆخێکەوە کە تاقی بکرێیتەوە.

خەڵاتی وەکو هاوسەرگیری دەبێتە هۆکار بۆ نزیکبوونەوەت لە پەروەرێنی باڵا، ئەگەر هەر وەکو هۆکارێک بمێنێتەوە نەک مەبەست. خەڵاتەکانی پەروەردگاری مەزن هەمیشە وەکو هۆکارێک دەمێنێتەوە لە لای پەروەردگار تا ئەو کاتەی لە دەستەکاندا هەڵبگیرێن نەک دڵەکان. لە یادت بێت هەر شتێک لە دڵەکاندا جڵەوت بکات، هەموو هەوڵەکان و قوربانیدانەکانت لەپێناو ئەو شتەدا دەبێت تاکو بەدەستی بهێنیت و بۆ هەمیشە پارێزگاری لێ بکەیت. دەبێتە ئەو شتەی کە بە شێوەیەکی سەرەکی پشتی پێ دەبەستیت و وابەستەی دەبیت. کەواتە دەبێت شتێکی هەمیشەیی و نەبڕاوە بێت. شتێک بێت کە هەرگیز لەدەستی نەدەیت. تەنها یەک شت هەیە ئەو تایبەتمەندییانەی هەبێت، ئەویش بەدیهێنەری مەزنە.

## ئارامی لەبان سەربان‌دا

هەمووان ساتی ناڕەحەتمان هەبووە و پێیدا تێپەڕیوین، ساتی ناڕەحەتی من ئەو کاتە بوو کە لەسەر سەربانەکەی مسجد الحرام بووم. تەنها ئاسمان لە سەرووی منەوە بوو، لە خوارووی منەوە جوانترین و قەشەنگترین دیمەنی کەعبە هەبوو کە بەڵگەیەکی بەهێزی پەروەردگار و ئەم ژیانە و ژیانی دوابیە. بە قەرەباڵغییەکی زۆر دەورە درابووم کە لە هیچ شوێنێکی تری ئەم جیهانەدا قەرەباڵغییەکی هاوشێوە بوونی نەبوو، بەڵام وەک ئەوەبوو بە تەنها بم لەگەڵ پەروەرێنی خۆمدا.

دڵئێشان و جەنجاڵی و گومانێکی زۆرم لەگەڵ خۆمدا هێنابوو بۆ سەر سەربانەکە. زۆر لاواز و سست و پڕ ئازار بووم. لەسەر دووڕیانی ژیانمدا وەستابووم، ترسی ئەو شتانەم هەبوو کە ڕوودەدەن.

کاتێک لەسەر سەربانەکە بووم، چیرۆکی پەیامبەر موسام بیر کەوتەوە کە بەدیار دەریای سوورەوە وەستابوو، چاوی سەری هیچی نەدەدی جگە لە شینایی ئاو کە هاوشێوەی سوپایەکی چەکدار دەوری دابوو، بەڵام چاوی دڵی تەنها پەروەردگاری باڵای دەبینی،

ڕێگایەک بۆ ڕزگاربوونی کە زۆر دڵنیابوو لێی. کاتێک گەلەکەی بێهیوا و متمانە بوون، تەنها باسی دەستبەسەرداگرتنیان دەکرد، پەیامبەر موسا هەرگیز کۆڵی نەدا. کاتێک لەوێدا وەستابووم، گوێم لەو دەنگانە بوو کە ئاگاداریان دەکردمەوە، بەڵام دڵم تەنها گوێی لە ﴿إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ﴾ «بەڕاستی پەروەردگارم لەگەڵدایە، هەر خۆیشی ڕێنماییم دەکات بۆ ڕزگاری و سەرفرازی.» بوو، (سورەتی الشعراء: ٦٢).

لە ساتی نارەحەتی و ئاڵۆزی و ئازاردا و ئەو دەمەی چواردەوریان داوین، تەنها کاتێک دەتوانین ببینین کە ڕێگە بە دڵەکانمان بدەین سەرنج بدەن. بنچینەی ئیسلام بریتییە لە تەوحید (یەکتاپەرستی)، بەڵام تەوحید تەنها بریتی نییە لە وتنی «پەروەردگار تاک و تەنهایە!»، بەڵکوو زۆر لەوە قووڵترە. تەوحید بریتییە لە بوونی یەکتایی مەبەست و ترس و پەرستش و خۆشەویستی بۆ پەروەردگار. تەوحید بریتییە لە یەکتایی بینین و ڕوانینەکان، بریتییە لە ئاراستەکردنی سەرنجی کەسێک بۆ یەک خاڵ و شوێن، ڕێدان بە هەموو شتەکانی تر تاکو مانای خۆیان هەبێت.

یەکێک لە جوانترین سوونەتەکانی پەیامبەرمان (ﷺ) ئەم دیمەنە بە جوانی ڕوون دەکاتەوە، پەیامبەرمان فەرمووی:

**مَنْ كَانَتِ الآخِرَةُ هَمَّهُ جَعَلَ اللَّهُ غِنَاهُ فِي قَلْبِهِ وَجَمَعَ لَهُ شَمْلَهُ، وَأَتَتْهُ الدُّنْيَا وَهِيَ رَاغِمَةٌ، وَمَنْ كَانَتِ الدُّنْيَا هَمَّهُ جَعَلَ اللَّهُ فَقْرَهُ بَيْنَ عَيْنَيْهِ، وَفَرَّقَ عَلَيْهِ شَمْلَهُ، وَلَمْ يَأْتِهِ مِنَ الدُّنْيَا إِلاَّ مَا قُدِّرَ لَهُ.**

«هەرکەسێک سەرقاڵ بێت بە ڕۆژی دواییەوە و ئەوێ بکاتە ئامانجی سەرەکی، پەروەردگار دەوڵەمەندی دەخاتە دڵی و کاروبارەکانی ڕێک دەخات و شتەکانی دونیاشی بە قسمەت دەبێت هەرچەندە کە گرنگی پێ نەدا. هەروەها هەر کەسێک ئەم

دونیایە بکاتە ئامانجی سەرەکی و پێوەی سەرقاڵ بێت، پەروەردگار هەژاری دەکات و کاروبارەکانی پەرتوبڵاو دەکات و هیچ شتێکی ئەم دونیایەی بە قسمەت نابێت تەنها ئەوە نەبێت کە بۆی دانرابوو.»
(رواه الترمــذي).

ئەگەر وێنەیەکی سەرنجراکێش ببینیت، پێچەوانەی ئەم ڕاستەقینەیە دەبینیت. لە یەکەم تەماشاکردندا وێنەکە هیچ مانایەکی نییە جگە لە کۆکراوەی چەند شێوەیەکی ئەندازەیی کە هیچ ڕێکی و مەبەستێکی تێدا نییە.

ئەگەر وێنەکە ڕێک بهێنیتە پێش چاوت و سەرنجت بخەیتە سەر یەک خاڵ، کاتێک وێنەکە بە لەسەرخۆیی لە پێش چاوت لادەبەیت، وێنەکە لەناکاو ڕوون دەبێت بە لاتەوە. ئەگەر سەرنجت لەسەر تاکە خاڵەکە لابەریت، وێنەکە دیارنامینێت و هیچ مانایەک نادات بە دەستەوە جگە لە چەند شێوەیەکی ئەندازەیی. بە هەمان شێوە تاکو زیاتر سەرنج بخەینە سەر دونیا، کێشەکان زیاتر بڵاو دەبنەوە، تاکو زیاتر بەشوێن دونیاوە ڕابکەین، زیاتر لێمان ڕادەکات و دوور دەکەوێتەوە. تاکو زیاتر بەشوێن سەروەت و سامانەوە بین، زیاتر هەست بە هەژاری دەکەین.

ئەگەر سەرنجمان تەنها لەسەر پارە بێت، هەست بە هەژاری دەکەیت، گرنگ نییە چەندە پارەت هەبێت، هەمیشە دەترسیت لەدەستی بدەیت. ئەمەیش خۆی لە خۆیدا هەژارییە. بۆیە پەیامبەر دەفەرموێت ئەم جۆرە کەسانە هەمیشە هەژاری لە پێش چاویاندایە. هەژاری تاکە شتێکە کە دەیبینن. گرنگ نییە چەندە پارە و سامانیان هەبێت، چونکە هەگیز تێر نابن. بەڵکوو زیاتر ڕەزیل و قرچۆک دەبن و هەمیشە ترسی لەدەستدانی پارە و سامانەکانیان هەیە. ئەوانەی سەرنجیان تەنها لەسەر پەروەردگاری مەزنە، دونیا خۆی

پێشکەشیان دەکات، پـەروەردگار دڵەکانیـان تێر دەکات. هەست بـە دەوڵەمەنـدی دەکـەن تەنانـەت ئەگـەر سـەروەت و سـامانێکی کەمیـان هەبێت، هەروەهـا زیاتر حـەز دەکـەن لێی ببەخشـن.

کاتێـک ئـەم جـۆرە کەسـانە هەسـت دەکـەن کەوتوونەتـە داوی ژیـان و گرفتـی دارایـی و ئـازار و تەنهایـی و تـرس و دڵشـکان، یاخـود خەمبارییـەوە، دەگەڕێنـەوە بـۆ لای پەروەرێـن، پەروەرێنیـش هەمیشـە لـەو کێشـە و گرفتانـە ڕزگاریـان دەکات. لـە بیـرت بێت ئەمـە تەنهـا شـتێکی تیـۆری نییـە، بەڵکـوو بەڵێنـە. بەڵێنێکـە پەروەرێنمـان خـۆی داوێتـی کاتێـک لـە قورئانـی پیـرۆزدا دەفەرموێـت: ﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِنْكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَنْ يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾﴾ (سـورەتی الطـلاق).

«کاتێک گەیشتنە مـاوەی دیاریکراوی خۆیـان (دوای یـەک یاخـود ئـەو دوو تەڵاقـەی خواردوویانـە)، ئینجا بیانهێڵنـەوە لای خۆتـان لەگـەڵ ڕەفتـار و هەڵسوکەوتی چاکدا، یاخـود وازیـان لـێ بهێنن و لێیـان جیا ببنـەوە (لـە سـێیەم جـاردا کـە تەڵاقتـان خـوارد)، بـە شـێوەیەکی جـوان کـە مافیـان پارێـزراو بێت، لـە کاتـی جیابوونـەوەی یەکجاریـدا بـا دوو شـایەتی دادپـەروەر و خوانـاس لەنێوانتانـدا هەبێت و ئامـادەی شـایەتی بـن لەبـەر پـەروەردگار بیپارێـزن، بـەوەی کـە بـاس کـرا ئامـۆژگاری دەکرێـت ئـەو کەسـەی بـاوەڕی بـە پـەروەردگار و ڕۆژی دوایـی هێنـاوە، جـا ئـەوەی لـە پـەروەردگار بترسـێت و پارێـزکار بێـت، ئـەوا پـەروەردگار دەروی لـێ دەکاتـەوە(٢) لـە شـوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی

پێ دەبەخشێت کە خۆی پێی نازانێت، ئەوەی پشت بە پەروەردگار ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی پەروەرێن کار و فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت، بێگومان پەروەردگار بۆ هەموو شتێک نەخشە و پلانێکی دیاریکراوی بڕیار داوە(٣)».

ئەوانەی لە پەروەرێن دەترسن، هەمیشە پەروەرێن ڕێی ڕزگاربوونی بۆ ئامادە کردون. پەروەرێن لەو پاداشت و خەلاتانەی خۆی پێ دەبەخشێت کە هەرگیز پێشبینی نەکردووە. هەرکەسێک پشت بە پەروەرێن ببەستێت، ئەوا پەروەرێن گەورە کافییە و بەسە بۆی. پەروەردگاریان بەسە، پەروەردگار هەموو شتێکە بۆ ئەو کەسانەی پەروەردگاری بالا دەکەنە ئامانجی سەرەکییان. ئەوانە تەنها ئاشتی و ئارامی دەچێژن، چونکە هەر شتێک ڕوودات بۆیان لەم ژیانەدا ئەوا خێر و باشە، وەکو ویست و قەدەرێکی ئیلاهی قبووڵی دەکەن. بیهێنە پێش چاوت کە تەنها باشە لە ژیانتدا هەبێت. ئەمە حاڵی ئەم جۆرە باوەڕدارانەیە. هەر وەکو پەیامبەرمان دەفەرموێت: «**عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلاَّ لِلْمُؤْمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ، صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ**».

«کاروبارەکانی باوەڕداران زۆر سەرسووڕهێنەرن، چونکە لە هەموو کاروبارەکانیاندا خێر و چاکە هەیە. ئەمەیش تەنها بۆ باوەڕدارانە. کاتێک شتێکی خۆش ڕوودەدات بۆیان، سوپاسگوزارن و خێری تێدایە بۆیان. کاتێک شتێکی ناخۆش ڕوودەدات بۆیان، بەرگە دەگرێت و سەبر و ئارامی دەبێت و خێری تێدایە بۆیان.» (رواه مسلم).

کەواتە دڵی ئەم جۆرە باوەڕدارە جۆرێکە لە بەهەشت. ئەوە

بەهەشتە کە ابن التیمیە (خودا لێی ڕازی بێت و لێی خۆش بێت)، قسەی لە بارەوە کردووە و فەرموویەتی: «إن في الدنيا جنة من لم يدخلها لا يدخل جنة الآخرة.»

«بەڕاستی بەهەشتێک لەم دونیایەدا بوونی هەیە، هەر کەسێک نەچێتە ناویەوە، ناچێتە ناو بەهەشتی دونیای ئاخیرەتەوە.» لەو بەهەشتەدا ئاشتی و ئارامی شتێکی کاتی و بڕاوە نییە، بەڵکوو هەمیشەیی و هەتاهەتاییە.



# زەریای دونیا

دوێنێ ڕۆیشتم بۆ کەناری زەریاکە. کاتێک دانیشتبووم و تەماشای شەپۆلە گەورەکانی کالیفۆرنیام دەکرد، هەستم بە شتێکی نامۆ کرد. زەریاکە زۆر قەشەنگ و جوانە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا بکوژ و لەناوبەرە. هەمان شەپۆلی سەرنجڕاکێش کە بە شتێکی بەهاداری دەزانین لە کەناری زەریاکەوە، دەتوانێت بمانکوژێت، ئەگەر بچینە ناویەوە. ئاو کە نیعمەتێکی زۆر گرنگە و سەرچاوەی ژیانە، دەکرێت کۆتایی بە ژیانیش بهێنێت. هەمان زەریا کە کەشتیەکان هەڵدەگرێت و دەیانگوازێتەوە، دەتوانێت ئەو کەشتیانە پارچە پارچە بکات.

ژیانی ئەم دونیایەیش هاوشێوەی زەریاکەیە، دڵەکانمان وەک کەشتی وان. دەتوانین زەریاکە بەکار بهێنین بۆ پێویستییەکانی خۆمان و وەک هۆکارێک بۆ گەیشتن بە ئامانجی کۆتاییمان. بیرت بێت زەریاکە تەنها هۆکارە. هۆکارێکە بۆ پەیداکردنی خۆراکی دەریاکە. هۆکارێکە بۆ گەشتکردن. هۆکارێکە بۆ گەڕان بە دوای ئامانج و مەبەستێکی باڵاتردا. شتێکە کە تەنها پێیدا تێدەپەڕین و هەرگیز بیر مەکەوە لەوەی تێیدا بمێنییتەوە. بیهێنە پێش چاوت چی دەبێت ئەگەر زەریاکە ئامانجی ئێمە بێت، نەک تەنها هۆکارێک بێت. لە کۆتاییدا نغرۆ دەبین.

هەتاکو ئاوی زەریاکە لە دەرەوەی کەشتییەکەدا بمێنێتەوە، کەشتییەکە سەرئاو دەکەوێت و لەژێر جڵەودا دەبێت. چی ڕوودەدات کاتێک ئاوەکە دەچێتە ناو کەشتییەکەوە؟ چی ڕوودەدات کاتێک دونیا تەنها ئاوێک نییە لە دەرەوەی دڵەکانماندا، کاتێک دونیا تەنها وەکو هۆکارێک نامێنێتەوە؟ چی ڕوودەدات کاتێک دونیا دەچێتە نێو دڵەکانمانەوە؟ ئەو کاتە کەشتیەکە نغرۆ دەبێت. ئەو کاتە دڵ بە بارمتە دەگیرێت و دەبێتە بەندە.

ئەو کاتە دونیا کە پێشتر لە ژێر دەستماندا بووە، دەستمان بە سەردا دەگرێت. کاتێک ئاوی زەریاکە دەچێتە نێو کەشتییەک و دەستی بەسەردا دەگرێت، ئەو کەشتییە چیدی خاوەن دەسەلات نییە. کەشتییەکە دەکەوێتە ژێر ڕەحم و بەزەیی زەریاکەوە. بۆ ئەوەی لەسەر ئاو بمێنینەوە، پێویستە بە هەمان شێوە سەیری ئەم دونیایە بکەین کە پەروەردگاری مەزن پێمان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ۝١٩٠﴾ (سورەتی ال عمران).

«بەڕاستی لە ئافراندنی ئاسمانەکان و زەویدا و هاتنی شەو و ڕۆژدا نیشانە و بەڵگەی زۆر هەن بۆ کەسانی ژیر و هۆشمەند».

ئێمە لەم دونیایەدا دەژین، ئەم دونیایە بۆ سوود و بەکارهێنانی ئێمە دروست کراوە. خۆبەدوورگرتن لە دونیا مانای ئەوە نییە کە هیچ پەیوەندییەکمان نەبێت بەم دونیایەوە. بەڵکوو پەیامبەرمان فێری کردووین وەک ئەنەس دەگێڕێتەوە: (جَاءَ ثَلَاثَةُ رَجلٍ إِلَىَ بيُوت أَزْوَاجِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا اخبروا كَأَنَّهُمْ تقالوها فَقَالُوا وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ قَالَ أحدهم اما أنا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أبدا وَقَالَ آخر أنا أصوم

الدَّهْـر وَلَا أفطـر وَقَـالَ آخـر أَنَـا أَعْتَـزِلُ النِّسَـاءَ فَـلَا أَتَـزَوَّجُ أَبَـدًا فَجَـاءَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ إِلَيْهِـمْ فَقَـالَ: «أَنْتُـمُ الَّذِيـنَ قُلْتُـمْ كَـذَا وَكَـذَا أَمَـا وَاللَّـهِ إِنِّي لَأَخْشَـاكُمْ لِلَّـهِ وَأَتْقَاكُـمْ لَـهُ لَكِنِّـي أَصُـومُ وَأُفْطِـرُ وَأُصَـلِّي وَأَرْقُـدُ وَأَتَـزَوَّجُ النِّسَـاءَ فَمَـنْ رَغِـبَ عَـنْ سُـنَّتِي فَلَيْـسَ مِنـي».

«سێ کـەس هـاتـن بـۆ مـاڵـی خێزانەکانـی پەیامبـەری خۆشەویست بۆ پرسـیارکردن لەبـارەی شـێوازی پەرستشـی پەیامبـەر. کاتێک پێیان وتـرا و ئەوانیش ئـەو پەرستشـەیان بـە لاوە کـەم بـوو، وتیان: ئێمـە لـە کوێـی پەیامبەرەوەین کـە لـە ڕابردوو و داهاتووی بەخشـراوە؟ یەکێک لـەوان وتـی: ئیتـر هەمـوو شـەوێک تاکـو بەیانـی شـەونوێژ دەکـەم. یەکێکـی تریـان وتـی: بـە بەردەوامـی بـەڕۆژوو دەبـم و ڕۆژووەکـەم ناشـکێنم. و سـێیەمیان وتـی: لـە ئافرەتـان خـۆم بـەدوور دەگـرم و هەرگیـز هاوسـەرگیری ناکـەم، پەیامبـەر هـات بـۆ لایـان و فەرمـووی: «ئایا ئێوە ئـەو کەسـانەن کـە واتـان وتـووە؟ سـوێند بـە پەروەرێنم لـە هەمووتـان زیاتـر لـە پـەروەردگار دەترسـم، بـەڵام بـەڕۆژوو دەبـم و ڕۆژوویش دەشـکێنم، نوێژ دەکـەم و دەخـەوم، هاوسـەرگیریش دەکەم. لـە مـن نییـە ئـەو کەسـەی لـە سـوننەتی مـن لابـدات» (متفـق علیـه).

پەیامبـەر لـەم دونیایـە نەکشـاوەتەوە و دەسـتبەرداری نەبـووە تاکـو لێـی دابـبڕێت. دابڕانـی پەیامبـەر زۆر قووڵتـر و ماناداتـر بـووە. دابڕانی بریتی بـووە لـە دابڕانـی دڵ. زۆرترین پەیوەسـتبوونی بـە پـەروەردگاری مەزنـەوە بـووە، چونکـە بەڕاسـتی لـە وتەکانـی پەروەردگاری باڵادەست تێگەیشتبوو. ﴿ وَمَـا هَـٰذِهِ ٱلْحَيَـوٰةُ ٱلدُّنْيَـآ إِلَّا لَهْـوٌ وَلَعِـبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْـءَاخِـرَةَ لَـهِىَ ٱلْحَيَـوَانُ ۚ لَـوْ كَانُـوا۟ يَعْلَمُـونَ ٦٤﴾ (سـورەتی العنکبـوت).

«ژیانـی ئـەم دونیایـە چییـە جگـە لـە ڕابـواردن و کەیفخۆشـی؟ بەڕاسـتی ژیانـی ئـەو دونیـا و ژیانـی نـاو بەهەشـت ژیانـی حەقیقـی و

ڕاستەقینەیە (شایستەی ئەوەیە ئادەمیزاد هەوڵی بۆ بدات)، ئەگەر بیانزانیایە و تێبگەیشتنایە».

خۆبەدوورگرتن و دابڕان مانای ئەوە نییە کە ناتوانین هیچ شتێکمان هەبێت لەم دونیایەدا، بەڵکوو زۆرێک لە سەحابە و هاوەڵانی پەیامبەر دەوڵەمەند بوون. دابڕان و خۆدوورگرتن بریتییە لە تەماشاکردن و تێڕامان لە دونیا بەو شێوەیەی کە هەیە: تەنها وەکو هۆکارێک. دابڕان بریتییە لەوەی دونیا لەناو دەستەکانمان دابنێین نەک دڵەکانمان. حەزرەتی عەلی بە جوانی ئەم مەبەستەی دەربڕیوە «ليس الزهد ألا تملك شيئا، و لكن الزهد ألا يملكك شيء» «زوهد و دابڕان لە دونیا بریتی نییە لەوەی خاوەنی هیچ نەبێت، بەڵکوو بریتییە لەوەی هیچ شتێک خاوەنت نەبێت.»

هاوشێوەی چوونە ناوەوەی ئاوی زەریاکە بۆ ناو کەشتییەکە، ئەو ساتەی ڕێگە دەدەین دونیا بچێتە دڵەکانمانەوە، نغرۆ دەبین. نابێت ئاوی زەریاکە بچێتە کەشتییەکەوە، بەڵکوو تەنها وەکو هۆکارێکە کە پێویستە لە دەرەوەی کەشتییەکەدا بمێنێتەوە. هەروەها نابێت دونیا بچێتە ناو دڵەکانمانەوە و داگیری بکات، بەڵکوو تەنها هۆکارێکە کە نابێت هەرگیز دەستمان بە سەردا بگرێت و داگیرمان بکات. بۆیە پەروەردگاری باڵا چەندین جار لە قورئانی پیرۆزدا ئەم دونیایە بە (المتاع) ناو دەبات. وشەی (المتاع) واتا (سەرچاوەی خۆشییە کاتییەکانی ئەم دونیایە). سەرچاوەیەک و ئامرازێک و ڕێگایەکە نەوەک ئامانج.

ئەم چەمکە پەیامبەر زۆر بە جوانی ئاماژەی پێ داوە کاتێک فەرمووی: «مَا لِي وَلِلدُّنْيَا؟ وَمَا أَنَا وَالدُّنْيَا إِلَّا كَرَاكِبٍ اسْتَظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا». «چی پەیوەندییەکم بەم دونیایەوە هەیە؟

نموونـەی مـن و دونیـا وەک گەشـتیارێک وایـە کـە لەژێـر سـێبەری درەختێکدا بۆ ماوەیەکی کەموکورت دەوەسـتێت و دوای پشـوودانێکی کاتـی دەسـت بـە گەشـتەکەی دەکات و درەختەکـە بەجـێ دەهێڵێت.»، (رَوَاهُ أَحْمَـدُ وَالتِرْمِـذِيُّ وَابْـن مَاجَـه).

بـۆ سـاتێک تەماشـای ئـەم خواسـتنەی ئـەم گەشـتیارە بکـە، چـی ڕوودەدات کاتێـک گەشـت دەکەیـت، یاخـود دەزانیـت مانەوەکـەت کاتییە؟ کاتێک شـەوێک بەنێو شـارێکدا تێدەپەڕیت، تـا چەند هۆگر و وابەسـتەی ئـەو شـارە دەبیت ئەگـەر بزانیـت کاتییـە؟ ڕەنگـە ئـارەزوو بکەیـت لـە مۆتێلێکـی شـەش ئەسـتێرەدا بمێنیتـەوە.

ئایـا حـەز دەکەیـت لەوێـدا بژیـت؟ بێگومـان نەخێـر. وایدابنـێ بەڕێوەبـەری کارەکـەت دەتنێرێت بۆ شـارۆچکەیەکی نـوێ بۆ کارکردن لەسـەر پرۆژەیەکی سنووردار و کاتی. وایدابنێ پێی نەوتوی پرۆژەکە کـەی بـە کۆتـا دێت، بـەڵام دەزانیت کـە دەبێت بگەڕێیتـەوە بـۆ ماڵـەوە جـا هـەر کات و سـاتێک بێت. چـۆن دەبیـت لـەو شـارۆچکەیەدا؟ ئایـا بـڕە پارەیەکـی زۆر لـە وەبەرهێنانـدا خـەرج دەکەیـت، یاخـود هەمـوو پارەکانـت لـە کڕینـی کەلوپـەل و ئۆتۆمبیلـی تـازەدا خـەرج دەکەیـت؟ بـێ گومـان نەخێر. ئایا لـە کاتـی بازاڕکردنیشـدا خواردنـی زۆر و زوو لەناوچوو دەکڕیت؟ نەخێر. ڕەنگـە دوودڵ بیت لـە کڕینـی هـەر شـتێک کـە بەشـی دوو ڕۆژ زیاتـر بـکات، چونکـە ڕەنگـە بەڕێوەبەرەکـەت ڕۆژێـک بانگت بکاتـەوە و بتگەڕێنێتـەوە.

ئەمـە بیرکردنـەوەی گەشـتیارێکە. ئەمـە دابڕانـی سروشـتییە کاتێـک تێدەگەیـت شـتێک کاتییـە. هـەر ئەمەیـە پەیامبەرمـان لـەم فەرمـوودە شـیرین و بەپێزەدا لەبارەیـەوە دەدوێت. ئـەو لە مەترسـی سـەرقاڵبوون بەم ژیانەوە تێگەیشـتبوو. لە ڕاسـتیدا ئەو لە هیچ شـتێکی تر نەدەترسـا زیاتـر لـە سـەرقاڵبوونمان بـەم ژیانـەوە. پەیامبـەر فەرمـووی: «فَوَاللَّـهِ

لا الفَقْرُ أَخْشَى عَلَيْكُمْ، وَلَكِنْ أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ عَلَيْكُمُ الدُّنْيَا كَمَا بُسِطَتْ عَلَى مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا، وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ».

«سوێند بە پەروەرێن لە هەژاربوونتان ناترسم، بەڵکوو دەترسم شتەکانی ئەم دونیایە زۆربن لە بەردەستاندا هاوشێوەی ئەوانەی پێش خۆتان، بۆیە پێشبڕکێی بۆ بکەن، وەک چۆن ئەوان پێشبڕکێیان بۆی دەکرد، ئینجا تێکتان بشکێنێت و لەناوتان ببات هەروەک چۆن ئەوانەی پێش ئێوەیشی لەناو برد» (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ).

پەیامبەری نازدار سروشتی ڕاستەقینەی ئەم دونیایەی زانیوە و درکی پێ کردووە. تێگەیشتبوو لەوەی مانای چییە کاتێک لەم دونیایەدا دەبیت، بەڵام پێوەی سەرقاڵ نابیت. پەیامبەرمان بە هەمان زەریادا گەشتی کردووە کە دەبێت پێیدا گەشت بکەین، بەڵام بۆ کەشتییەکەی باش زانیویەتی لەکوێوە هاتووە و بۆ کوێ دەڕوات. کەشتییەکەی کەشتییەک بوو کە بە وشکی مایەوە. تێگەیشتبوو لەوەی هەمان ئەو زەریایەی کە لەژێر تیشکی خۆردا دەبریسکێتەوە، دەبێتە گۆڕستانی ئەو کەشتیانەی کە تێیدەچن.



# دڵت بێنەوە

کەس ئارەزووی شکست ناکات. کەم کەس حەز دەکەن نغرۆ ببن، بەڵام لە کاتی ململانێ لەنێو زەریای ئەم ژینەدا، هەندێک جار ئەستەم دەبێت نەهێڵیت ئەم دونیایە بچێتە نێو دڵتەوە، هەندێک جار زەریاکە دێتە ناوەوە. دونیا خۆی دەخزێنێتە نێو دڵەکانمان.

هاوشێوەی ئاوی زەریاکە کە کەشتییەکە تێکدەشکێنێت، کاتێک دونیا دەچێتە نێو دڵەکانمانەوە، دڵەکانمان پارچە پارچە دەکات. کەشتییەکە تێکدەشکێنێت. بیرم کردەوە لە شێوەی کەشتی تێکشکاو و ئەوەی بە سەرماندا دێت کاتێک دەهێڵین هەموو شتەکانی ئەم دونیایە بچنە نێو دڵەکانمانەوە. کەسێکم بینی هاوشێوەی خۆم زۆر کەوتبووە داوی خۆشەویستی ئەم ژیانەوە و دەیویست لێی تێر ببێت، بۆیە زەریای ئەم دونیایە کەشتییەکەی تێکشکاند وەک چۆن کەشتییەکەی منی تێکشکاندبوو و کەوتبووە نێو ئاوەکەوە، بەڵام ئەو زۆر لە ناو ئاوەکەدا مایەوە و نەیدەزانی چۆن بێتە دەرەوە و دەست بە چییەوە بگرێت، بۆیە نقوم بوو.

ئەگەر بهێڵیت دونیا دڵت داگیر بکات وەک چۆن زەریا کەشتییەکان داگیردەکات، ئەوا تەواو دەستت بەسەردا دەگرێت. بە رادەیەک

نقومی قووڵایی زەریاکە دەبیت کە دەستت لە بنی زەریاکە دەدەیت. هەست دەکەیت کە لە زەلیلترین و نزمترین بارودۆخدایت. هەست بە دڵشکاوی دەکەیت و هەست دەکەیت بە تاریکایی دەورە دراویت کاتێک دەکەویتە داوی تاوانەکانت و خۆشەویستی ئەم ژیانەوە. هیچ ڕووناکییەک ناگاتە بنکی زەریاکەوە.

هەرچەندە ئەم تاریکاییە کۆتاییەکە نییە. لە بیرت بێت تاریکایی شەو پێش ڕووناکی بەری بەیان دێت. هەتاکو دڵت لێبدات، ئەوە کۆتایی و مەرگی دڵت نییە. نابێت لێرەدا بمریت. هەندێک جار بنکی زەریاکە تەنها پشوویەکە لە کاتی گەشتەکەتدا. کاتێک لەو شوێنە نزمەدایت، دوو بژاردەت لە بەردەستدایە. دەتوانیت لەوێدا بمێنیتەوە تاکو دەخنکێیت و تیادەچیت، یاخود مرواری کۆ دەکەیتەوە و دووبارە هەڵدەسیتەوە و بەهێزتر دەبیت بەهۆی مەلەوانییەکەوە دەوڵەمەندتر دەبیت بەهۆی گەوهەرەکەوە.

ئەگەر بە دوای پەروەردگاری گەردووندا بگەڕێیت و داوای یارمەتی لێ بکەیت، دەتوانێت هەڵتبسێنێتەوە و تاریکایی زەریاکە بگۆڕێت بە ڕووناکی خۆر. دەتوانێت لاوازترین خاڵت بگۆڕێت بۆ بەهێزترین خاڵ و هۆکاری گەشەسەندن و پاکبوونەوە و ڕزگاربوونت. بیرت بێت هەندێک جار گۆڕانکاری لە شکستەوە دەست پێ دەکات. بۆیە هەرگیز نەفرەت لە شکستەکان مەکە. زەوی ئەو شوێنەیە کە بە سادەیی تێیدا دەژی. بەدەستی بهێنە و فێر ببە و هەناسەی تێدا بدە. پاشان بە بەهێزی و بێفیز و وریاتر بگەڕێرەوە. هەمیشە پێویستیت بە پەروەردگارە.

بگەڕێوە کاتێک بێدەسەڵاتی و بچووکی خۆت و گەورەیی و بەدەسەڵاتی پەروەرێنت بۆ دەردەکەوێت. بزانە ئەگەر ئەو ڕاستییەت هەست پێ کردبێت، ئەوا زۆر شتت هەست پێ کردووە. ئەو کەسەی

بەڕاستی فریو دراوە کەسێکە کە تەنها خودی خۆی دەبینێت نەک پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات. دابڕاو کەسێکە کە هەرگیز هەستی بەوە نەکردووە کە چەندە پێویستی بە پەروەردگارە. بەهۆی پشتبەستن بە هۆکارەکانی خۆیەوە، لە یادی کردووە کە هۆکارەکان و ڕۆحی خۆی و هەموو شتێکی ئەم بوونە دروستکراوی پەروەرێنی خاوەن دەسەڵاتن.

بە دوای پەروەردگاردا بگەڕێ و داوای یارمەتی لێ بکە تاکو بتگەڕێنێتەوە، کاتێک دەتگەڕێنێتەوە، کەشتییەکەت نۆژەن دەکاتەوە. ئەو دڵەی هەستت کرد بۆ هەمیشە شکاو دەبێت جارێکی تر چاک دەکرێتەوە. ئەوەی تێکشکابوو جارێکی تر چاک دەبێتەوە. بزانە تەنها پەروەردگار دەتوانێت ئەو کارە ئەنجام بدات. بە دوای پەروەردگاردا بگەڕێ. کاتێک پەروەردگار ڕزگارت دەکات، داوای لێخۆشبوون بکە بۆ شکستەکە و هەست بە پەشیمانی بکە، بەڵام نائومێد مەبە.

وەک ابن القیم فەرموویەتی: «شەیتان کەیفخۆش بوو کاتێک حەزرەتی ئادەم لە بەهەشت دەرکرا، بەڵام نەیزانی کاتێک مەلەوانێک دەچێتە قووڵایی دەریاکەوە مرواری کۆ دەکاتەوە و جارێکی تر سەردەکەوێتەوە سەر ئاو.»

شتێکی زۆر بەپێز و سەرنجڕاکێش هەیە لەبارەی تەوبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاری باڵادەست. پێمان وتراوە تەوبەکردن پاککردنەوەی دڵە. ئەوەی جێی سەرسامییە لەبارەی پاککردنەوەوە ئەوەیە نەک تەنها پاکی دەکاتەوە، بەڵکوو ئەو شتە لە جاری پێشووی زێدەتر درەوشاوەتر دەکات. بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگار و داوای لێخۆشبوون بکە و دڵ و ژیانت بە ئەوەوە پەیوەست بکە. توانات دەبێت دەوڵەمەندتر دەبیت وەک ئەوەی هەرگیز تووشی شکست نەبوویت. هەندێک جار شکست و هەڵسانەوە ژیری و

بێفیزیت پێ دەبەخشن کە ڕەنگە بێ شکستەکە بەدەستت نەهێنایە.

ابن القیم نووسیویەتی: «قد یعمل العبد الذنب فیدخل به الجنة، ویعمل الطاعة فیدخل بها النار قالوا: وکیف ذلك قال: یعمل الذنب فلا یزال نُصب عینیه، إن قام وإن قعد وإن مشی، ذکر ذنبه، فیحدث له انکساراً وتوبة، واستغفاراً، وندما، فیکون ذلك سبب نجاته، ویعمل الحسنة فلا تزال نُصب عینیه، إن قام، وإن قعد، وإن مشی، کلما ذکرها أورثته عُجبا، وکِبرا، ومِنَّةً، فتکون سببَ هلاکه.»

«لەوەیە بەندەیەک تاوانێک ئەنجام بدات کە لە ڕێیەوە بچێتە ناو بەهەشتەوە، بەندەیەکی تر کارێکی خێر و چاکە دەکات و پێی دەچێتە دۆزەخەوە.... پرسیاری لێ کرا: ئەوە چۆن دەبێت؟ فەرمووی: ئەوەی تاوانەکە ئەنجام دەدات بەردەوام بیر لە تاوانەکە دەکاتەوە و ترسی لێ دەنیشێت و لێی پەشیمان دەبێتەوە، بە هۆیەوە گریان و ناڵەی دێت، هەست بە شەرمەزاری دەکات لە ئاستی پەروەردگاردا بەهۆی تاوانەکەیەوە. لە بەردەم پەروەردگاردا بە دڵێکی شکاو و سەرێکی نزم و شۆڕەوە دەوەستێت بەهۆی شەرمەزارییەوە. بۆیە ئەم تاوانە زۆر بەسوودترە بۆی لە ئەنجامدانی چەندین فەرمانی پەروەردگار، چونکە دەبێتە هۆی شەرمەزاری و خشوع، دەبێتە هۆی خۆشبەختی و سەرکەوتنی بەندەکە بە ڕادەیەک کە تاوانەکە دەبێتە هۆکارێک بۆ چوونە بەهەشت. هەروەها ئەو کەسەی کە کارە خێر و چاکەکەی ئەنجام داوە وا بیر دەکاتەوە کە بەهۆی چاکە و باشی خۆیەوەیەتی و بە ڕەحمێکی ئیلاهی نازانێت. بۆیە لەخۆبایی و سەرسام دەبێت بە خۆی و دەڵێت ئەمە و ئەوەم بەدەست هێناوە. بۆیە خۆبەزلزانی و شانازیکردن بە خۆی و لەخۆبایبوون تێیدا پەرە دەسێنێت کە دەبنە هۆی لەناوچوونی».

پـەروەردگار لـە قورئانـی پیرۆزدا بیرمـان دەهێنێتـەوە کـە هەرگیـز هیوا لەدەست نەدەین، دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُواْ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٥٣﴾ (سـورەتی الزمـر).

«ئـەی پەیامبـەر پێیـان بڵـێ: پـەروەردگار دەفەرموێـت ئـەی بەندەکانم, ئەوانـەی کـە زوڵـم و ستەمتان لـە خۆتـان کردووە بەهـۆی ئەنجامدانـی تاوانـی زۆرەوە، نەکـەن هەرگیـز لـە ڕەحـم و بەزەیـی پـەروەردگار نائومێد بن، بەڕاستی پەروەردگار لە هەموو تاوانـەکان خـۆش دەبێـت. پـەروەردگار هـەر خـۆی بەخشـندە و میهرەبانـە.»

ئەمەیش ئاگادارکردنەوەیەکە بۆ هەموو ئـەو کەسـانەی کە زوڵم و ستەم لـە خۆیـان دەکـەن و بوونەتـە بەنـدەی خۆیـان، خۆیان لـە زیندانی نەفس و ئارەزووەکانیاندا کۆت و بەند کردووە. ئاگادارکردنەوەیەکە بـۆ هەمـوو ئەوانـەی کـە کەوتوونەتـە زەریـای دونیـاوە و لـە قوڵایـی زەریاکـەدا نقـووم بوونـە و کەوتوونەتـە داوی شـەپۆلەکانیەوە. هەڵسـەوە! هەڵسـەوە بۆ نـاو هـەوا سـازگارەکە و جیهانـی ڕاسـتەقینەی سـەرەوەی زیندانـی زەریاکـە.

هەڵسـەوە و خـۆت ڕزگار بکـە. هەڵسـەوە و بگەڕێـوە بـۆ ژیـان. مەرگـی ڕۆحـت لـە دوای خۆتـەوە جێبهێڵـە. دڵـت هێشـتا زینـدووە و دەکرێت بەهێزتـر و پاکتـر بێت لـە پێشـووتر. ئایا تۆبەکردن دڵەکەتـی خاوێنتـر و جوانتـر نەکـردووە؟ ئـەو پەردەیـە لابـەرە کـە بەهـۆی تاوانەکانتـەوە دروسـتت کـردووە. پـەردەی نێـوان خـۆت و ژیـان، خـۆت و ڕزگاریـت، خـۆت و ڕووناکـی، خـۆت و پـەروەردگاری مـەزن. پەردەکە لابـەرە و جارێکـی تـر هەڵسـەوە. بگەڕێـوە بـۆ ماڵـەوە. بزانـە کاتێـک هەمـوو دەرگاکان بـە ڕووتـدا دادەخرێـن، دەرگایـەک هەیـە هەمیشـە ئاوەڵایـە بـۆت، بـە دوای ئـەو دەرگایـەدا بگـەڕێ، بـە دوای

پـەروەردگاردا بگـەڕێ، چونکـە هـەر خـۆی ڕێنماییـت دەکات کـە لـە شـەپۆلەکانی زەریـا دڕندەکـەدا ڕزگارت بێـت و شـادبیتەوە بـە ڕەحـم و بەزەیـی خـۆر.

ئـەم ژیانـە ناتوانێت تێکتبشـکێنێت و لەنـاوت بەرێت، مەگـەر خۆت ڕێگـەی بدەیـت. ئـەم ژیانـە ناتوانێت دەسـتت بەسـەردا بگرێت، مەگـەر خـۆت کلیلەکانـی دڵتـی ڕادەسـت بکەیـت. بۆیـە ئەگـەر ئـەو کلیلانـەت بـۆ سـاتێک ڕادەسـتی دونیـا کـردووە، وەریبگـرەوە. ئـەوە کۆتایـی دونیـا نییـە. نابێـت لێـرەدا بمریـت. دڵـت بێنـەوە و ڕادەسـتی خاوەنـی ڕاسـتەقینەی خـۆی بکـە، کـە پـەروەردگاری خـاوەن دەسـەڵاتە.

# خۆشەویستی

هەوڵ بدە هۆگربوون و خۆشەویستی تێکەڵ نەکەیت. هۆگربوون بریتییە لە ترس و پەیوەستبوون و زیاتر خۆشەویستی خود دەگرێتەوە نەک خۆشەویستی بەرامبەر. خۆشەویستی بێ هۆگربوون پاکترین جۆری خۆشەویستییە، چونکە پەیوەست نییە بەوەی کەسانی تر چیت پێ دەبەخشن لەبەر ئەوەی خاڵیت. پەیوەستە بەوەی دەتوانیت چی ببەخشیت بە بەرامبەر، چونکە خۆت لێوانلێویت.



## ڕزگاربوون لە خراپترین زیندان

کاتێک سارا چاوی بە ئەحمەد کەوت، هەستی کرد ئەحمەد هەموو ئەو شتە بووە کە بەردەوام خەوی پێوە بینیوە. بینینی ئەحمەد وەک تەماشاکردنی خۆرهەڵاتن وابوو لە ناوەڕاستی شەپۆلی بەفردا. گەرمییەکەی ئەحمەد، ساردییەکەی ژیانی سارای خامۆش کرد. دوای ماوەیەکی کەم ئەم پەسەندکردن و خۆشویستنە گۆڕدرا بۆ پەرستن. سارا دەرکی بەوە نەکرد کە بۆتە زیندانییەک. سارا بووە زیندانی ئارەزووەکانی و شێت و شەیدای ئەو شتە بوو کە عاشقی ببوو.

کاتێک تەماشای هەر لایەکی دەکرد جگە لە ئەحمەد هیچی تری نەدەبینی، گەورەترین ترسی سارا لە ژیاندا بریتی بوو لە خەمبارکردنی ئەحمەد، ئەحمەد هەموو شتێک بوو بە لای ساراوە. بە ڕادەیەک بەختەوەری و دڵخۆشی هیچ مانایەکی نەبوو بەبێ بوونی ئەحمەد. جێهێشتنی ئەحمەد وەک هەڵکەندن و دابڕینی ڕۆحی سارا وابوو لە هەموو شتەکان. ڕووخساری ئەحمەد تاکە شتێک بوو کە تەواوی دڵی سارای داگیر کردبوو، ئەحمەد لە هەموو شتێک نزیکتر بوو بۆی. ئەحمەد وەک خوێنی ناو خوێنهێنەرەکانی سارای لێ هاتبوو. بۆ ساتێکیش بەرگەی دووری ئەحمەدی نەدەگرت، چونکە بەبێ ئەحمەد

هیچ دڵخۆشییەک بوونی نەبوو. سارا هەستی کرد عاشق بووە.

سارا ناڕەحەتی و نەهامەتی زۆری لە ژیاندا چەشتبوو. باوکی جێیهێشتبوو کاتێک سارا کیژۆڵەیەکی بچووک بوو، کاتێک سارا تەمەنی بویە شانزە ساڵان لە ماڵ هەڵهات و کەوتە داوی دەرمانە بێهۆشکەرەکان و کحولەوە، تەنانەت کەوتە نێو زیندانەوە. لەگەڵ ئەوەیشدا ئەم هەموو ئازارە هاوشێوەی ئەو ئازارە نەبوو کە بە دەستەکانی خۆی بەسەر خۆیدا هێنابووی. سارا کۆتوبەندی هەوا و ئارەزووەکانی خۆی بوو. ابن التیمیە (خودا لێی ڕازی بێت)، لە بارەی ئەم کۆتوبەندەوە فەرموویەتی: «المحبوس من حبس قلبه عن ربه تعالى والمأسور من أسره هواه.»

«ئەو کەسەی کە بەڕاستی کۆتوبەندە، کەسێکە کە دڵی لە ڕووی پەروەردگاردا داخستووە و هەوا و ئارەزووەکانی کردوویانەتە بەندە.» (ابن القيم —الوابل الصيب من الكلم الطيب— لاپەڕە ٦٩).

ئازار و ناڕەحەتییەکانی پەرستنی ئەحمەد لە لایەن ساراوە زۆر زیاترە لە هەموو ئازار و ناڕەحەتییەکانی پێشووی. خۆشەویستییەکەی چەشتبوو، بەڵام تێری لێی نەخوارد. سارا بە نائومێدییەوە شوێن سەرابێک کەوتبوو هاوشێوەی پیاوێکی تینوو لە ناوەڕاستی بیابانێکدا. خراپترین شت ڕوویدا لە ئەنجامی دانانی شتێکی تر لە شوێنێکدا کە پێویستە تەنها پەروەردگاری تێدا بێت.

چیرۆکی سارا زۆر قووڵە و ماناداره، چونکە باس لە حەقیقەتێکی گرنگی ئەم ژیانە دەکات. ئێمەی مرۆڤ فیترەتێکی تایبەتمان هەیە، ئەو فیترەتە بریتییە لە هەستکردن بە یەکتایی پەروەردگار و پەیڕەوکردنی ئەم حەقیقەتە لە ژیانماندا. بۆیە هیچ بەڵا و لەدەستدان و شتێک نییە بە ئازارتر بێت لە بە هاوتادانانی شتێک بۆ پەروەردگار لە ژیان و دڵەکانماندا. هاوبەشی بڕیاردان، (شیرک) بۆ پەروەردگار لە هەر ئاستێکدا بێت ڕۆحی

مرۆڤ تێکدەشکێنێت، هیچ تراژیدیایەکی تری ئەم دونیایە هاوشێوەی شیرک سەخت و بەئازار نییە، ئەگەر ڕۆح شتێکی تری خۆش بوویت، یاخود ملکەچی ببێت لە کاتێکدا دەبێت تەنها پەروەردگارمان خۆش بوێت و ملکەچی ببین، ئەوا ڕۆحت دەخزێنێتە ئاستێکەوە کە بە هیچ شێوەیەک نابێت لەو ئاستەدا بێت. بۆ بینینی ئەم حەقیقەتە تەنها تەماشا بکە چی بەسەر کەسێکدا دێت کاتێک ئەو شتەی کە دەیپەرستن لەدەستی دەدەن. لە بەرواری (٢٢/ تەمموزی/٢٠١٠)دا، (ذە تایمز ئۆڤ ئینديا)، ڕایگەیاند ژنێکی تەمەن چل ساڵان لە ماڵەکەیدا خۆی کوشتووە، بەنزینی بە خۆیدا کردووە و خۆی سووتاندوە. پۆلیس ڕایگەیاند ئافرەتەکە خۆی کوشتووە، چونکە منداڵی نەدەبوو دوای هاوسەرگیریکردنی بۆ ماوەی نۆزدە ساڵ. چەند ڕۆژێک پێش ئەم ڕووداوە لە بەرواری (١٦/ تەمموزی/٢٠١٠)دا، پۆلیس ڕایگەیاند پیاوێکی تەمەن بیستودوو ساڵان خۆی کوشتووە دوای ئەوەی خۆشەویستەکەی جێیهێشتووە.

ڕەنگە زۆر کەس بەزەییان بەم جۆرە کەسانەدا بێتەوە، ڕەنگە زۆرێک دڵشکاو بن لەم حاڵەتەدا. ئەگەر بوونی منداڵێک، یاخود کەسێکی تایبەت لە ژیانماندا تاکە هۆکاری بوونمان بێت، ئەوە هەڵەیەکی گەورەیە. ئەگەر شتێکی کاتی و لەناوچوو ببێتە بنچینەی ژیانمان و هۆکاری بوونمان، ئەوا بە دڵنیاییەوە تێدا دەچین و دڵشکاو دەبین. ئەو شتە ناکامڵانەی دەیکەینە بنچینەی بوونمان لەناو دەچن و نائومێدمان دەکەن، یاخود دەمرن.

لەناوچوون و دڵشکانمان ڕوودەدات بە لەناوچوون و لەدەستچوونیان. چی ڕوودەدات ئەگەر لە کاتی سەرکەوتن بەسەر شاخێکدا خۆت بە لقەدارێکەوە بگریت تاکو ڕاتبگرێت؟ یاسای فیزیا پێمان دەڵێت ئەو لقەدارە بۆ ئەوە دروست نەبووە ئەو قورساییە ڕابگرێت، بۆیە دەشکێت. هەروەها یاسای ڕاکێشانی زەوی پێمان دەڵێت دوای شکانی لقەدارەکە، بە دڵنیاییەوە دەکەویت و بەردەبیتەوە، ئەمە شتێکی تیۆری نییە، بەڵکوو

حەقیقەتێکی جیهانی فیزیایە.

ئەم حەقیقەتەیش لە جیهانی ڕۆحیدا بوونی هەیە، پەروەردگار لەمبارەیەوە لە قورئانی پیرۆزدا پێمان دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَٱسْتَمِعُوا۟ لَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخْلُقُوا۟ ذُبَابًا وَلَوِ ٱجْتَمَعُوا۟ لَهُۥ ۖ وَإِن يَسْلُبْهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيْـًٔا لَّا يَسْتَنقِذُوهُ مِنْهُ ۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴿٧٣﴾﴾ (سورەتی الحج).

«ئەی خەڵکینە نموونەیەک هێنراوەتەوە جوان گوێی بۆ بگرن: بەڕاستی ئەوانەی کە هانا و هاواریان لێدەکەن لەجیاتی پەروەردگار هەرگیز ناتوانن تاکە مێشێک دروست بکەن، هەرچەندە بۆ ئەو کارە کۆ ببنەوە، یاخود ئەگەر مێشێک شتێکیان لێ بفڕێنێت، ناتوانن لێی بسەننەوە. داواکار و داوالێکراو هەردووکیان لاواز و بێدەسەڵاتن».

پەیامی ئەم ئایەتە زۆر قووڵ و پڕ مانایە. هەر کاتێک شوێن شتێکی لاواز بکەویت و پشتی پێ ببەستیت (هەموو شتێک جگە لە پەروەردگار)، ئەوا تۆیش لاواز دەبیت. تەنانەت ئەگەر بەو شتە بگەیت کە ویستوتە ئەوا کافی و بەس نییە. دوای ماوەیەکی کەم بەشوێن شتێکی تردا دەگەڕێیت. هەرگیز بە ڕاستی تێر و ڕازی نابیت. بۆیە لەم ژیانەدا دەژین کە پڕە لە کاری مەمەڵەکردن و ئاڵوگۆڕکردن. تەلەفون و ئۆتۆمبیل و کۆمپیتەر و ژن و پیاوەکەت هەمیشە بە دانەیەکی باشتر و تازەتر دەگۆڕیتەوە.

لەگەڵ ئەوەیشدا دەتوانیت لەو بەندایەتییە ڕزگار بیت. کاتێک ئەو شتەی هەموو قورسایی خۆتت خستۆتە سەر نەلەرزاو و نەشکاو و هەمیشەیی بێت، ئەوا ناکەویت و ناشکێیت. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئەم حەقیقەتە بەم شێوەیە بەیان دەکات: ﴿لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّـٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾﴾ (سورەتی البقرە).

«هیچ زۆرلێکردن و ناچارکردنێک لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا نییە، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاک و دروست ڕوون و ئاشکرا بووە و جیا بۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە تاغوت (ڕێگە و ڕێبازی لادان) و باوەڕی دامەزراو بێت بە پەروەردگار، بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگاربییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە کە هیچ هەڵوەشانەوە و لەناوچوونێکی بۆ نییە، پەروەردگاری مەزن بیسەر و زانایە.»

بەهێز دەبیت کاتێک دەست بە شتێکی بەهێزەوە دەگریت، لەگەڵ ئەو هێزەدا ڕزگاریی ڕاستەقینە بەدەست دەهێنیت. ئەو ڕزگارییە کە ابن التیمیە، (ڕەحمەتی خوای لێبێت)، باسی کردووە: «ما يصنع أعدائي بي، أنا جنتي في قلبي،وبستاني في صدري، أين رحت فهي معي لا تفارقني، أنا حبسي خلوة، وقتلي شهادة، وإخراجي من بلدي سياحة.»

«دوژمنەکانم دەتوانن چیم بەرامبەر بکەن؟ لە سینەمدا بەهەشت و باخ هەیە. ئەگەر گەشت بکەم، لەگەڵمدان و هەرگیز جێمناهێڵن. زیندانی بۆ من دەرفەتێکە تاکو تەنها بم لەگەڵ پەروەردگاری خۆمدا. ئەگەر بکوژرێم شەهیدم و ئەگەر دوور بخرێمەوە لە نیشتمانەکەم ئەوا گەشتێکی ڕۆحی ئەنجام دەدەم.» (ابن القیم –الوابل الصیب من الکلم الطیب - لاپەڕە ٦٩).

ئیبن التیمیە باسی ڕزگاربوون لە زیندانی ئەم دونیایە دەکات بە پەرستنی ئەو شتەی کە بێخەوش و بێ کۆتایە. باسی ئەو باوەڕدارە دەکات کە دڵی ئازادە. دڵێک کە ئازادە لە کۆتوبەندی ئەم ژیانە و ئەو شتانەی تێیدایە.

دڵێک کە تێدەگات تەنها یەک تراژیدیای ڕاستەقینە هەیە کە لەدەستدانی یەکتاپەرستییە، (التوحید- شەریعەتی یەکتایی خودا)، تاکە بەڵای سەخت بریتییە لە پەرستنی هەر کەس و شتێکی تر جگە لە پەروەردگاری

گەورە کە شایستەی پەرستنە. دڵێک کە تێدەگات تاکە زیندانی حەقیقی بریتییە لە زیندانی دانانی شتێکی تر لە جێی پەروەردگار. جا ئایا ئەو شتە نەفس، هەوا و ئارەزوو، سامان، پیشە، هاوسەر، منداڵ، یاخود خۆشویستنی ژیان بێت، .ئەو خوداوەندە هەڵەیە کۆت و بەندت دەکات ئەگەر بیکەیتە ئامانج و مەبەستی کۆتاییت. ئازاری ئەو کۆت و بەندە قووڵتر و سەختتر و درێژخایەنتر دەبێت لە هەر ئازارێکی تر کە بەهۆی تراژیدیاکانی تری ژیانەوە دروست دەبێت.

ئەزموونی پەیامبەر یونس زۆر گرنگە تاکو چاوی لێ بکرێت، کاتێک کەوتە ناو سکی نەهەنگەکەوە، تەنها یەک ڕێگای ڕزگاربوونی هەبوو: گەڕانەوەی تەواوەتی بۆ لای خودای گەورە و هەستکردن بە تاکی خودا و لاوازیی مرۆڤ. نزاکەی پەیامبەر یونس بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش ئەم حەقیقەتە ئاماژە پێ دەدات: ﴿أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٨٧﴾ (سورەتی الانبیاء).

«هیچ خودایەک بوونی نییە جگە لە تۆ یا الله، گەورەیی هەر بۆ تۆیە، من لە هەڵەکاران و تاوانباران بووم.»

زۆرێک لە ئێمە کەوتووینەتە داوی سکی نەهەنگی پەرستنی هەوا و ئارەزووەکانمان و شتەکانی تری ئەم ژیانەوە. بووینەتە بەندەی نەفسی خۆمان. ئەو زیندانییە لە ئەنجامی دانانی هەر شتێکی ترەوەیە جگە لە پەروەردگار لەناو دڵەکانماندا. بە ئەنجامدانی ئەم کارە خراپترین و پڕئازارترین زیندان دروست دەکەین بۆ خۆمان، چونکە زیندانی دونیایی تەنها دەتوانێت ئەو شتە کاتی و پڕ کەموکوڕیانە بباتەوە، بەڵام زیندانی ڕۆحی دەتوانێت ئەو شتە بباتەوە کە هەمیشەیی و تەواو و بێ کەموکوڕییە کە بریتییە لە پەروەردگار و پەیوەندیمان بە پەروەردگارەوە.

## ئایا ئەمە خۆشەویستییە کە هەستی پێ دەکەم؟

ئەفلاتـوون دەڵێـت: «خۆشەویسـتی نەخۆشـییەکی ترسـناکی ئەقڵییـە»، ئـەوەی کەوتبێتـە داوی خۆشـەویستییەوە تاڕادەیـەک ڕاسـتی ئـەم وتـەیـەی بـۆ دەردەکـەوێت، بـەڵام هەڵەیەکی بەرچـاو لـەم وتەیـەدا هەیـە. خۆشەویسـتی نەخۆشـی ئەقڵـی نییـە، بەڵکـوو هـەوا و ئـارەزوو نەخۆشـی ئەقڵییـە.

ئەگـەر خۆشویسـتن مانـای ئـەوە بێـت ژیانمـان پارچـە پارچـە ببێـت و بـە تـەواوی دڵشـکاو و دڵتەنـگ و هۆگـر بیـن و بـە سـەختی بجووڵێیـن و هەمـوو شـتێک بکەینـە قوربانـی، ئـەوە خۆشەویسـتی نییـە. بـە پێچەوانـەی ئـەوەی فێـر کراویـن, خۆشەویسـتی ڕاسـتەقینە وەک ئالودەبوویەکی مـادە بێهۆشـکەرەکانمان لـێ نـاکات. ئـەوەی لەنێو فیلم و زنجیـرە فیلمەکانـدا دەیبینیـن ئالوودەبوونـە نـەک خۆشەویسـتی، بـەڵام ناوێکی تـری لـێ نـراوە. ئـەوە هـەوا و ئـارەزووە کـە لـە قورئانـدا ئامـاژەی پـێ دراوە واتـا (ئارەزوو و چێژی بێبەهـا و بێسـوود). خودای گـەورە وەک گومڕاتریـن و لاڕێترین کـەس وەسـفی ئەو کەسـانە دەکات کـە کوێرانـە شـوێنی ئـەم هـەوا و ئارەزووانـە دەکـەون ﴿فَـإِن لَّـمْ يَسْـتَجِيبُواْ لَـكَ فَٱعْلَـمْ أَنَّمَـا يَتَّبِعُـونَ أَهْوَآءَهُـمْۚ وَمَـنْ أَضَـلُّ مِمَّـنِ ٱتَّبَعَ

هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴿٥٠﴾ (سورەتی القصص).

«ئەگەر وەڵامیان نەدایتەوە و بەدەم بانگەوازەکەتەوە نەهاتن، ئەوا شوێنی هەوا و ئارەزووەکانیان دەکەون. کێ گومڕاترە لەو کەسەی کە شوێنی هەوا و ئارەزووەکانی خۆی دەکەوێت دوور لە هیدایەت و ڕێنمویی پەروەردگاری مەزن، بێگومان پەروەردگار هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.»

بە ملکەچبوونمان بۆ هەوا و ئارەزووەکانمان و فەرامۆشکردنی ڕێنماییەکانی خودای گەورە، بڕیارمان داوە هەوا و ئارەزووەکانمان بپەرستین. ئەگەر خۆشەویستیمان بۆ ئەو شتەی ئارەزووی دەکەین زیاتر و بەهێزتر بێت لە خۆشەویستیمان بۆ پەروەردگار، ئەو شتەی ئارەزووی دەکەین بە پەروەردگارمان دادەنێین. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِۗ ﴿١٦٥﴾﴾ (سورەتی البقرە).

«هێشتا کەسانێک هەن لەجیاتی ئەوەی پەروەردگار بپەرستن، شتانی تر دادەتاشن بۆ خۆیان (شوێن ڕێنموییەکانی پەروەردگار ناکەون) و خۆشەویستی و سۆزیان دەدەن بەو بت و بەرنامە و توولەڕێگایانە و خۆشیان دەوێن وەک چۆن پەروەردگاریان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمانیان هێناوە زۆر زیاتر پەروەردگاریان خۆش دەوێت».

ئەگەر خۆشویستنی شتێک وامان لێ بکات دەستبەرداری خێزان، شەرەف، ڕێز، جەستە، پیرۆزی، ئارامی، دین و تەنانەت پەروەرێنمان کە دروستی کردووین ببین، بزانە لە خۆشەویستیدا نین، بەڵکوو بەندەین.

پـەروەردگار بـەم شـێوەیە باسـی ئـەم جـۆرە کەسـانە دەکات:
﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ۝٢٣﴾ (سـورەتی الجاثیـە).

«هەواڵم بدەرێ ئایا چاوتـان بـەو کەسـانە کەوتـووە کـە حـەز و ئارەزووی خۆیان کردووە بـە خـودای خۆیـان؟ خودای گەورە باشیان دەناسێت و بە گومڕایی دەیانهێڵێتەوە و مۆری هێناوە بەسـەر گوێ و دڵیاندا و بـان چـاو و بیناییانی داپۆشـیوە. جـا کێ هەیـە ڕێنماییـان بـکات جگـە لـە خـودا؟ ئایـا بیر ناکەنـەوە و تێنافکرن.»

تەنها بیر لـەو نارەحەتییە بکەرەوە کاتێک بینایی و بیسـتن و دڵـی کەسێک مۆری لێ دەدرێت و دادەخرێت. هـەوا و ئارەزوو چێژ نییـە، بەڵکـوو زینـدانـە، کۆیلەبوونـی ئەقـڵ و جەسـتە و ڕۆحـە، ئالودەبـوون و پەرستنە. لـە ئەدەبدا نموونـەی زۆر جوان لەبارەی ئـەم ڕاستییەوە هەیـە. لـە پێشـبینییە مەزنەکانی (چارلز دیکنز)دا، (پیپ) نموونـەی ئـەم باسـەیە. لـە وەسـفکردنی هۆگرییەکـەی بۆ (ئێسـتێلا)دا دەڵێت: «بەهـۆی خـەم و ئـازارە بەردەوامەکەمـەوە تێدەگـەم خۆشەویسـتییەکەم بـۆ ئـەو دژە لەگـەڵ ئـاوەز، بەڵێـن، ئارامـی، ئومێـد، دڵخۆشـی و هەمـوو نائومێدییەکانی تـر.»

خاتـوو (هاڤیشـام) زیاتـر ئەمـە ڕوون دەکاتـەوە و دەڵێـت: «پێـت دەڵێم خۆشەویسـتی ڕاسـتەقینە چییـە. خۆتەرخانکردنێکی کوێرانـە و شـەرمەزارییەکی دڵنیایی و ملکەچـی و متمانـە و بـاوەڕە دژی خـۆت و تـەواوی جیهـان، دەسـتبەرداربوونی تـەواوی دڵ و ڕۆحتـە بـۆ خۆشەویسـتەکەت -وەک ئـەوەی مـن ئەنجامـم دا.»

ئـەوەی خاتـوو (هاڤیشـام) لێرەدا باسـی دەکات ڕاسـتییە، بـەڵام ئەوە خۆشەویستی ڕاسـتەقینە نییـە، بەڵکوو ئـەوە هـەوا و ئارەزووە.

خۆشەویستی ڕاستەقینە کە پەروەردگار مەبەستێتی نەخۆشی و ئالودەبوون نییە، بەڵکوو ڕەحم و بەزەییە. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾ (سورەتی الروم).

"یەکێک لە نیشانە و بەڵگەکانی خودای گەورە ئەوەیە کە لە خودی خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایدا و لەنێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە. بەڕاستی نیشانە و بەڵگەی بەهێز هەیە لەمەدا بۆ ئەو کەسانەی بیر دەکەنەوە و تێدەفکرن."

خۆشەویستی ڕاستەقینە ئارامی دێنێت بۆ ڕۆحی مرۆڤەکان، نەک ئازار و ناڕەحەتی. خۆشەویستی ڕاستەقینە ڕێت دەدات لە ئارامیدا بیت لەگەڵ خودی خۆت و پەروەردگاری خاوەن دەسەڵاتدا. پەروەردگاری مەزن دەفەرموێت: ﴿لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا﴾ تاکو لەگەڵیاندا هەست بە ئارامی بکەن.

هەوا و ئارەزوو پێچەوانەی ئەمەن. هەوا و ئارەزووەکان دڵتەنگ و خەمبارت دەکەن. هاوشێوەی ماددە بێهۆشکەرەکان بەردەوام ئارەزووی دەکەیت، بەڵام هەرگیز تێرنابیت. تاکو حاڵەتی لەناوچوون بە شوێنیدا ڕادەکەیت، بەڵام هەرگیز پێی ناگەیت. هەرچەندە تەواو خۆت ملکەچی دەکەیت، هەرگیز دڵخۆشیت پێ نابەخشێت.

ئاسوودەیی تەواوەتی ئامانجی هەموو کەسێکە، بۆیە زۆر جار سەختە خۆشەویستی بەدەست بهێنیت لە هەوا و ئارەزووەکانەوە. ڕێگای ڕزگاربوونمان بریتییە لە پرسیارکردن لە خۆمان: ئایا نزیکبوونەوە لەو کەسەی کە خۆشم دەوێت نزیکم دەکاتەوە، یاخود دوورم دەکاتەوە لە پەروەردگار؟

واتـا ئایـا ئـەم کەسـە شـوێنی پەروەرێنـی گرتۆتـەوە لـە دڵمـدا؟ خۆشەویسـتی پـاک و ڕاسـتەقینە هەرگیـز پێچەوانـە و دژ نییـە لەگـەڵ خۆشویسـتنی پـەروەردگاری خـاوەن دەسـەڵات، بەڵکـوو بەهێزتـری دەکات. خۆشەویسـتی ڕاسـتەقینە کاتێـک ڕێپێـدراو و گونجـاوە لـەو سنوورانە لانەدات کە پەروەردگار ڕێگەی داوە. ئەگەر لەو سنوورانەی پـەروەردگار لایدا، ئـەوە جگـە لـە هـەوا و ئـارەزوو، هیـچ شـتێکی تـر نییـە کـە دەبێت ملکەچـی بیـن، یاخـود ڕەتـی بکەینـەوە. دەبێت ببینـە بەنـدەی پەروەردگارمـان، یاخـود بەنـدەی هـەوا و ئارەزووەکانمـان. ملکەچبوونـی هەردووکیـان شـتێکی مەحـاڵ و ئەسـتەمە.

تەنها بـە جەنگان دژی چێژە خراپ و حەرامـەکان دەتوانین چێژی ڕاسـتەقینە بەدەست بهێنیـن. بۆیـە جەنـگان دژی ئارەزووەکانمـان شـتێکی پێویسـتە لەپێنـاو بەدەسـتهێنانی بەهەشـتدا. پـەروەردگار دەفەرموێت: (﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِيَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴿٤١﴾﴾ (سـورەتی النازعـات).

«ئەوانـەی لـە پێگـەی پـەروەردگار دەترسـن و نەفسیان پاراسـتووە لـە هـەوا و ئارەزووەکانیـان، بەهەشـت دەبێتـە پەناگـە و جێگـەی مانەوەیـان.»



## خۆشەویستی لە هەوادا

خۆشەویستی لە هەوادا، یاخود ئەمە ئەو شتەیە کە ڕاگەیاندنکاران دەیانەوێت لە مانگی شوباتدا بەو شێوەیە بیر بکەیتەوە. هەرچەندە شتێکی سەرنجڕاکێشە کە زوو زوو خۆشەویستی دەربېڕیت، بەڵام ڕۆژی ڤالانتاین ساڵی جارێک دێت، هیچ بژاردەیەکت بۆ ناهێڵێتەوە جگە لەوەی یادی بکەیتەوە، یاخود دەبێت بێدڵ و دڵڕەق دەرکەویت.

جەژنی گوڵفرۆش و چکلێت و شیرینیفرۆشەکان لە مانگی شوباتدایە. لە ناوجەرگەی بازرگانیکردن بەم هەستانەوە سەخت دەبێت بیر لەو کەسانە بکەینەوە کە خۆشمان دەوێن. کاتێک ئەوە دەکەین، ڕووبەڕووی هەندێک پرسیار دەبینەوە. هەندێک لەو پرسیارانەم بیر کەوتەوە کاتێک بیرم لە شتێک کردەوە کە هاوڕێیەکم پێی وتبووم. باسی ئەوەی دەکرد هەستێکی چۆنە کاتێک لەگەڵ ئەو کەسەدا دەبێت کە خۆشی دەوێت. بە وتەی خۆی هەموو دونیا لە بەرچاوت ون دەبێت کاتێک پێکەوە دەبن. تاکو زیاتر بیرم لە وتەکەی بکردایەتەوە، زیاتر پرسیارم لا دروست دەبوو.

ئێمـەی مـرۆڤ وا خوڵقاویـن هەسـت بـە خۆشەویسـتی و هۆگـری بکەیـن بەرامبـەر کەسـانی دی. ئـەوە بەشـێکە لـە سروشـت و فیترەتـی ئێمـە. کاتێک هەسـتمان بـەم شـێوەیە بێت بۆ کەسـێکی تر، ڕۆژی پێنج جـار چاوپێکەوتـن لەگـەڵ پەروەرێنـدا ئەنجـام دەدەیـن، ئایـا چەنـد جـار هەسـتمان کـردووە کـە هەمـوو دونیـا لـە بەرچـاومان ون بـووە لـە کاتـی ئامادەبوونـی پەروەرێنـدا؟ ئایـا دەتوانیـن بڵێیـن: خۆشەویسـتیمان بـۆ پەروەردگاری خـاوەن دەسـەڵات زیاتـرە لـە خۆشەویسـتیمان بـۆ هـەر کـەس و شـتێکی دی؟

زۆر جـار بیـر دەکەینـەوە پەروەردگار تەنهـا بـە بـەڵا و نارەحەتـی تاقیمـان دەکاتـەوە، بەڵام ئـەوە ڕاسـت نییـە. پەروەردگار بـە نیعمـەت و خۆشـیش تاقیمـان دەکاتـەوە. بـە پاداشـت و بەخشـین و ئـەو شـتانەی کـە خۆشـمان دەوێـت تاقیمـان دەکاتـەوە. زۆر جـار زۆربەمـان شکسـت دەهێنیـن لـە تاقیکردنەوەمـان بـەو بەخشـین و شـتانەی کـە خۆشـمان دەوێـن. شکسـت دەهێنیـن، چونکـە پەروەرێـن پێمـان دەبەخشـێت، بـەڵام دەیانکەیـن بـە پەروەردگاری خۆمـان و دەیخەینـە نێـو دڵەکانمـان.

کاتێـک پـەروەردگار پـارە و سـامانمان پـێ دەبەخشـێت، پشـت بـە پـارە و سـامانەکە دەبەسـتین نـەک پـەروەردگار خـۆی. بیرمـان دەچێتـەوە پارەکـە سـەرچاوەی پاڵپشـتییەکەمان نییـە، بەڵکـوو ئـەو کەسـە سـەرچاوەکەیە کـە پـارە و سـامانەکەی پـێ بەخشـیون. حـەز دەکەیـن ئـارەق بفرۆشـین تاکـو پارەکانمـان لەدەسـت نەدەیـن، یاخـود قـەرز دەدەیـن و سـوو وەردەگریـن لەپێنـاو سـەلامەتی و پارێـزراوی پارەکانماندا. بـە ئەنجامدانی ئـەو کارە، بێفەرمانی بەخشـەرەکە دەکەیـن لەپێنـاو پاراسـتنی بەخشـشـەکە.

کاتێک پەروەرێن کەسێکی خۆشەویستمان پێ دەبەخشێت، بیرمان دەچێتـەوە پەروەرێن خـۆی سـەرچاوەی بەخشینەکەیە، پاشـان دەسـت

دەکەین بە خۆشویستنی کەسەکە لەبری ئەوەی پەروەردگارمان خۆش بویێت. ئەو کەسە دەبێتە هەموو شتێک بۆمان، هەموو بیر و خەیاڵ و پلان و ترس و ئومێدێکمان پەیوەست دەکەین بەو کەسەوە. ئەگەر ئەو کەسە هاوسەرمان نەبێت، هەندێک جار حەز دەکەین بکەوینە نێو حەرام و تاوانەوە تەنها بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بین، ئەگەر بەجێمان بهێڵن، هەموو جیهانەکەمان لەناو دەچێت. کەواتە ڕووی پەرستشمان گۆڕیوە لە سەرچاوەی بەخشینەکەوە بۆ بەخششەکە خۆی. پەروەردگار بەمجۆرە کەسانە دەفەرموێت: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ﴿١٦٥﴾﴾ (سورەتی البقرە). «لەنێو خەڵکیدا کەسانێک هەن کە هاوبەشی بۆ خودا بڕیار دەدەن، ئەو کەسانەیان خۆش دەوێت لەبری ئەوەی خودایان خۆش بوێت، بەڵام ئەوانەی باوەڕدارن خۆشەویستییەکی بەهێزیان هەیە بۆ پەروەردگاریان».

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بەهۆی ئەم فیترەتی لەدەستدانی بینایییە دوای ئەوەی چاکەمان لەگەڵدا دەکات دەفەرموێت: ﴿قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُواْ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾﴾ (سورەتی التوبە).

«ئەی موحەمەد پێیان بڵێ ئەگەر باووباپیرانتان و براکانتان و هاوسەرانتان و عەشیرەت و هۆزتان و ماڵ و سامانێک کە بەدەستتان هێناوە، یاخود بازرگانییەک کە دەترسن شکان و بێبازاڕی ڕووی تێبکات و خانووبەرە و کۆشک و تەلارێک کە حەز ناکەن لەناو بچێت و دڵخۆشن پێی، لاتان خۆشەویستتر و نازدارتر بێت لە پەروەردگار

و پەیامبەرەکەی و جیهاد و تێکۆشان لەپێناو ڕێبازی پەروەردگاردا، چاوەڕێ بکەن تاکو پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات فەرمانەکانی جێبەجێ دەکات، (تۆڵەتان لێ دەسێنێتەوە). پەروەردگاری باڵا هیدایەت و ڕێنمایی قەومی یاخی و گومڕا ناکات».

زۆر گرنگە تێبینی ئەوە بکەیت هەموو ئەو شتانەی لە ئایەتەکەی سەرەوەدا ئاماژەی پێ دراوە حەڵاڵ و ڕێپێدراون و لەڕاستیدا بەخششن. هەندێک لەو بەخشینانە نیشانە و بەڵگەن لە لایەن پەروەردگارەوە. لە لایەکی ترەوە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓاْ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾ (سورەتی الروم).

«یەکێک لە نیشانە و بەڵگەکانی خودای گەورە ئەوەیە کە لە خودی خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی ئارام بگرن لە لایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە. بەڕاستی نیشانە و بەڵگەی بەهێز هەیە لەمەدا بۆ ئەو کەسانەی بیر دەکەنەوە و تێدەفکرن».

لە لایەکی ترەوە پەروەردگار ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنْ أَزْوَٰجِكُمْ وَأَوْلَٰدِكُمْ عَدُوًّا لَّكُمْ فَٱحْذَرُوهُمْ ۚ ﴿١٤﴾﴾ (سورەتی التغابن).

«ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەندێک لە هاوسەرانتان، یاخود ڕۆڵە و نەوەکانتان دوژمنتانن، بۆیە ئاگادار بن و خۆتان بپارێزن لێیان.» ئاگادارکردنەوەکە لەم ئایەتەدا گرنگە.

ئەم فەرمایشتە پڕ هۆشدارییەی خوای گەورە جێگەی تێڕامان و وردبینییە. لێرەدا ئاماژە بە هاوسەر و منداڵەکانمان دراوە کە خۆشەویسترین بەخششی ژیانمانن... بێگومان بە خۆشەویسترینی

کەسەکانمان تاقی دەکرێینەوە. ئەگەر سەرکەوتن لەو تاقیکردنەوەیەدا بە مانای خۆبینینەوەیە لەناو لێشاوی کارتی پیرۆزبایی و گوڵبارانکردن و دواتر بەدەستهێنانی خۆشەویستییەکی گەورەتر و بەرز و پیرۆزتر، بەڵێ، ڕێک وایە و بەو شێوەیەیە... بەڵام ئایا ئەم کارە چ کاتێک زۆر گرنگە.

هەرکاتێک، چونکە لە کۆتاییدا خۆشەویستیی لە هەوادایە و بەو خۆشەویستییە دەژین.

## گەڕان بە دوای خۆشەویستیدا

ژیانم بەسەر برد لە ڕاکردن بە دوای دروستکراوەکاندا. هەمیشە بەو شێوەیە بووم کە پێی دەڵێن «نیازمەند» پێویستم بە هاوڕێ و کەسانی دی هەبوو.

هەرگیز بەرگەی نائومێدییەکانم نەدەگرت، خۆشەویستی وامان لێدەکات بە دوای دروستکراوەکاندا ڕابکەین، پێویستی بەخشین و وەرگرتنی خۆشەویستی لە ناخماندا هەیە، پەروەرێنمان ئەم پێویستییەی تێماندا خوڵقاندووە. هەموو پێویستییەکانمان لە لایەن پەروەردگارەوە خوڵقێنراوە بۆ بەدەستهێنانی مەبەست و ئامانجێک.

پێویستی بەخشین و وەرگرتنی خۆشەویستی وەکو پاڵنەرێک تێماندا خوڵقێندراوە. پاڵنەرێک کە بەرەو پەروەردگارمان دەگەڕێنێتەوە. تەماشا بکە، ئێمە لە لای پەروەردگارەوە هاتووین و دەمانەوێت بگەڕێینەوە بۆ لای ئەو لەم ژیانەدا پێش ئەوەی بگەڕێینەوە بۆ لای لە ڕۆژی دواییدا. پاڵنەری تێماندا خوڵقاندووە تاکو بمانگەڕێنێتەوە بەرەو بەهەشت و لای خۆی، بەڵام ئێمە لە ڕێگاکەدا ون دەبین.

ناتوانین نکوڵی لە پاڵنەرەکە بکەین، بەڵام ون دەبین، چونکە

دەمانەوێت لە ڕێی شتانێکی هەڵە و لە شوێنی هەڵەوە ئەم پێویستییە پڕ بکەینەوە. پاڵنەرەکە لە لایەن پەروەردگارەوە خوڵقێندراوە تاکو بمانگەڕێنێتەوە بۆ لای خۆی، بەڵام پاڵنەرەکە بەرەو دروستکراوەکان ئاڕاستەمان دەکات، بەو شێوەیە ون دەبین.

بۆچی بە دوای کەسانی تردا ڕادەکەین؟ بۆچی بە دوای پارەدا ڕادەکەین؟ بۆچی بە دوای دەسەڵات و پلەدا ڕادەکەین؟ بە دوای ئەم شتانەدا ڕادەکەین، چونکە خۆشەویستی و ڕێزمان دەوێت. بڕوامان وایە لە ڕێی بەدەستهێنانی ئەم شتانەوە دەتوانین خۆشەویستی و ڕێز بەدەست بهێنین.

یاسایەکی سەرنجڕاکێش هەیە ئەم جیهانە بەڕێوە دەبات، یاسایەکی زۆر سادەیە، بەداخەوە زۆرێکمان بە هەڵە لەم یاسایە تێگەیشتووین. بەڵێ! هەمووان هەمان پاڵنەرمان تێدا خوڵقێندراوە، بەڵام مرۆڤ هەمیشە پەلەیە. هەمیشە شتانێکی ڕاستەوخۆ بەسەر دواخراودا، بینراو بەسەر نەبینراودا و جەستەیی بەسەر ڕۆحیدا پەسەند دەکەین. سەرەتا بەرەو ئەو شتانە ڕادەکەین کە دەتوانین ببینین و هەستی پێ بکەین و دەستی لێ بدەین. سەرەتا بەرەو ئەو شتانە ڕادەکەین کە هەست دەکەین نزیکترە، چونکە مرۆڤ هەمیشە بێئارام و لاوازە کاتێک نیازمەند و پەیوەستە. بەرەو ئەو شتانە دەڕۆین کە نزیکترین و ئاسانترین و خێراترینە، بۆیە بەرەو دروستکراوەکان دەڕۆین.

وادەزانین تاکو زیاتر بە دوای ئەم ژیانەدا ڕابکەین، زیاتر بە دوای خۆشەویستی خەڵکی و سەروەت و جوانی و پلە و پۆستدا ڕادەکەین و خۆشەویستی زیاتر بەدەست دەهێنین. وادەزانین تاکو زیاتر شتێکمان بوێت، زیاتر بەدەست دەهێنین. زۆر لە پەروەردگار تووڕە دەبین کاتێک بەدەستی ناهێنین. وەک ئەوەی زۆری ویستنەکەم تاڕادەیەک ئەو مافەم بداتێ کە بەدەستی بهێنم.

تاکو زیاتر لـەم هاوکێشـە هەڵەیـەدا ڕۆبچیـن، زیاتـر شکسـت دەهێنین لـە بەدەسـتهێنانی ئامانجەکەماندا، زیاتر هاوکێشـە ڕاسـتەقینە و سـادەکەی خۆشـەویستی و ژیـان لەدەسـت دەدەیـن. ئـەو هاوکێشـەیە ڕوون و ئاشـکرایە: تاکـو زیاتـر دروسـتکراوەکانمان بوێـت، ئەگـەری کەمتـرە بەدەسـتی بهێنیـن. ئەگـەر پێویسـتت بـە خۆشەویسـتی بێـت و بتەوێـت لـە ڕێـی دروسـتکراوەکانەوە بەدەسـتی بهێنیـت، هەرگیـز بەڕاسـتی و بە تەواوی بەدەسـتی ناهێنیت. هەرشـتێکی دروستکراوەکان کـە لـە پێنـاوی بەدەسـتهێنانیدا ڕادەکەیـت، داگیـرت دەکات و هەرگیـز پـرت ناکاتـەوە.

تەنانـەت خۆشـبەختی خـۆی، تاکـو زیاتـر بـە دوایدا ڕابکەیت، زیاتـر داگیـرت دەکات. ئەگـەر بـە دوای پـەروەردگاردا ڕابکەیت، خۆشـبەختی بە دواتدا ڕادەکات. ئەگەر بە دوای پەروەردگاردا ڕابکەیت، سەرکەوتن بـە دواتـدا ڕادەکات. ئـەوە سـەرکەوتنی ڕاسـتەقینەیە لـەم دونیـا و لـەو دونیـادا. ئەگـەر بـەرەو پەروەرێـن هەنـگاو بنێیـت، نیعمـەت بە سـەرتدا دەڕژێـت. خوشـکان و برایانـی شـیرینم! ئەمـە یاسـا نهێنییەکەیـە کـە زۆردارەکان لەپێناویـدا شـارەکانیان سـووتاندووە و پادشـاکان جیهانـی بـۆ گـەڕاون، بـەڵام هەرگیـز نەیاندۆزیوەتـەوە. ئەمـە نهێنییەکەیـە، تاکـە یاسـایەکە کـە پێویسـتە بیزانیـت.

لـە فەرموودەیەکـدا دەگێڕبتـەوە: «پیاوێـک هـات بـۆ لای پەیامبـەر و وتـی: ئـەی پەیامبـەری خـودا کردارێکـم فێـر بکـە کـە بـە ئەنجامدانـی پـەروەردگار و خەڵکـی خۆشـیان بوێـم، پەیامبـەر فەرمـووی: خـۆت لـەم جیهانـە دابـبڕە، پـەروەردگار خۆشـی دەوێـت. خـۆت لـەو شـتانە دابـبڕە کـە پەیوەسـتە بـە خەڵکییـەوە، خەڵکـی خۆشـیان دەوێـت.»، (ابن ماجـە).

مەجازەکە لێرەدایە، تاکو کەمتر بە دوای پەسەندی و خۆشەویستی خەڵکیدا ڕابکەین، زیاتر پەسەندی و خۆشەویستی خەڵکی بەدەست دەهێنین. تاکو کەمتر نیازمەندی کەسانی دی بین، خەڵکی زیاتر بەدواماندا دێن و ئارەزوومەندی هاوەڵیمان دەکەن. ئەم فەرموودەیە ڕاستییەکی قووڵمان فێر دەکات. تەنها بە دەرچوون لە خولگەی دروستکراوەکان دەتوانین سەرکەوتوو بین لەگەڵ پەروەردگار و خەڵکیدا.

هەنگاونان بەرەو پەروەرێن جووڵەی دڵە. هەنگاونان بەرەو پەروەرێن هەوڵدانە بە هەموو ئەو شتانەی کە پێی بەخشیویت. هەنگاونان بەرەو پەروەرێن جووڵەیە. ناجووڵێیت ئەگەر ناچالاک بیت، شکست دێنیت. جووڵان و هەنگاونان بەرەو پەروەردگار بریتییە لەوەی ڕووی دڵتی تێبکەیت لە هەموو جووڵەیەکی ژیاندا. بریتییە لەوەی هەموو ئامانج و مەبەستێکت بەرەو پەروەردگار بێت. هەر پەروەردگار ئامانجی هەوڵدانەکەت بێت، هۆکاری هەوڵدانەکەت بێت، تاکە مەبەستی هەوڵەکەت بێت، بەڵام بەردەوام بە لە هەوڵدان. هەوڵ بدە ببیتە باشترین دایک، باوک، دراوسێ، خوێندکار، کچ، کوڕ و کارمەند.

ئەمە نەریتی پەیامبەرانمانە (خودا لێیان ڕازی بێت)، جەستەیان لە دونیادا بوون و هەوڵیان دەدا. پەیامبەرمان موحەممەد باشترین پێشەوا و باوک و مێرد و هاوڕێ بوو. بە جەستەی لەم دونیادا زۆر هەوڵی دەدا، بەڵام هەمیشە دڵی لای پەروەرێن بوو. هەر لەو کاتەوە دڵی لە جیهانی دواییدا بوو، هەرچەند جەستەی لەم دونیایەدا بوو، بەڵام دڵی هەر لە ماڵەوە بوو، (لە بەهەشت بوو).

دڵی لەنێو خەیاڵاتەکانی ئەم دونیایەدا دەبینی. باڵەکانی زۆر هەوڵیان دەدا. خوێنی لێ دەچۆڕا و دەگریا و هەوڵی دەدا. جەستەی وەستا تاکو قاچەکانی شکان. جەستەی ئازار و ئەشکەنجە درا لە تائیف. خەوی لێ تۆرا و هەستی بە برسێتی و تینوێتی کرد، تووشی تا و ئازار و لەدەستدان بوو، بەڵام هەمیشە ڕووی دڵی بەرەو پەروەردگار بوو.

کاتێک لەگەڵ پەروەردگاردایت، هیچ برسێتی و تینووێتی و ئازار و لەدەستدانێک ناچێژیت. دەبوو جەستەی بە ئاراستەی جیاوازدا هەوڵ بدات: پەیامبەرمان باوک و پێشەوا و هاوڕێ و مێرد بوو، بەڵام دڵی تەنها ڕووەو پەروەردگار بوو لە هەمان ئەو کاتەی جەستەی بەو هەموو ئاڕاستەیەدا هەوڵی دەدا. پەیامبەر ئیبراهیم بە جوانترین شێوە فەرمووی: ﴿إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾﴾ (سورەتی الانعام). «بەڕاستی من ڕووی خۆم و دڵم لە پەرستندا کردۆتە ئەو زاتەی ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە، لەکاتێکدا ڕوو لە هیچ شتێکی تر ناکەم، بە دڵئارامی تەواویشەوە دەڵێم: هەرگیز لە ڕیزی موشریک و هاوبەشدانەراندا نیم.»

پەیامبەر ئیبراهیم بە تەواوی دڵی کردبوویە پەروەردگار. بۆت دەردەکەوێت تووشی ناڕەحەتی دەبیت، ئەگەر تەنها بەشێکی دڵت ڕووەو پەروەرێن بێت. ئەو ناڕەحەتییە پەیوەستە بە ڕێژەی ملکەچبوونت بە شتەکانی ترەوە.

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱدْخُلُوا۟ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾﴾ (سورەتی البقرە). «ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە هەر هەمووتان خۆتان بخەنە ژێر سایەی

ئيسلامەوە و بە تەواوى پەيڕەوى بكەن و شوێنى هەنگاوەكانى شەيتان مەكەون، چونكە بەڕاستى ئەو دوژمنى ئاشكراتانە.»

ئازار لە نيمچە ملكەچيدا هەيە. لە ڕاستيدا ئازارێک هەيە لەو دەمەى ناچيتە تاكە ئارامى و سەلامەتييەوە بە تەواوى و بە هەموو دڵتەوە. ئازار لە نيمچە سوجدەدا هەيە. ئازار هەيە لە دانانى دڵت لە دەستى كەسانى تردا. ئەو ئازارە بەردەوام دەبێت تاكو ئەو كاتەى تەواوى دڵت بەرەو يەک ئاڕاستە دەبەيت. تاكو تەواوى دڵت بەرەو پەروەردگار دەبەيت. ئەو دەبێتە تاكە ئامانجى ڕاستەقينەى هەوڵدانەكانت.

كاتێک ڕۆژانە بە لايەنى كەمەوە (١٧) جار دەڵێين: ﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ۝﴾ (سورەتى الفاتحە).

«بە تەنها تۆ دەپەرستين و داواى يارمەتى تەنها لە تۆ دەكەين»، پەروەردگار تاكە ئامانجمانە. هيچ كەسێک بە پەروەردگار ناگات بەبێ يارمەتى پەروەردگار خۆى. لا حول و لا قوه الا باللە، «هيچ گۆڕان و هێزێک نييە جگە لەوەى لە لايەن پەروەردگارەوە نەبێت.»

ئەو كەسەى بەم شێوەيە دڵى بە تەواوى ڕووەو پەروەردگار دەكات، دەگات بە ڕزگارى ڕاستەقينە. ئەو كەسە چيدى لە لايەن دروستكراوەكانەوە ئازار نادرێت. ئاگر نەيتوانى پەيامبەر ئيبراهيم بسووتێنێت. ئاگرى دروستكراو ناتوانێت ئازارى ئەو كەسانە بدات كە دڵيان ڕووەو پەروەردگارە.

ئاگرى دارايى، جەستەيى، هەستى، كۆمەڵايەتى و دەروونى ناتوانێت ئازارى ئەو كەسانە بدات كە دڵيان ڕووەو پەروەردگارە. لە ڕووكارى دەرەوەدا ڕەنگە ئازارى پێگەيشتبێت، بەڵام لە ڕاستيدا ئەم جۆرە كەسانە هەرگيز ئازار ناچێژن. ڕاستى ئەم حاڵەتە زيانبەخش نييە، بەڵكوو چاكە، هەروەک چۆن پەيامبەرمان فێرمان

دەکات: «عَجَبًا لأَمْرِ الْمُؤْمِنِ، إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ، وَلَيْسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلَّا لِلْمُؤْمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيْرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ، صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ».

«ژیانی باوەڕدار سەیرە! لە هەموو شتێکدا خێری تێدایە بۆی، ئەمەیش تەنها بۆ باوەڕدار وایە. ئەگەر تووشی بەڵایەک ببێت ئارام دەگرێت و لەمەیشدا خێر هەیە بۆی.» (رواه مسلم).

ئەمەیش تەنها بۆ باوەڕدار وایە. تەنها بۆ ئەو کەسانەی کە ڕووی تەواوی دڵیان کردۆتە یەک ئاراستە. لە بیرت بێت پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدْخُلُواْ فِى ٱلسِّلْمِ كَآفَّةً وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٠٨﴾﴾ (سورەتی البقرە).

«ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە، هەر هەمووتان خۆتان بخەنە ژێر سایەی ئیسلامەوە و بە تەواوی پەیڕەوی بکەن و شوێنی هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون، چونکە بەڕاستی ئەو دوژمنی ئاشکراتانە». بچۆرە ئارامی و سەلامەتی تەواوەوە.

سەلامەتی تەواو بۆ ئەو کەسانەیە کە بە تەواوی دەچنە ئەو حاڵەتەوە. لە یادت بێت دڵ ئەندامێکی جێگیر نییە. دڵ واتا گۆڕان (وشە عەرەبییەکەی بریتییە لە «القلب» کە لە ڕەگەکەیەوە سەرچاوەی گرتووە بە مانای «هەڵگەڕانەوە» دێت. دڵ هەڵدەگەڕێتەوە، بۆیە ئامانجمان لە ژیاندا دەبێت ئاگادارکردنەوەی دڵ و گەڕانەوەی بێت بۆ لای پەروەردگار. بەردەوام داوای یارمەتی لە پەروەرێن دەکەین، وەک پەیامبەرمان بەردەوام نزای دەکرد.

«یا مقلب القلوب ثبت قلبی علی دینک»، «ئەی هەڵسوڕێنەری دڵەکان دڵمان لەسەر دینەکەت ڕاگرە و جێگیری بکە.»

ئەم بەردەوام گەڕانەوەیەیش تۆبەکردنە. بەردەوام بگەڕێوە لای

پەروەرێن، تەنها ئەوانەی واز لەم ململانێیە دێنن دەدۆڕێن. تەنها ئەوانەی کە بەهۆی لەخۆڕازیبوون، یاخود نائومێدییەوە دەست هەڵدەگرن لە ململانێی گەڕاندنەوەی دڵ بەرەو ئامانجی سەرەکی لەم دونیا و دونیای دواییدا شکست دێنن و دەدۆڕێن.

هەموومان خۆشەویستیمان دەوێت لە لایەن پەروەردگار و خەڵکییەوە. هەموومان بە دوای شتێکدا ڕادەکەین. وەلێ تاکو زیاتر بە دوای دروستکراوەکاندا ڕابکەین، زیاتر لێمان دوور دەکەونەوە. کاتێک دەوەستین و دەستبەرداریان دەبین و ڕوو وەردەگێڕین و دڵمان ڕووەو پەروەردگار دەکەین، دروستکراوەکان بە دواماندا دێن. ئەمەیش یاسایەکی زۆر سادەیە: ئەگەر بە دوای دروستکراوەکاندا ڕابکەیت، پەروەردگار و دروستکراوەکان لەدەست دەدەیت. ڕووەو پەروەردگار برۆ، پەروەردگار و دروستکراوەکان بەدەست دەهێنیت.

پەروەردگار (الودود)ە (سەرچاوەی خۆشەویستی).

بۆیە خۆشەویستی لە پەروەردگارەوە سەرچاوە دەگرێت نەک خەڵکی. هەروەک چۆن (چارلز ف. هانێل)ـی نووسەر دەڵێت: «بۆ ئەوەی خۆشەویستیت دەست بکەوێت دەبێت خۆت پڕ بکەیت لە خۆشەویستی تاکو هاوشێوەی موگناتیسێکت لێ دێت».

کاتێک خۆت بە سەرچاوەی خۆشەویستییەکە (الودود) پڕ دەکەیت، دەبیتە موگناتیسی خۆشەویستی. پەروەردگار لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرموێت: **(إِذَا أَحَبَّ اللَّهُ الْعَبْدَ نَادَى جِبْرِيلَ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلاَنًا فَأَحْبِبْهُ فَيُحِبُّهُ جِبْرِيلُ فَيُنَادِي جِبْرِيلُ فِي أَهْلِ السَّمَاءِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ فُلاَنًا فَأَحِبُّوهُ فَيُحِبُّهُ أَهْلُ السَّمَاءِ ثُمَّ يُوضَعُ لَهُ الْقَبُولُ فِي الأَرْضِ)**.

«کاتێک پەروەردگار بەندەیەکی خۆی خۆش بووێت، بانگی جبریل دەکات و پێی دەفەرموێت: «من فلان و فلانم خۆش دەوێت،

بۆیە تۆیش خۆشیانت بوێت.» پەیامبەرمان فەرمووی: «جبریل ئەو بەندانەی خۆش دەوێت. پاشان جبریل لە بەهەشتدا بانگ دەکات و دەفەرموێت، پەروەردگار فلان و فلانی خۆش دەوێت، ئێوەیش خۆشتان بووێن. تەواوی دانیشتووانی بەهەشت ئەو کەسانەیان خۆش دەوێت.» پاشان پەیامبەر فەرمووی «بۆیە ئەو کەسانەیش لەسەر زەویدا خۆش دەویسترێن»، (رواه البخاری و غیره).

هەمووان ڕادەکەین، بەڵام کەمێکمان بەرەو ئاڕاستە ڕاست و دروستەکە ڕادەکەین. هەمان ئامانجمان هەیە، بەڵام بۆ گەیشتنمان بەوێ دەبێت بووەستین و بزانین ئایا بەرەو سەرچاوەکە ڕادەکەین، یاخود تەنها بەرەو تیشکدانەوەکەی دەڕۆین.



## ئەمە خۆشەویستییە

هەندێک کەس تەواوی ژیانیان لە گەڕان و هەندێک جار بەخشین و وەرگرتن و شوێنکەوتن بەسەر دەبەن، بەڵام زۆربەی کات تەنها چاوەڕێن. وادەزانن خۆشەویستی شوێنێکە بۆی دەڕۆن: وێستگەی کۆتاییە لەسەر ڕێیەکی دووورودرێژدا. ناتوانن چاوەڕێ بکەن ڕێگاکە بە کۆتا بێت و بگەنە وێستگەی کۆتایی.

ئەو دڵانەن کاریگەر دەبن بە جووڵەی دڵەکان. کەسانی ڕۆمانسی بێهیوان، ئارەزوومەندانی چیرۆکی خۆشەویستی، یاخود هەر دەستەواژەیەکی دڵسۆزانەی خۆتەرخانکردنێکی ڕاستەقینەن. گەڕانەکەیان بریتییە لە وابەستەبوونێک کە تەواوی تەمەن دەگرێتەوە، بەڵام ئەم گەڕانە تراژیدیایە، زیانی خۆی هەیە. ڕێگای پێشبینییەکان و کەوتنە داوی خۆشەویستی خودی خۆشەویستییەوە زۆر بەئازارە، بەڵام وانە و پەندی خۆی تێدایە. وانە و پەندەکان لەبارەی سروشتی خۆشەویستی و ئەم جیهانە و خەڵکی و دڵەکان زۆر جار ئەم ڕێگا پڕ ئازارە دادەڕێژن. بەگشتی ئەم ڕێگا پڕ ئازارە وانە و پەندی تێدایە لەبارەی ئافرێنەری خۆشەویستییەوە.

ئەوانەی ئەم ڕێگایە دەگرنە بەر زۆر جار دەگەنە ئەو ڕاستییەی

خۆشەویستی مرۆڤ کە بە شوێنیدا وێڵن وێستگەی کۆتایی نییە. هەندێک جۆری خۆشەویستی مرۆڤ دەکرێت خەلاتێک بێت. دەکرێت خۆشەویستی هۆکارێک بێت، بەلام تووشی شکست دێیت کاتێک ئەو هۆکارە وەکو ئامانج و مەبەستی کۆتایی تەماشا دەکەیت. پاشان تەواوی ژیانت لە شتێکی هەڵەدا بەسەر دەبەیت. ئارەزوو دەکەیت ئامانج و مەبەستە سەرەکییەکە بکەیتە قوربانی لەپێناو هۆکارەکەدا. تەواوی ژیانت بەسەر دەبەیت بۆ گەیشتن بە وێستگەی کامڵی و بێ کەموکورپی دونیایی کە هەرگیز بوونی نییە و نابێت.

ئەو کەسەی بەشوێن سەرابێکدا ڕادەکات هەرگیز پێی ناگات، بەلام لە ڕاکردن بەردەوام دەبێت. تۆیش هاوشێوەی ئەو کەسە بەردەوامیت لە ڕاکردن، ئارەزوو دەکەیت خەوت بزڕێت و بگریت و خوێنت لێ بڕژێت و بەشە بەهادارەکانی خۆت و تەنانەت شەرەفی خۆت لەپێناویدا بکەیتە قوربانی. هەرگیز بەو شتە ناگەیت کە لەم ژیانەدا بە شوێنیدا وێڵیت، چونکە ئەو شتەی بە شوێنیدا وێڵیت وێستگەیەکی دونیایی نییە. ئەو کامڵی و بێکەموکورپییەی بەدوایدا وێڵیت ناتوانرێت لەم جیهانی ماددەگەرییەدا بدۆزرێتەوە. دەکرێت تەنها لە پەروەرپێن و ڕێگەی بەرەو پەروەرپێندا بدۆزرێتەوە.

دیمەنی خۆشەویستی مرۆڤ کە بە شوێنیدا وێڵیت، خەیاڵێکە لە بیابانی ژیاندا. ئەگەر بە شوێنیدا بگەڕێیت، دەبێت بەردەوام بیت لە گەڕان. گرنگ نییە چەندە نزیک بیت لە سەرابەکەوە، هەرگیز پێی ناگەیت. هیچ وێنەیەک بەدەست ناهێنیت. ناتوانیت ڕێگری لە خەیالاتی ئەقڵی خۆت بگریت.

تەواوی ژیانت تەرخان دەکەیت بۆ گەیشتن بەم شوێنە، چونکە لە چیرۆکە خەیاڵییەکاندا ئەوە کۆتایی چیرۆکەکەیە. چیرۆکەکە کۆتایی دێت بە دۆزینەوە و یەکگرتنەوە و هاوسەرگیری لەگەڵ

نیوەکەی تری ژیانتدا. ویستگەی کۆتایی بە یەکگرتنی ڕۆحەکان بەدەست دەهێنرێت. هەموو کەسانی دەوروبەرت وات لێ دەکەن بیر بکەیتەوە ئەوە کۆتایی ڕێگەکەت بێت: ئەو شوێنەی کە چاوت بە هاوبەشی ژیانت و نیوەکەی تری ژیانت دەکەوێت، لەو شوێن و ساتەی کە هاوسەرگیری دەکەیت. تەنها دوای ئەوە پێت دەڵێن کامڵ و تەواو دەبیت. ئەمەیش بە دڵنیاییەوە درۆیەکی شاخدارە، چونکە کامڵی و تەواوی لە هیچ شتێکی تردا بەدی ناکرێت جگە لە پەروەردگاردا.

ئەو وانەیەی لە منداڵییەوە فێری بوویت لە ڕێی چیرۆکەکان، گۆرانیەکان، فلیمەکان، ڕیکلامەکانەوە ئەوەیە کە کامڵ و تەواو نیت. ئەگەر خودانەخواستە یەکێک بیت لەوانەی هاوسەرگیریان نەکردووە، یاخود تەڵاق دراون، ئەوا بە خەوشدار و ناکامڵ ئەژمار دەکرێیت.

ئەو وانەیەی لێرەدا فێری دەبیت ئەوەیە چیرۆکەکە بە هاوسەرگیری کۆتایی دێت و دواتر بەهەشت دەست پێ دەکات. لەو ساتە بەدواوە پارێزراو و کامڵ دەبیت، هەموو شتێکی تێکشکاو و لەناوچوو چاک دەبێتەوە، بەڵام ئەوە کۆتایی چیرۆکەکە نییە، بەڵکوو چیرۆکەکە لەوێوە دەست پێ دەکات. لەو ساتەوە بنیاتنانەکە دەست پێ دەکات: بنیاتنانی ژیانێک، بنیاتنانی کەسایەتیت، بنیاتنانی سەبرگرتن و خۆڕاگری، بنیاتنانی خۆنەویستی و بنیاتنانی خۆشەویستی، بنیاتنانی ڕێگەکەت بۆ گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگاری خاوەن ئاسمانەکان و زەوی.

ئەگەر هاوسەرەکەت ببێتە تاکە ئامانجی ژیانت، ئەوا ململانێکەت تازە دەستی پێ کردووە. هاوسەرەکەت دەبێتە گەورەترین تاقیکردنەوەت. ئەوەیش ئازارت دەدات تا ئەو کاتەی هاوسەرەکەت

لە دڵتدا دەردەهێنیت، چونکە پێویستە تەنها خودای گەورەی تێدابێت.
واتـا هاوسـەرەکەت دەبێتـە هـۆکاری ئـەم ئـازارە تاکـو فێـر دەبیـت هەندێک شـوێن لـە دڵی مرۆڤدا هـەن کـە تەنها لـە لایـەن پەروەرێنی مەزنـەوە دروسـت کـراوە و بـۆ ئـەو دروسـت کـراوە.

هەندێکی تـر لـەو وانانـەی بـە درێژایی ئـەم ڕێگایـە فێری دەبیت دوای لەدەسـتدان و بەدەسـتهێنان و شکسـت و سـەرکەوتن و چەندیـن هەڵـە، ئەوەیـە کـە دوو جـۆر خۆشەویسـتی بوونـی هەیـە: هەندێـک کەسـت خـۆش دەوێـت بەهـۆی ئـەو شـتانەوە کـە لێیانـەوە دەسـتت دەکەوێـت: ئـەو شـتانەی پێتـی دەبەخشـن و ئـەو هەسـتەی بۆتـی دروسـت دەکەن. ئەمەیش زۆرتریـن پشـکی خۆشەویسـتی دەگرێتـەوە، دەبێتـە هـۆی ئـەوەی ئـەم جـۆرە خۆشەویسـتییە ناجێگیر بێت. توانـای بەخشـینی کەسـەکان کاتـی و گـۆڕاوە. هەروەهـا کاردانـەوەت بـۆ ئـەو شـتانەی پێتدەبەخشـرێت کاتـی و گـۆڕاوە. ئەگـەر بەشـوێن هەسـتێکدا ڕابکەیـت، دەبێـت هەمیشـە بـەردەوام بیـت لـە ڕاکـردن. هیـچ هەسـتێک بـەردەوام و هەمیشـەیی نییـە.

ئەگـەر خۆشەویسـتی پەیوەسـت بێـت بـەم هەسـتەوە، ئـەو خۆشەویسـتییەیش کاتـی و گـۆڕاو دەبێـت. هاوشـێوەی هەمـوو شـتەکانی ئـەم دونیایـە تاکـو زیاتـر بـە شـوێنیدا ڕابکەیـت، زیاتـر لێـت دوور دەکەوێتـەوە.

کاتێـک ئـەو کەسـانەی خۆشـت دەوێـن دێنـە نێـو ژیانتـەوە، نـەک بەهـۆی ئـەو شـتانەی پێتدەبەخشـن، بەڵکوو بەهـۆی خـودی خۆیانـەوە. ئـەو جوانییـەی لـەو کەسـانەدا دەیبینیت ڕەنگدانـەوەی بەدیهێنەرەکەیـە، بۆیـە خۆشـت دەوێـن. دواتـر خۆشەویسـتییەکە پەیوەسـت نییـە بـەوەی کـە بەدەسـتی دەهێنیـت، بەڵکـوو پەیوەسـتە بـەو شـتانەی

دەیبەخشیت. ئەوە خۆشەویستی سادە و خۆنەویستانەیە. ئەم جۆرە خۆشەویستییە دەگمەنترین و کەمترین جۆی خۆشەویستییە. ئەگەر پەیوەست بێت بە خۆشەویستی پەروەرێنەوە نەک ململانێ بکات لەگەڵ خۆشەویستی پەروەرێندا، ئەوا زۆرترین کەیف و خۆشی دەهێنێت. خۆشویستن بە هەر شێوەیەکی تر بێت و پەیوەست بێت بە پێویستی و وابەستەبوون و چاوەڕوانیکردن هۆکاری خەمباری و نائومێدین.

هەموو ئەوانەی ژیانیان لە گەڕاندا بەسەر بردووە پێویستە بزانن پاکی و پوختی هەر شتێک لە سەرچاوەکەیەوە سەر هەڵ دەدات. ئەگەر بە دوای خۆشەویستیدا بگەڕێیت، لە ڕێی پەروەردگارەوە بە شوێنیدا بگەڕێ. هەموو جۆگەلەکانی تر کە پەیوەست نین بە خۆشەویستی ئیلاهییەوە ئەو کەسە ژەهراوی دەکات کە لێی دەخواتەوە. ئەو کەسەی دەیخواتەوە بەردەوام دەبێت لە خواردنەوەی تاکو ژەهرەکە دەیکوژێت. زیاتر بەردەوام دەبێت تاکو لە ناخەوە دەمرێت، پاشان دەوەستێت و سەرچاوەی ئاوە سازگار و خاوێنەکە دەدۆزێتەوە.

کاتێک هەموو شتەکان بە جوانی و قەشەنگی دەبینیت وەک تاکە ڕەنگدانەوەی جوانی ئیلاهی، فێر دەبیت بە شێوەیەکی دروست کەسەکانت خۆش بوێت: تەنها لەپێناو پەروەردگاردا هەموو کەسێک و شتێکت خۆش بوێت. سەرچاوەی ئەم جۆرە خۆشەویستییە بریتییە لە پەروەردگار. بۆیە ئەو شتەی خووت پێوە گرتووە، چیدی هەستێکی ناجێگیر نییە. ئەوەی بە دوایدا ڕادەکەیت، چیدی سەرکەوتنێکی کاتی نییە. تەنها و تەنها بەشوێن پەروەردگاردا دەگەڕێیت و خۆشت دەوێت و پشتی پێ دەبەستیت، تەنها ئەو جێگیر و بەردەوامە. دوای ئەمە هەموو شتەکان لەپێناو پەروەردگاردا

دەبێت. هەمـوو شـتەکان کـە دەیبەخشـیت و وەریدەگریـت، خۆشـت دەوێ و خۆشـت نـاوێ پەیوەسـت دەبێـت بـە پـەروەردگارەوە نـەک نەفسـی خۆتـەوە. هەمـوو کارێکـت لەپێنـاوی پـەروەردگاردا دەبێـت، نـەوەک نەفسـی خـۆت.

واتـا ئـەو شـتەت خـۆش دەوێـت و حـەزت لێ دەبێت کـە پەروەردگار خۆشـی دەوێـت و حـەزی لێیـە، ئـەو شـتەت خـۆش ناوێـت کـە ئـەو خۆشـی ناوێت. دەبەخشـیت کاتێک دەکەوێتـە خۆشەویسـتییەوە، نـەک لەبـەر ئـەوەی لـە بەرامبـەردا بەدەسـتی بهێنیتـەوە. خۆشـت دەوێـت و دەبەخشـیت، بـەڵام تەنهـا بـە پـەروەردگاری باڵادەسـت ڕازی و قایـل دەبیـت. ئـەوەی پـەروەردگار ڕازی بـکات، دەوڵەمەندتریـن و بەخشـندەترینی هەمـوو خۆشەویسـتەکانە. خۆشەویسـتییەکەت لـە لایـەن پـەروەردگار و لەپێنـاو ئـەو و بەهـۆی ئـەوەوە دەبێـت. ئـەوە ڕزگاربوونـی خـودە لـە بەندایەتـی هـەر شـتێکی دروسـتکراو و بەدیهێنـراو . ئـەوە ئـازادی و خۆشـبەختییە، ئـەوە خۆشەویسـتییە.



## کەوتنە داوی خۆشەویستی شتە ڕاستەقینەکە

هەرگیز ئاسان نییە دەستبەرداری شتێک ببیت، وایە؟ زۆربەمان هاوڕاین لەسەر ئەوەی چەند شتێکی کەم هەیە سەختتر بێت لەوەی دەستبەرداری ئەو شتە ببین کە خۆشمان دەوێت، بەڵام هەندێک جار دەبێت دەستبەرداریان ببین. هەندێک جار هەندێ شتمان خۆش دەوێت کە ناتوانینێ بەدەستیان بهێنین. هەندێک جار هەندێ شتمان دەوێت کە باش و خێر نین بۆمان، هەندێک جار ئەو شتانەمان خۆش دەوێت کە پەروەردگار خۆشی ناوێت. سەختە دەستبەرداربوونی ئەم شتانە، دەستبەرداربوونی شتێک کە دڵ پێی خۆشە، یەکێکە لە سەختترین جەنگەکان کە پێویستە ئەنجامی بدەین.

چی دەبێت ئەگەر ئەم جۆرە جەنگە نەبێت؟ چی دەبێت ئەگەر هێندە سەخت نەبێت؟ ئایا ڕێگایەکی ئاسان هەیە بۆ دەستبەرداربوونی هۆگربوون و وابەستەبوونێک؟ بەڵێ! ڕێگایەکی ئاسان هەیە، ئەویش دۆزینەوەی شتێکی باشترە.

دەوترێت ناتوانیت دەستبەرداری کەسێک، یاخود شتێک ببیت تاکو کەسێک، یاخود شتێکی باشتر نەدۆزیتەوە. ئێمەی مرۆڤ بە باشی ناتوانین لەگەڵ خاڵیبووندا هەڵبکەین. هەموو شوێنێکی بەتاڵ و خاڵی

پێویستە ڕاستەوخۆ پڕ بکرێتەوە. قوربانییەکە ناچار دەکات ئەو شوێنە پڕ بکاتەوە. چرکەساتێک بە بوونی کەلێنێک دەبێتە هۆی ئازارێکی بەتین. بۆیە لە سەرقاڵبوونێکەوە ڕادەکەین بۆ سەرقاڵبوونێکی تر، لە هۆگربوونێکەوە ڕادەکەین بۆ هۆگربوونێکی تر.

لە گەڕان بۆ ئازادکردنی دڵەکان، زیاتر لە بارەی دابڕان لە وابەستەبوونە هەڵەکانەوە دەدوێین، بەڵام هەمیشە پرسیارێک هەیە لەبارەی ئەوەی چۆن ئەو کارە ئەنجام بدەین؟ کاتێک وابەستەبوونێکی هەڵەمان دەبێت، چۆن خۆمان لێی ڕزگار بکەین؟ زۆربەی جار زۆر سەخت دەبێت، ئالوودەی شتەکان دەبین و ناتوانین دەستبەرداریان ببین. تەنانەت کاتێک کە ئازارمان دەدەن و ژیانمان تێکدەدەن و پەیوەندییەکانمان لەگەڵ پەروەردگاری مەزندا دەپچڕێنێت. تەنانەت کاتێک کە زۆر بۆمان خراپن، ناتوانین بە ئاسانی دەستبەرداریان ببین. زۆر وابەستەیان بووین و زۆر خۆشمان دەوێن، بەڵام بە شێوازێکی هەڵە. شتێک لە ناخماندا پڕ دەکەنەوە و وا هەست دەکەین پێویستمانە. هەست دەکەین ناتوانین بێ ئەوان بژین. کاتێک دەجەنگین بۆ دەستبەرداربوونیان، زۆرجار واز لە جەنگەکە دەهێنین، چونکە زۆر سەخت و گرانە.

بۆچی ئەمە ڕوودەدات؟ بۆچی تووشی سەختی و ناڕەحەتی دەبین لە کاتی کردنە قوربانی ئەو شتانەی خۆشمان دەوێن لەپێناو خۆشەویستی پەروەردگاردا؟ بۆچی ناتوانین دەستبەرداری شتەکان ببین؟ بڕوام وایە زۆر دەجەنگین لەپێناو دەستبەرداربوونی ئەو شتانەی خۆشمان دەوێن، چونکە هیچ شتێکمان نەدۆزیوەتەوە کە خۆشترمان بوێت تاکو شوێنی بگرێتەوە.

کاتێک منداڵێک حەزی بە ئۆتۆمبیلێکی منداڵانە دەبێت، ئەو حەزلێبونە داگیری دەکات. چی دەبێت ئەگەر نەتوانێت ئەو ئۆتۆمبیلە بەدەست بهێنێت؟ چی دەبێت ئەگەر هەموو ڕۆژێک بە بەردەم

دوکانەکەدا تێپەڕێت و ئەو ئۆتۆمبیلە ببینێت کە ناتوانێت بەدەستی بهێنێت؟ هەر کاتێک بەو شوێنەدا تێپەڕێت هەست بە ئازار دەکات. ڕەنگە هەندێک جار بجەنگێت تاکو ئۆتۆمبیلەکە نەدزێت. چی دەبێت ئەگەر منداڵەکە تەماشای ئەو دیوی پەنجەرەی دوکانەکە بکات و ئۆتۆمبیلێکی ڕاستەقینە ببینێت؟ چی دەبێت ئەگەر ئۆتۆمبیلێکی جۆری فێراری ببینێت؟ ئایا ئەو کاتەیش ئارەزووی لە ئۆتۆمبیلە منداڵانەکە دەبێت؟ ئایا دەبێت هێشتا بجەنگێت بۆ ئەوەی نەیدزێت؟ یاخود دەتوانێت بە بەردەم ئۆتۆمبیلە منداڵانەکەدا تێپەڕێت و ئەو جیاوازییە لە گەورەییدا جەنگەکە کپ دەکاتەوە؟

خۆشەویستی و پارە و پۆست و ئەم ژیانەمان دەوێت و حەزمان لە منداڵە و زۆر پەیوەست دەبین بەم جۆرە خۆشەویستیانەوە. کاتێک ناتوانین ئەم شتانە بەدەست بهێنین وەک ئەو منداڵەی بەردەم دوکانەکەمان لێ دێت و هەوڵ دەدەین کە نەیاندزین. هەوڵ دەدەین کاری حەرام ئەنجام نەدەین بەهۆی ئەو شتانەی کە خۆشمان دەوێن.

هەوڵ دەدەین دەستبەرداری پەیوەندی حەرام و مامەڵەی بازرگانی و کاروبارەکان و پۆشاکەکانمان ببین. هەوڵ دەدەین دەستبەرداری خۆشەویستی ئەم ژیانە ببین. ئێمە ئەو بەندە و خزمەتکارەین کە هەوڵ دەدەین دەستبەرداری بووکەڵەکە ببین، چونکە ئەوە هەموو شتێکە کە دەیبینین.

تەواوی ئەم ژیانە و شتەکانی ناوی هاوشێوەی ئەو ئۆتۆمبیلە منداڵانەیەیە. ناتوانین دەستبەرداریان ببین، چونکە شتێکی باشتر و چاکترمان نەدۆزیوەتەوە، شتە ڕاستەقینەکەمان نەبینیوە، ڤێرژنە ڕاستەقینە و مۆدێلە ڕاستەقینەکەمان نەبینیوە. پەروەردگار دەفەرموێت: (وَمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا لَهۡوٞ وَلَعِبٞۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ لَهِيَ ٱلۡحَيَوَانُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٦٤﴾)، (سورة العنكبوت).

«ژیانی ئەم دونیایە چییە جگە لە ڕابواردن و کەیفخۆشی؟ بەڕاستی ژیانی ئەو دونیا و ژیانی ناو بەهەشت ژیانی حەقیقی و ڕاستەقینەیە (شایستەی ئەوەیە ئادەمیزاد هەوڵی بۆ بدات)، ئەگەر بیانزانیایە و تێبگەیشتنایە».

پەروەردگار لە باسکردنی ئەم ژیانەدا وشەی (الحیاه) بەکار دێنێت، بەڵام لە باسکردنی ژیانی دواییدا وشەی (الحیوان) بەکار دێنێت. ژیانی دوایی ژیانێکی ڕاستەقینەیە. پەروەردگار کۆتایی بە ئایەتەکە دێنێت بە دەستەواژەی (ئەگەر بەڕاستی بیانزانیایە). ئەگەر ژیانی ڕاستەقینەمان ببینیایە، ئەوا دەستبەرداری خۆشەویستییە زۆرەکەمان بۆ ئەم ژیانە کەم و ساختەیە دەبووین. پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿بَلْ تُؤْثِرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٧﴾﴾ (سورەتی الاعلی).

«ئێوە ڕێبازی ڕزگاری ناگرنە بەر، بەڵکوو زیاتر ژیانی ئەم دونیایەتان مەبەستە و لاتان پەسەندە (١٦) لە کاتێکدا ژیانی دواتر و بەدەستهێنانی بەهەشت باشتر و نەبڕاوەیە (١٧)».

ژیانی ڕاستەقینە باشترە لە ڕووی جۆرێتییەوە (خیر) و باشترە لە ڕووی چەندێتییەوە (ابقی). گرنگ نییە ئەو شتەی لەم دونیادا خۆشمان دەوێت چەندە باش و گەورە بێت، هەمیشە کەموکوڕی تێدایە لە ڕووی جۆرێتی (ناکامڵە) و چەندێتییەوە (کاتییە). مانای ئەوە نییە کە نەتوانین لەم ژیانەدا شتانێک بەدەست بهێنین، یاخود شتانێکمان خۆش بوێت. ئێمەی باوەڕدار پێمان وتراوە داوای شتی خێر و چاکە بکەین لە ژیانی ئەم دونیا و ئەو دونیادا، **(ربنا اتینا في الدنیا الحسنة و في الاخرة الحسنة).**

بەڵام ئەمە هاوشێوەی ئۆتۆمبێلە منداڵانەکە و ئۆتۆمبێلە ڕاستەقینەکەیە: هەست بە جیاوازییەکە دەکەین کاتێک دەتوانین

ئۆتۆمبیلە منداڵانەکەمان هەبێت. بە تەواوی دەرک بەوە دەکەین کە جۆرێکی خراپتر و نزمتر هەیە (الدنیا) کە لە وشەی (الدانیة)وە هاتووە، بە مانای (نزمتر دێت) و جۆرە ڕاستەقینەکەیش هەیە کە ژیانی دواییە.

ئایا ئەم تێگەیشتنە سوودی چییە بۆ ئەم ژیانە؟ ئەم تێگەیشتنە شوێنکەوتنی حەڵاڵ و خۆگرتنەوە لە حەرام ئاسانتر دەکات، تاکو زیاتر شتە ڕاستەقینەکە ببینین، زیاتر و ئاسانتر دەتوانین دەستبەرداری شتە ساختە و ناڕاستەقینەکە ببین کاتێک پێویست بکات.

مانای ئەوە نییە بە تەواوی دەستبەرداری شتە ناڕاستەقینەکان ببین، بەڵکوو وا دەکات پەیوەندیمان لەگەڵ شتە دونیاییەکاندا ئاسایی بێت، هیچ سەخت نەبێت کاتێک داوامان لێ دەکرێت دەستبەرداری ببین لەپێناو شتە ڕاستەقینەکەدا. کاتێک داوامان لێ دەکرێت واز لەو شتە قەدەغەکراوە بهێنین کە دەمانەوێت، ئەوە لامان ئاسان دەبێت. ئەگەر داوامان لێ بکرێت توند و بەردەوام بین لەسەر ئەرکێک کە نامانەوێت، لامان ئاسان دەبێت. وەک منداڵێکمان لێ دێت کە حەز دەکات یاری بووکەڵەکەی هەبێت کاتێک داوای لێ بکرێت لەنێوان بووکەڵەکە و شتە ڕاستەقینەکەدا یەکێکیان هەڵبژێرێت.

بۆ نموونە زۆرێک لە هاوەڵانی پەیامبەرمان سەروەت و سامانیان هەبووە، بەڵام کاتێک بارودۆخێک هاتوتە پێشەوە بە ئاسانی دەستبەرداری نیوەی، یاخود تەواوی سەروەت و سامانەکانیان بوون لەپێناوی پەروەردگاردا.

مەبەستی ئەم گۆڕانە کاریگەری دەکاتە سەر ئەوەی ئایا بۆ یارمەتی هەوڵ دەدەین، یاخود بۆ پەسەندکردن. ئەگەر زۆر پێویستمان بە شتێک بێت، دەڕۆین و داوا لە خزمەتکارەکە دەکەین, ئەمە لە کاتێکدا کە پادشاکە نەبینین یاخود نەیناسین، بەڵام ئەگەر بە نیازی بینینی

پادشـاکە بین و چاومـان بـە خزمەتکارەکە کـەوت، ڕەنگە سـڵاوێک لـە خزمەتکارەکە بکەین و بەخشـندە بین لەگەڵیدا و تەنانـەت خۆشمان بوێت. کاتـی خۆمـان بەفیـڕۆ نادەیـن بۆ ئـەوەی خزمەتکارەکە سەرسام بکەین بـە خۆمانـەوە لەکاتێکدا پادشـایەک هەیـە. هەرگیـز کاتـی خۆمـان بەفیـڕۆ نادەیـن تاکو باسـی پێداویسـتییەکانمان بۆ خزمەتکارەکە بکەین لەکاتێکدا پادشـاکە هەمـوو شـتێکی بەدەسـتە. تەنانـەت ئەگـەر پادشـاکە هەندێک دەسـەڵاتیشـی بەخشـیبێت بـە خزمەتکارەکـە، زۆر باش دەزانین تەنهـا پادشـاکە خاوەنـی دەسـەڵاتی ڕەهایـە. کاتێـک ئـەم زانیاریانەمـان دەبێـت کـە پادشـاکە بناسـین و ببینیـن. ئـەم زانیاریانەیـش کاریگـەری دەکاتـە سـەر شـێوازی ڕەفتارکردنمـان لەگـەڵ خزمەتکارەکەدا.

بینینـی شـتە ڕاسـتەقینەکە کاریگـەری دەکاتـە سـەر شـێوازی خۆشەویسـتیمان. ابـن التیمیـە فەرموویەتـی: « ومـن أعظـم أسـباب هـذا البـلاء، يعنـي العشـق، إعـراض القلـب عـن اللـه؛ فـإن القلـب إذا ذاق طعـم عبـادة اللـه، والإخـلاص لـه لم يكـن عنـده شيء قـط أحـلى مـن ذلـك، ولا ألـذ، ولا أمتـع، ولا أطيـب. والإنسـان لا يـترك محبوبـاً إلا بمحبـوب آخـر يكـون أحـبَّ إليـه منـه، أو خوفـاً مـن مكـروه؛ فالحـب الفاسـد إنمـا ينـصرف عـن القلـب بالحـب الصالـح، أو بالخـوف مـن الـضر.»

«ئەگـەر دڵـت بەنـدەی کەسـێک بێـت کـە شایسـتە نەبێـت. یەکێـک لـە هـۆکارە سـەرەکییەکانی ئـەم حاڵەتـە بریتییـە لـە دوورکەوتنـەوەی دڵ لـە پـەروەردگار. کاتێـک دڵ پەرستشـی پـەروەردگاری چەشـت و دڵسـۆز بـوو بـۆ پەروەرێنەکـەی، هیـچ شـتێک لـە پەرستشـی پەروەردگار چێژبەخشـتر نابێـت لـە لای. هیـچ کەسـێک خۆشەویسـتەکەی جێناهێڵێـت مەگـەر لەپێنـاو کەسـێکدا بێـت کـە خۆشەویسـتر بێـت لـە لای، یاخـود لە ترسـی شـتێکی تـردا بێـت. دڵ دەسـتبەرداری خۆشەویسـتی ساختـە و بێمانا دەبێـت لەپێنـاو خۆشەویسـتی ڕاسـتەقینەدا، یاخود لە ترسـی زیان

و حەرامدا.»

یەکێک لە گرفتە گەورەکانی ئێمە وەکو ئومەتی ئیسلام ئەوەیە کە پەیامبەرمان لە فەرموودەیەکدا پێمان دەفەرموێت: «الوهن»، (خۆشەویستی دونیا و ڕقلێبوونەوە لە مەرگ). دونیامان خۆش دەوێت، هەرکاتێک کەسێک، یاخود شتێکت خۆش بوێت، ئەستەم دەبێت بەسەر ئەو خۆشەویستییەدا زاڵ ببیت، یاخود لێی جودا ببیتەوە، تاکو دەکەویتە خۆشەویستی کەسێک، یاخود شتێکی باشترەوە. زۆر ئەستەم دەبێت خۆشەویستی ئەم دونیایە لە دڵەکانماندا دەربکەین، مەگەر شتێکی باشتر و بەهادارتر بدۆزینەوە بۆ شوێنگرتنەوەی.

کاتێک خۆشەویستییەکی بەهێزتر و باشترمان دۆزییەوە، ئاسان دەبێت دەستبەرداری خۆشەویستییەکەی تر ببین. کاتێک خۆشەویستی پەروەرێن و پەیامبەرەکەی و بەهەشتەکەی هەست پێ دەکرێت، دەتوانین بەسەر هەموو خۆشەویستییەکانی تردا زاڵ ببین. تاکو زیاتر ئەو خۆشەویستییە هەست پێ بکرێت، زیاتر دڵەکانمان داگیر دەکات. ئاسانتر دەبێت ئەگەر وتەکەی پەیامبەر ئیبراهیم پەیڕەو بکەین، ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾﴾ (سورەتی الانعام).

«ئەی پەیامبەر بە ئیمانداران بڵێ کە بەڕاستی نوێژ و حەج و ژیان و مردنم هەمووی لەپێناوی پەروەرێندایە کە پەروەرێنی هەموو جیهانەکانە.»

کەواتە دەستبەرداربوونی کەسەکان و شتەکان پەیوەستە بە خۆشەویستییەوە. خۆشویستنی کەسێک، یاخود شتێکی باشتر، خۆشویستنی شتە ڕاستەقینەکە و بینینی بەهەشت. ئەو کاتە واز دێنین لەوەی لە خانووە منداڵانەکەدا یاری بکەین.



## هاوسەرگیری سەرکەوتوو: پەیوەندییە لەبیرکراوەکە

تێبینی: ئەم بابەتە باس لە کەمترین ئاستی ڕێزگرتنی نێوان ژن و مێرد دەکات. دەستەواژەی ڕێزگرتن هیچ مانای قبوولکردنی چەوساندنەوەی جەستەیی و هەستی و دەروونی ناگرێتەوە. مانای سەبر و ئارامگرتن نییە بۆ قبوولکردنی چەوساندنەوەی خۆت و خێزانەکەت. پەروەردگار دەفەرموێت: "پەروەردگار نادادپەروەری خۆشناوێت و نابێت ئێوەیش نادادپەروەریتان خۆش بووێت."

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾﴾ (سورەتی الروم).

«یەکێک لە نیشانە و بەڵگەکانی خودای گەورە ئەوەیە کە لە خودی خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون بۆ ئەوەی هەست بە سوکنایی و ئارامی بکەن لە لایدا و لە نێوانتاندا خۆشەویستی و سۆز و میهرەبانی فەراهەم هێناوە. بەڕاستی نیشانە و بەڵگەی بەهێز هەیە لەمەدا بۆ ئەو کەسانەی بیر دەکەنەوە و تێدەفکرن.»

هەمووممان ئەم ئایەتەمان چەندین جار خوێندۆتەوە لە کاتی ڕاگەیاندنی هاوسەرگیرییەکاندا، بەڵام چەند کەس بەڕاستی پەیڕەوی کردووە؟ چەند ژن و مێرد ئەم خۆشەویستی و ڕەحمەی پەروەردگارمان باسی دەکات لە ژیانیاندا بەرجەستە دەکەن؟ گرفتەکە چییە کاتێک زۆرێک لە پەیوەندی هاوسەرگیری بە جیابوونەوە و تەڵاق کۆتایی دێت؟

بە پێی وتەی دکتۆر (ئێمیرسۆن ئێگریچس)ی نووسەری پەرتووکی (خۆشەویستی و ڕێز)، وەڵامەکە ئاسانە، خۆشەویستی ئەو شتەیە کە ئافرەت زۆرترین ئارەزووی لێیە، ڕێزگرتن ئەو شتەیە کە پیاو زۆر پێویستیەتی.

(ئێمیرسۆن) لە پەرتووکەکەدا ڕوونی دەکاتەوە، توێژینەوەکان ئاشکرایان کردووە کە پێویستیی سەرەکی پیاو بریتییە لە ڕێزگرتن، لە کاتێکدا پێویستیی سەرەکی ئافرەت بریتییە لە خۆشەویستی. باسی «پەیوەندی شێتانە» دەکات کە بریتییە لە ناکۆکی و دەمەقاڵێی نێوان ژن و مێرد، ئەم پەیوەندییە ڕوودەدات کاتێک ژن ڕێزی مێردەکەی ناگرێت و مێرد خۆشەویستی بۆ ژنەکەی دەرنابڕێت. هەروەها ڕوونی دەکاتەوە ڕێزگرتن و خۆشەویستی نێوان ژن و مێرد چەندە گرنگن و تەواوکەری یەکترن. بە مانایەکی تر، کاتێک ژنەکە هەست دەکات مێردەکەی خۆشەویستی دەرنابڕێت و هەست و سۆزی نابێت بۆی، ئەویش کاردانەوەی دەبێت و ڕێز لە مێردەکەی ناگرێت، ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوەی مێردەکە ساردوسڕ بێت بەرامبەر ژنەکەی و کەمتر خۆشی بوێت، یاخود هیچ خۆشەویستی نەبێت بۆی.

(ئێمیرسۆن) باسی چارەسەری ئەم «پەیوەندی شێتانەیە»

دەکات: بریتییە لەوەی ژنەکە ڕێزی مێردەکەی بگرێت، مێردەکەیش خۆشەویستی بۆ ژنەکەی دەرببڕێت. واتا نابێت ژنەکە بڵێت کە دەبێت سەرەتا مێردەکەی خۆشی بوویت پاشان ئەم ڕێزی لێ دەگرێت. وتنی ئەمە دەبێتە هۆی ڕەفتاری زیاتری دوور لە خۆشەویستی. نابێت مێردەکەیش بڵێت کە پێویستە سەرەتا ژنەکەی ڕێزی لێ بگرێت ئینجا ئەم خۆشەویستی بۆ دەردەبڕێت. وتنی ئەمە دەبێتە هۆی ڕەفتاری بێڕێزانەتر، واتا خۆشەویستی و ڕێزگرتنەکە دەبێت بێبەرامبەر و مەرج بێت.

کاتێک لەم چەمکی «خۆشەویستی و ڕێز»ـە تێفکرام، هەستم بەوە کرد کە بە ڕوانین لە قورئان و وتەکانی پەیامبەر هیچ دوو چەمکێکی تر نییە کە هێندە جەختی لەسەر کرابێتەوە لەبارەی پەیوەندی هاوسەرێتییەوە.

پەیامبەرمان بە پیاوان دەفەرموێت: **«اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ، فَإِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلَاهُ، إِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ، اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا»**

«زۆر باش ئاگاداری خێزانەکانتان بن، چونکە لە پەراسوو دروست کراون، چەماوەترین بەشی بریتییە لە بەشی سەرەوەی، دەشکێت، ئەگەر بتەوێت پاڵەپەستۆی لەسەر بکەیت و ڕاستی بکەیتەوە. بە چەماوەیی دەمێنێتەوە ئەگەر بە تەنها جێی بهێڵیت، بۆیە باش ئاگاداری خێزانەکانتان بن.» (متفق علیه).

هەروەها پەیامبەرمان زیاتر جەخت لەمە دەکاتەوە و دەفەرموێت: **«أَكْمَلُ الْمُؤْمِنِينَ إِيمَانًا أَحْسَنُهُمْ خُلُقًا وَخِيَارُكُمْ خِيَارُكُمْ لِنِسَائِهِمْ»** .

«باشترین باوەڕدار لە ڕووی باوەڕەوە ئەو کەسەیە کە باشترین ڕەفتاری هەیە. باشترینتان ئەو کەسانەن کە بە باشترین شێوە ڕەفتار لەگەڵ خێزانەکانیاندا دەکەن.» (رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ).

هەروەها فەرموویەتی: «**لَا يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً، إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ**».

«با هیچ پیاوێکی ئیماندار هاوسەرە ئیماندارەکەی نەبوغزێنێ، چونکە ئەگەر ڕەوشتێکی ئەوی بەدڵ نەبێت، شتێکی تری هەر بەدڵی دەبێت»، (رواه مسلم).

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَيَجْعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا ١٩﴾ (سورەتی النساء).

«بە میهرەبانییەوە لەگەڵیاندا بژین، چونکە ئەگەر ڕقتان لێیان بێت، ڕەنگە ڕقتان لە شتێک بێت کە پەروەردگار خێری تێبکات بۆتان.»

لەم وتە زێڕینانەدا پیاوان ئامۆژگاری کراون بەوەی میهربان و بەسۆز بن بەرامبەر ژنەکانیان. هەروەها هانیان دەدەن بەوەی چاوپۆشی لە کەموکوڕی ژنەکانیان بکەن کاتێک میهرەبانی و سۆزیان بۆ دەردەبڕن. لە لایەکی ترەوە کاتێک ئاماژە بە ژنەکە دەدەرێت، بابەتەکە جیاوازە. بۆچی هێندە جەخت نەکراوەتەوە لە ئافرەتان تاکو میهرەبان و بەسۆز بن بۆ مێردەکانیان؟ ڕەنگە لەبەر ئەوە بێت کە ئافرەتان بە سروشتی و فیتری خاوەن سۆز و خۆشەویستین. کەم پیاو هەیە سکاڵای ئەوە بکات ژنەکەی خۆشی ناوێت، بەڵام زۆرێک هەن سکاڵای ئەوە دەکەن ژنەکانیان ڕێزیان ناگرن. ئەمە لە قورئان و سووننەتدا زۆرترین جەختی لێ کراوەتەوە لەبارەی ژنانەوە.

ڕێزگرتن بە چەند شێوەیەک دەبێت، یەکێک لە گرنگترین شێوەکانی ڕێزگرتن بریتییە لە ڕێزگرتنی ئارەزووەکانی کەسێک. کاتێک کەسێک دەڵێت: «ڕێز لە ئامۆژگارییەکەت دەگرم.» مانای ئەوەیە کە «شوێنی ئامۆژگارییەکەت دەکەوم.» ڕێزگرتن لە سەرکردەیەک مانای ئەنجامدانی ئەو شتەیە کە دەیڵێت. ڕێزگرتنی

دایـک و بـاوکان مانـای ئەوەیـە دژی ئارەزووەکانیـان نەوەسـتینەوە. هەروەهـا ڕێزگرتـن لـە مێـرد مانـای ڕێزگرتنـە لـە ئارەزووەکانـی.

پەیامبـەر فەرموویەتـی: «**إذا صلت المرأة خمسها وصامت شهرها وحفظت فرجها وأطاعت زوجها قيل لها ادخلي الجنة من أي أبواب الجنة شئت.**»

«ئەگـەر ئافـرەت پێنـج نوێـژە فەرزەکـە ئەنجـام بـدات و مانگـی ڕەمـەزان بـەڕۆژوو بێـت و پارێزگاری لـە جەسـتە و داوێنـی بـکات و بەگوێـی مێردەکـەی بـکات، پێـی دەوترێـت: (بچـۆرە نـاو بەهەشـتەوە لـەو دەرگایـەوە کـە دەتەوێـت.)»، (الترمـزی).

بۆچـی ئێمـەی ئافرەتـان فەرمانمـان پـێ کـراوە ڕێـز لـە ویسـت و ئـارەزووی مێردەکانمـان بگریـن؟ چونکـە پیـاوان بەرپرسـیارێتییەکی زیاتریـان لەسـەر شـانە. پـەروەردگاری مـەزن دەفەرموێت: ﴿ٱلرِّجَـالُ قَوَّٰمُـونَ عَلَى ٱلنِّسَـآءِ بِمَـا فَضَّـلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُـمۡ عَلَىٰ بَعۡـضٖ وَبِمَـآ أَنفَقُـواْ مِـنۡ أَمۡوَٰلِهِـمۡۚ ٣٤﴾ (سـورەتی النسـاء).

«پیـاوان پارێـزەر و قەڵغـان و بژێوپەیداکـەرن بـۆ هاوسـەرەکانیان، چونکـە خـودای گـەورە هێـزی زۆری پێداون و هۆکارەکانـی بژێویـان بـۆ پەیـدا دەکـەن و پیـاوان لـە مـاڵ و سـامانەکانیان خـەرج دەکـەن.»

بەڵام ئایا ئەم ڕێزگرتنە بێمەرجەمان بەرامبەر مێردەکانمان ئێمەی ئافرەت ناخاتە بارێکی لاواز و ملکەچییەوە؟ ئایا خۆمان ناخەینە بارێکەوە کە سوودمان لێ وەربگرن و خراپ بەکارمان بهێنن؟ بە تەواوی پێچەوانەکەی ڕاستە. قورئان و پەیامبەر و توێژینەوەکانی سەردەم سەلماندویانە کە پێچەوانەکەی دروستە. تاکو ژن ڕێزی زیاتر لە مێردەکەی بگرێت، ئەوا مێردەکەی خۆشەویستی و میهرەبانی زیاتری بۆ دەردەبڕێت. لەڕاستیدا تاکو بێڕێزی زیاتر بنوێنێت بەرامبەر مێردەکەی، مێردەکەی ساردوسڕتر و توندتر و بێسۆزتر دەبێت.

بە هەمان شێوە ڕەنگە پیاوان بپرسن بۆچی دەبێت میهرەبانی و خۆشەویستی دەرببڕن بەرامبەر ژنەکانیان لە کاتێکدا ئەوان ڕێزیان ناگرن؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستە تەماشای نموونەی عومەری کوڕی خەتاب بکەین. کاتێک پیاوێک هات بۆ لای حەزرەتی عومەر لە سەردەمی خەلیفایەتیدا بۆ ئەوەی سکاڵا لە ژنەکەی بکات، گوێی لە ژنەکەی خەلیفە عومەر بوو بەسەر خەلیفە عومەردا هاواری دەکرد، پیاوەکە ڕووی وەرگێڕا تاکو بڕوات، خەلیفە عومەر بانگی پیاوەکەی کرد.

پیاوەکە بە خەلیفە عومەری وت، کە هاتبوو سکاڵا بکات لە بارەی هەمان کێشە کە خەلیفە هەیەتی. خەلیفە عومەر وەڵامی دایەوە کە ژنەکەی بەرگەی دەگرێت، جلەکانی دەشوات، ماڵ خاوێن دەکاتەوە، ئارامی دەکاتەوە و چاودێریی منداڵەکانی بۆ دەکات. ئەگەر ژنەکەی ئامادە بێت ئەو هەموو کارەی بۆ ئەنجام بدات، چۆن ئەم بەرگەی ناگرێت کاتێک دەنگی بەسەردا بەرز دەکاتەوە؟

ئەم چیرۆکە نموونەیەکی زۆر جوان پیشانی هەمووان دەدات، نەک تەنها پیاوان. ئەم چیرۆکە زۆر پڕ مانایە کە ئارامگرتن و بەرگەگرتنی کێشەکان ڕوون دەکاتەوە و زۆر گرنگە بۆ هاوسەرگیرییەکی سەرکەوتوو. لەگەڵ ئەوەیشدا بیر لەو پاداشتە بکەرەوە کە لە ڕۆژی دواییدا دەدرێت بەو کەسانەی ئارامگرن. پەروەردگار دەفەرموێت ﴿إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّـٰبِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ ۝١٠﴾ (سورەتی الزمر).

«بەڕاستی تەنها ئارامگران پاداشتی بێسنوور و بێئەندازە دەدرێنەوە.»

# نارەحەتییەکان

هەمیشە داوا لە پەروەردگارمان دەکەین چارەسەری نارەحەتییەکانمان بکات، بێئاگاین لەوەی نارەحەتییەکانمان ئەو شتانەن کە چارەسەرمان دەکەن.

## تاکە پەناگە لە کاتی زریاندا

هەرگیـز ئاسـان نییـە ڕابوەسـتیت کاتێـک زریـان ڕوودەدات. کاتێک بـاران دەبارێت و هەورەتریشقە بەدوایدا دێت. پەڵە هـەوری ڕەش شـوێنی خۆرەکـە دەگرێتـەوە، تاکـە شـتێک ببینـی بریتییـە لـە شـەپۆلەکانی زەریاکـە کـە دەورت دەدەن. چیـدی ناتوانیـت ڕێگەکـەت بدۆزیتـەوە و هـاوکاری بەدەسـت بهێنیـت.

دەسـت دەکەیـت بـە بانگکردنـی پاسـەوانی کەنارەکـە، بـەڵام هیـچ وەڵامێک نابێت. هـەوڵ دەدەیـت ئاراسـتەی بەلەمەکـە بگۆڕیت، بـەڵام سـوودی نییـە. چـاو دەگێڕیت بۆ بەلەمی فریاگوزاری، بەڵام ڕۆیشـتووە و لـەو شـوێنە نییـە. دەتەوێـت چاکەتێکـی سـەلامەتی بـەکار بهێنیـت، بـەڵام دڕاوە و بێسـوودە. دوای ئـەوەی هەمـوو هۆکارەکانـت تاقـی کـردەوە، سـەر بـەرز دەکەیتـەوە و داوا لـە پەروەردگار دەکەیت. لەگەڵ ئەوەیشـدا شـتێکی زۆر تایبـەت هەیە لە بارەی ئەم چرکەسـاتەوە. لـەم نمونەیـەدا هەسـت بـە یەکتاپەرسـتی (تەوحیـدی) ڕاسـتەقینە دەکەیـت.

لـە کەنـاری دەریاکـەدا ڕەنگـە داوات لـە پەروەردگار کردبێت، بەڵام دواتـر چەندیـن شـتی تـرت بـۆی کردۆتـە هاوبـەش. ڕەنگـە پشـتت بـە پـەروەردگار بەسـتبێت، بـەڵام پشـتت بـەو بەسـتووە لەگـەڵ چەندیـن

شتی تردا. لەم چرکەساتەدا هەموو شتەکانی تر و دەرگاکانی تر بە ڕووتدا داخراون. هیچ شتێکی تر نییە داوای هاوکاری لێ بکەیت، هیچ شتێکی تر نییە پشتی پێ ببەستیت جگە لە پەروەردگار.

ئەمەیش باسەکەیە ئایا تا ئیستا پرسیوتە بۆچی کاتێک زۆر لە تەنگانەدایت هەموو دەرگاکان کە ڕووی تێدەکەیت بە داخراوی دەمێنێنەوە؟ لە دەرگایەک دەدەیت، بەڵام بە ڕووتدا دادەخرێت. ڕوو لە دەرگایەکی تر دەکەیت، ئەویش داخراوە. لەم دەرگاوە دەڕۆیت بۆ ئەو دەرگا و لە دەرگا دەدەیت، بەڵام هیچی ناکرێتەوە. تەنانەت ئەو دەرگایانەی کە پێشتر پشتت پێ دەبەستن لەناکاو دادەخرێن، بۆچی؟ بۆچی ئەوە ڕوو دەدات؟ ئێمەی مرۆڤ چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراومان هەیە کە پەروەردگارمان خۆی باش دەیزانێت.

بەردەوام پێویستیمان بە کەسان و شتانی ترە. لاواز نین، بەڵام زۆر پەلە و بێئارامین. کاتێک لە کێشەداین، ناچار دەکرێین بە دوای یارمەتیدا بگەڕێین، ئەوە شێوازی خوڵقاندنی ئێمەیە. بۆچی بە شوێن پەناگەدا دەگەڕێین ئەگەر خۆرەتاو و خۆش بێت؟ چی دەبێت کاتێک کەسێک بە دوای پەناگەدا دەگەڕێت؟ کاتێک کە زریانەکە هەڵی کردبێت. بۆیە پەروەردگار زریانەکە دەهێنێت. وادەکات پێویستمان پێی بێت لە ڕێی باردۆخێکی خوڵقێنراوەوە تاکو ناچار بین بە دوای پەناگەدا بگەڕێین. کاتێک بە دوای یارمەتیدا دەگەڕێین بەهۆی نائارامی و پەلەییمانەوە،

لەو شتانەدا بەدوایدا دەگەڕێین کە لێمانەوە نزیکن و ئاسانن. لەو شتانە دەگەڕێین کە دەتوانین بیبینین و بیبیستین و دەستی لێ بدەین. بە دوای ڕێگایەکی کورتتردا دەگەڕێین، داوای یارمەتی لە خوڵقێنراوەکان دەکەین، تەنانەت بە خۆیشمانەوە. بەدوای یارمەتیدا دەگەڕێین لەو شتەی کە نزیکترینە لێمانەوە، ئایا ئەم ژیانی دونیایە

بـە تـەواوی بـەو شـێوەیە نییـە؟ چـی شـتێک نزیـک دیـارە؟ وشـەی (دونیـا) خـۆی مانـای (ئـەو شـتەی نزمتـرە) دێت. دونیـا ئـەو شـتەیە کـە نزیکترینـە، بـەڵام ئـەوە تەنهـا خەیاڵێکـە. شـتێکی نزیکتـر هەیـە، بـۆ سـاتێک بیـر لـە نزیکتریـن شـت لـە خۆتـەوە بکـەرەوە. ئەگـەر ئـەم پرسیارە بکرێت زۆرێـک دەڵێـن دڵ و خـودی خۆمـان نزیکتریـن، بـەڵام پـەروەردگار دەفەرموێت: (﴿وَلَقَـدْ خَلَقْنَـا ٱلْإِنسَـٰنَ وَنَعْلَـمُ مَـا تُوَسْـوِسُ بِـهِۦ نَفْسُـهُۥ ۖ وَنَحْـنُ أَقْـرَبُ إِلَيْـهِ مِـنْ حَبْـلِ ٱلْوَرِيـدِ ﴿١٦﴾﴾ (سـورەتی ق).

«سـوێند بـە پەروەرێن بێگومـان ئێمـە مرۆڤمـان خولقاند و دەزانین چـی بـە دڵ و دەروونیـدا دێت. ئێمـە لـە شـاڕەگی دڵـی لێـی نزیکتریـن.» لـەم ئایەتـەدا پـەروەردگار دەزانێـت ململانێکانمـان چییـە. ئاراميیـەک هەیـە لـەوەی کەسـێک لەبـارەی ململانێکانمانـەوە بزانێـت. دەزانێـت نەفسـی خۆمـان چـی بـە خۆمـان دەڵێـت. بـەڵام پـەروەردگار نزیکتـرە لـە خۆمـان و ئـەوەی داوای هـاوکاری لـێ دەکەیـن. پەروەردگارمـان نزیکتـرە لـە مولوولـە خوێنەکانمـان.

بۆچـی مولوولـەی خوێـن؟ چـی شـتێکی گرنـگ هەیـە لەبـارەی ئـەم بەشـەی جەسـتەمانەوە؟ مولوولـە خوێنـەکان گرنگتریـن خوێنهێنـەرن بـۆ دڵ. ئەگـەر مولوولەکانـی خوێنێکـی بنەڕەتـی بریـندار بێـت، ڕاسـتەوخۆ دەمریـن. بـە کورتییەکـەی ژیانمـان پەیوەسـتە بـە مولوولـە خوێنەکانمانـەوە، بـەڵام پـەروەردگار نزیکتـرە لـە مولوولـە خوێنەکانمـان. پـەروەردگار لـە ژیانمـان نزیکتـرە لێمانـەوە، لـە خـودی خۆمـان و نەفسـمان نزیکتـرە. پـەروەردگار لـە گرنگتریـن ڕێـڕەوی دڵەکانمـان نزیکتـرە. لـە ئایەتێکـی تـردا دەفەرموێـت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَـا ٱلَّذِيـنَ ءَامَنُـوا۟ ٱسْـتَجِيبُوا۟ لِلَّهِ وَلِلرَّسُـولِ إِذَا دَعَاكُـمْ لِمَـا يُحْيِيكُـمْ ۖ وَٱعْلَمُـوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُـولُ بَـيْنَ ٱلْمَـرْءِ وَقَلْبِـهِۦ وَأَنَّـهُۥٓ إِلَيْـهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾﴾ (سورەتی الانفال).

«ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە، بـە دەم بانگەوازەکـەی پـەروەردگار و پەیامبـەرەوە بچـن، کاتێک بانگتـان دەکات بۆ بەرنامـە و ڕێبازێک کە دەتانژێنێتـەوە و ژیـان بەخشـە، چـاک بزانـن پـەروەردگار دەتوانێـت دەسـەڵاتی بکەوێتـە نێـوان مـرۆڤ و ئاواتەکانـی دڵییـەوە. بیرتـان نەچێـت بەڕاسـتی هـەر بـۆ لای ئەویـش کـۆ دەکرێنـەوە.»

پەروەرێـن دەزانێـت و زانایـە بـەوەی نەفـس و دڵمـان هەیـە و دەزانێـت ئـەم شـتانە هانمـان دەدەن. لەگـەڵ ئەوەیشـدا پـەروەردگار دەفەرمـوێ کـە ئـەو نزیکتـرە لـە نەفـس و دڵیشـمان. کاتێـک داوای یارمەتی لـە شـتێکی تـر دەکەیـن جگـە لـە پەروەرێن، نـەک تەنهـا داوای یارمەتـی لـە شـتێکی لاوازتـر دەکەیـن، بەڵکـوو داوای یارمەتـی لـە شـتێکی نزیکتـر دەکەیـن بـەڵام دوورتـرە لێمانـەوە.

ئەمـە سروشـتی ئێمـەی مرۆڤـە کـە پـەروەردگاری مـەزن و باڵادەست باشـتر زانایـە پێی، هـەر خـۆی پارێزگاریمـان لـێ دەکات و دەمانهێنێتـەوە سـەر ڕێ بەهـۆی داخسـتنی هەمـوو دەرگاکان لـە کاتـی زریانەکـەدا.

پـەروەردگار دەزانێت لـە پشـتی هـەر دەرگایەکی داخـراودا، خزانێک هەیـە، دەکەویـن ئەگـەر بچینـە ژوورەوە. بـە ڕەحـم و بەزەیـی خـۆی ئەو دەرگا هەڵانـە بە ڕوومانـدا دادەخـات، لـە ڕەحـم و بەزەیـی خۆیـدا زریانێـک دەهێنێـت تاکـو داوای یارمەتـی لـێ بکەیـن، کاتێـک دەزانێـت وەڵامێکی هەڵەمـان دەبێـت، چەنـد بژاردەیەکمـان دەداتـێ لەگـەڵ یـەک بـژاردە بـۆ هەڵبژاردنـی وەڵامـە ڕاسـتەکە. ناڕەحەتییـەکان خۆیـان ئاسـانن، بـە لابردنـی هەمـوو پاڵپشـتییەکان و بـژاردەکان، پـەروەردگار تاقیکردنەوەکەمان ئاسـان دەکات. هەرگیز ئاسـان نییە بوەسـتیت کاتێک زریانەکـە ڕوودەدات. لـە ڕێـی هەڵکردنـی بـا و زریانـەوە پـەروەردگار دەمانخاتـە سـەر ئەژنـۆ: هەمـان شـێوازی وەسـتان بـۆ نوێـژ.



## بینینی ماڵی خۆت لە بەهەشتدا:
## لە گەڕان بۆیارمەتی ئیلاهی

چیرۆکێک دەزانم، بەڵام تەنها چیرۆکی ڕووت و خورافی نییە. باس لە ئافرەتێک دەکات کە دەستبەرداری خۆشیی ئەم دونیایە بوو لەپێناو شتێکی باڵاتردا. ئافرەتێک بوو هەرگیز ڕێگەی بە خۆی نەدا باردودۆخ بە ئازارەکانی سنووورداری بکەن. بیروباوەڕێکی زۆر پتەوی هەبوو و ئامادە بوو لەپێناویدا بمرێت. ئەو شاژنێک بوو، بەڵام بە کۆشک و تاج فریوی نەخوارد. فریوی نەخوارد بە کۆشکەکەی ئەم دونیای، بەڵکوو تەماشای کۆشکەکەی دونیای ئاخیرەتی دەکرد. ئەمە بۆ ئاسیای خێزانی فیرعەون تەنها ئارەزوویەک نەبوو، بەڵکوو بە چاوی سەر کۆشکەکەی لەو دونیادا بینی. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱمْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ٱبْنِ لِي عِندَكَ بَيْتًا فِي ٱلْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِن فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِۦ وَنَجِّنِي مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ١١﴾ (سورەتی التحریم).

«پەروەردگار نموونەی هێناوەتەوە بە هاوسەرەکەی فیرعەون بۆ ئەوانەی باوەڕدارن، کاتێک خێزانەکەی فیرعەون وتی: پەروەردگارا لە لای خۆت لە بەهەشتدا ماڵێکم بۆ دروست بکە و لە فیرعەون و کارە

خراپەکانی و قەومی زاڵمان ڕزگارم بکە»، چەندین جار گوێبیستی چیرۆکەکەی ئاسیا بووم، هەموو جارێک کاریگەری دەکردە سەرم، بەڵام دوایین جار زۆر کاریگەری تێکردم و هەژاندمی.

چەند مانگێک لەمەوبەر تووشی تاقیکردنەوەیەکی سەخت بووم. بەڕاستی شتێکی بەهادارە کاتێک ڕۆحێکی ئیماندار و فریشتەئاسات دەبێت وەک هاوڕێکەت. کاتێک لە ناڕەحەتیدایت، تەنها نامەیەک، پۆستێکی فەیسبووک و ئیمێڵێک بۆ سوهەیب وێب لیستسێرڤ بەسە تاکو دەستەیەک ڕۆحی پاک و جوان نزات بۆ بکەن، سبحان اللـه.

منیش داوای گەورەترین خەڵاتم کرد کە هەمووان دەتوانن پێشکەشی یەکتری بکەن. داوای نزای دڵسۆزانەم کرد، بەڵام ئەوەی بە دەستم گەیشت تەواو سەرسامی کردم. هەرگیز ئەو خەڵاتەی پەروەردگار لە یاد ناکەم، خەڵکی لە شەونوێژدا نزایان بۆ دەکردم، لە کاتی وەستان بەرامبەر کەعبە، لە سەفەر و تەنانەت لە ساتی منداڵبووندا چەندین نزام پێ گەیشت، یەکێکیان زۆر کاری تێ کردم، تەنها نامەیەکی ئاسایی بوو کە نوسرابوو: «پەروەردگار ماڵی خۆتت لە بەهەشتدا پیشان بدات، تاکو هەموو ناڕەحەتییەکان لەسەر شانت ئاسان بن.»

خوێندمەوە و زۆر کاری تێکردم. پاشان چیرۆکی ئاسیام بیر هاتەوە، هەستم بە شتێکی سەرنجڕاکێش کرد. ئاسیا لەژێر سەختترین و بەئازارترین سزادا بوو کە تاکو ئێستا خەیاڵ کرابێت. فیرعەون زۆردارترین کەسی سەر زەوی بوو، ئەو تەنها فەرمانڕەوایەک نەبوو بەسەر ئاسیاوە، بەڵکوو مێردی ئاسیابوو، لە ساتەکانی کۆتایی ژیانیدا، فیرعەون توندترین سزای دا، بەڵام شتێکی سەیر ڕوویدا، ئاسیا خەندەیەکی کرد.

ئاسیا بە ناڕەحەتترین ساتدا تێدەپەڕی، بەڵام خەندەی دەکرد، چۆن ئەوە دەگونجێت؟ چۆن دەکرێت سزا بدرێت، بەڵام زەردەخەنە بکات؟ کاتێک تووشی جەنجاڵی ڕێگەوبان دەبیت، یاخود کەسێک بە شێوەیەکی سەیر تەماشامان دەکات، ناتوانیت بەرگەی بگریت، چۆن پەیامبەر ئیبراهیم (سەلامی خوای لەسەربێت) تووشی گەورەترین کارەسات بوو، بەڵام ئاگرەکە سارد بوویەوە بۆی. بۆچی هەندێ کەس هیچ شتێکیان نییە، بەڵام هەرگیز سکاڵا ناکەن، بەڵام ئەوانی تر خاوەنی هەموو شتێکن و بەردەوام سکاڵا دەکەن؟ چۆن دەکرێت زیاتر ئارام بین لە کاتی ململانێ سەختەکانی ژیان بە بەراورد بە کێشە بچووکەکانی ڕۆژانە؟

دەزانم کارەساتەکان ناڕەحەتن، چونکە هەندێ شت بە شێوەیەکی سروشتی سەختە بەرگەگرتنی. هەستم دەکرد لیستێکی سەرەکی هەیە بۆ ناڕەحەتییەکان. بۆ نموونە مردنی کەسێکی خۆشەویستت هەمیشە سەختترە بە بەراورد بە جەنجاڵی ڕێگەوبان. تەواو ڕوون و ئاشکرایە، بەڵام هەڵەشە. کارەساتەکان سەخت نین بۆ بەرگەگرتن تەنها لەبەر ئەوەی کارەساتەکان خۆیان ناڕەحەتن. پێوانەکردنی سەختی یاخود ئاسانی ناڕەحەتییەکان جیاوازن و بە پێوانەیەکی نادیار پێوانەدەکرێن. هەرشتێک لەم ژیانەدا تووشی دەبم ئاسان، یاخود ناڕەحەت نییە لەبەر ئەوەی خۆی ئاسانە، یاخود سەخت.

سەختی و ئاسانی گرفتەکان و ناڕەحەتییەکان تەنها پەیوەستە بە ڕێژەی یارمەتی خوداییەوە. هیچ شتێک ئاسان نییە مەگەر پەروەردگار ئاسانی بکات بۆم. هیچ جەنجاڵییەکی ڕێگەوبان و بڕینی کاغەز سەخت نییە، هیچ شتێک سەخت نییە ئەگەر پەروەردگار ئاسانی بکات بۆم، بۆ نموونە نەخۆشی، مردن، خستنە ناو ئاگر و سزادان لە لایەن زۆردارێکەوە.

(ابن عطاء الله السكندەری) فەرموویەتی: «لا يتوقف و يحبس أمر طلبته بربك، و لا ستيسر و يسهل أمر طلبته بنفسك.»

«هیچ شتێک سەخت نییە ئەگەر لە خوداوە داوا بکەیت، هیچ شتێک ئاسان نییە ئەگەر لە چاوی خۆتەوە داوای بکەیت.»

پەیامبەر ئیبراهیم هەڵدرایە نێو ئاگرەوە، پشتیوان بە پەروەرێن کەسمان تووشی ئەم جۆرە تاقیکردنەوەیە نابین لەم ژیانەدا، بەڵام هیچ کەسێک نییە لەم ژیانەدا نەکەوێتە نێو ئاگری هەستی و دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە، وا بیر مەکەوە کە پەروەردگار ناتوانێت ئەم جۆرە ئاگرانە سارد بکاتەوە بۆمان.

ئاسیا سزای جەستەیی دەدرا، بەڵام پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات کۆشکەکەی لە بەهەشتدا پێشان دا، بۆیە زەردەخەنەیەکی کرد. چاوەکانمان لەم ژیانەدا بەهەشت نابینن، بەڵام ئەگەر پەروەردگار ویستی لەسەر بێت، بە چاوی دڵ بەهەشت دەبینین. ئەو نارەحەتییە ئاسان دەبێت بۆمان، ڕەنگە ئێمەیش بتوانین لەو ساتانەدا خەندە بکەین. کێشەکە لە تاقیکردنەوەکەدا نییە، لە برسێتی، یاخود سەرماکەدا نییە، کێشەکە لەوەدایە ئایا ئەو یارمەتییەمان دەست دەکەوێت لە کاتی برسێتی و سەرماکەدا؟ ئەگەر یارمەتییەکە بەدەست بهێنین، ئەوا برسێتی و سەرمامان تووش نابێت و ئازاریان نابێت. کێشەکە لەوەدایە برسی ببینین و خواردنمان نەبێت، کێشەکە کاتێکە شەپۆلی بەفر بێت و پەناگەیەکمان نەبێت.

پەروەردگار تووشی بەلامان دەکات تاکو پاک ببینەوە و بەهێز بین و بگەڕێینەوە بۆ لای پەروەردگار. دڵنیابە پەروەردگاری باڵا لە کاتی برسێتی و تینوویەتی و سەرمادا، خواردن و ئاو و پەناگەمان پێ دەدات. پەروەرێنمان تاقیمان دەکاتەوە، بەڵام ئارامگرتن و قەناعەتمان پێ دەبەخشێت تاکو بەرگەی بگرین.

پەروەردگار حەزرەتی ئادەمی نارده سەر زەوی تاکو ڕووبەڕووی بەلا و کارەساتەکان ببێتەوە، هەروەها بەڵێنی هاوکاری و پاڵپشتی خۆی پێ دا. پەروەردگاری مەزن دەفەرموێت: ﴿قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾﴾ (سورەتی طه).

«پەروەرێن فەرمانی دا و وتی: ئیتر هەردووکتان لە بەهەشت دابەزن، هەندێکتان دەبنە دوژمنی هەندێکتان، جا ئەگەر هیدایەت و ڕێنموویی من بۆ ئێوە هات، ئەوەی شوێنی بەرنامەکەم بکەوێت، نە گومڕا دەبێت، نە ناخۆشی و ناڕەحەتی و ناسۆری دێتە ڕێی.»

یەکێک لە نزا بەچێژەکان لە لامْ نزاکەی پەیامبەری ئیسلامە لە تائیف، پەیامبەر خوێناوی بوو و هەموو جەستەی بە برین داپۆشرابوو، داوای یارمەتی لە پەروەرێن کرد: **"أَعُوذُ بِنُورِ وَجْهِكَ الَّذِي أَشْرَقَتْ لَهُ الظُّلُمَاتُ وَصَلُحَ عَلَيْهِ أَمْرُ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ".**

«پەنادەگرم بە نووری خۆت کە هەموو تاریکییەکان لەناو دەبات و هەموو کاروبارەکانی ئەم دونیایە و دونیای دوایی بەهۆوە ڕێک دەخرێت».

لە ڕاستیدا پەروەردگار ئەو کەسانە تاقی دەکاتەوە کە خۆشی دەوێنن و بە گوێرەی ئاستی باوەڕەکەمان تاقیمان دەکاتەوە. هەروەها هاوکاری و پاڵپشتی خۆیشی دەنێرێت بۆمان تاکو تاقیکردنەوەکە لە سەرمان ئاسان بکات و ئاگرەکە سارد بکاتەوە. پەروەردگار یارمەتیمان دەدات و پریشکی نوور و بەهەشتەکەی دەتوانێت خەندە بخاتە سەر ڕووخسارمان تەنانەت کاتێک کە لە ناوەڕاستی بڵێسە و گڕی بەلاکەداین.



## کەسانی دی ئازارمان دەدەن:
## چۆن بەرگە بگرین و چاک ببینەوە؟

کاتێک گەورە دەبووم، جیهان شوێنێکی کامڵ و بێ کەموکوڕی بوو، بەڵام کێشەکە لەوەدا بوو کە بەو شێوەیە نەبوو. لەو بڕوایەدا بووم هەموو شتەکان دادپەروەرانە دەبن. مانای ئەوە بوو کەس هەڵەی بەرامبەر ناکرێت، ئەگەر هەڵەیەک بکرێت، پێویستە دادپەروەری پەیڕەو بکرێت. زۆر جەنگام تاکو شتەکان بەو شێوەیە بن کە باوەڕم پێی هەبوو، شتێکی بنچینەیم لە بارەی ئەم ژیانەوە لە بیر کرد، ئەوەی لە منداڵیمدا تێنەدەگەیشتم لەوەی ئەم جیهانە لە بنەڕەتدا ناتەواو و کەموکوڕە.

ئێمەی مرۆڤ لە بنەڕەتدا ناتەواو و ناکاملین، بۆیە هەمیشە هەڵە دەکەین. ئەم هەڵانەیشمان ئەوانی دی ئازار دەدات جا پێی بزانین یاخود نا، بە مەبەست بێت، یاخود بێ مەبەست. جیهان هەمیشە دادپەروەر نییە، مانای ئەوە نییە لە جەنگان دژی نادادپەروەری بوەستین، یاخود دەستبەرداری ڕاستییەکان بین. بە دڵنیاییەوە بەو شێوەیە نییە. واتا نابێت خۆمان وابەستەی ئەم جیهانە و کەسانی دی بکەین، ئەمە کارێکی ئاسان نییە. چۆن لە جیهانێکدا بژین کە

پڕ هەڵەیە، لە جیهانێکدا کە خەڵکی نائومێدمان دەکەن، تەنانەت خێزانەکانی خۆمان دڵمان دەڕەنجێنن؟ لە هەمووی سەختتر ئەوەیە چۆن فێر بین لەو کەسانە خۆش بین کە هەڵەیان بەرامبەر کردووین؟

چۆن بە بەهێزی بمێنینەوە بەبێ ئەوەی ڕەق بین، بە نەرمی بمێنینەوە بێ ئەوەی لاواز بین؟ چی کاتێک وابەستە دەبین، چی کاتێک دەستبەردار دەبین؟ کەی زۆر گرنگیدان دەبێتە زۆر گرنگیدان؟ ئایا هیچ شتێک هەیە لەوە زیاتر بێت کە پێویستە خۆشمان بوێت؟ بۆ دەستکەوتنی ئەم وەڵامانە دەبێت سەرەتا لە ژیانی خۆمان دەربچین.

دەبێت سەرنج بدەین ئایا یەکەم کەسین یاخود کۆتا کەس کە هەڵەمان بەرامبەر دەکرێت، یاخود هەست بە ئازار دەکەی؟ پێویستە سەرنج لەو کەسانە بدەین کە لە پێش ئێمەوە هاتوون و لێکۆڵینەوە لە ململانێکانیان و سەرکەوتنەکانیان بکەین. دەبێت بزانین ئەو گەشەسەندنە هەرگیز بێئازار نابێت، سەرکەوتن بەرهەمی ململانێکانە. ململانێکە هەمیشە زاڵبوون و بەرگەگرتنی ئەو ئازارانە لەخۆ دەگرێت کە لە لایەن کەسانی ترەوە تووشمان دەبن. نموونە درەوشاوەکانی پەیامبەرەکانمان دەهێنینەوە تاکو بزانین ئازارەکانمان بە تەنها نین. لە یادت بێت پەیامبەر نوح بۆ ماوەی (٩٥٠ ساڵ) لە لایەن گەلەکەیەوە چەوسێندرایەوە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبُوا عَبْدَنَا وَقَالُوا مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ۝٩ فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ ۝١٠﴾ (سورەتی القمر).

«پێش ئەمانیش قەومی نوح بڕوایان بە بەندەی بەڕێزی ئێمە نەکرد و وتیان: شێتە، زۆریش پیاهەڵخشان و دژایەتی کرا (٩) ئەویش هانا و هاواری بۆ پەروەردگاری برد و وتی: پەروەردێنم بەڕاستی من شکستم خواردووە و سەرکەوتنم پێ ببەخشە (١٠)».

یاخود بیخەینەوە یادمان چۆن پەیامبەرمان موحەممەد بەردباران

کرا تاکو خوێنی لێ چۆڕا، چۆن هاوەڵان لێیان دەدرا و برسی دەکران. هەموو ئەم ئازارانە بەهۆی کەسانی ترەوە بوو. تەنانەت فریشتەکان لەم سیفەتەی مرۆڤ تێگەیشتوون پێش ئەوەی بیبینە بوون، کاتێک پەروەردگار بە فریشتەکانی فەرموو کە دەیەوێت مرۆڤ دروست بکات، یەکەمین پرسیاری فریشتەکان لەبارەی ئەم توانا بەئازارەی مرۆڤەوە بوو.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ (سورەتی البقره).

«پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: بەڕاستی دەمەوێت لە زەویدا جێنشینێک دابنێم. فریشتەکان وتیان: ئایا کەسێکی تێدا دەکەیتە جێنشین کە خراپە و تاوانی تێدا بچێنێت و خوێنرێژی تێدا ئەنجام بدات؟ لەکاتێکدا ئێمە تەسبیحات و سوپاس و ستایشت دەکەین و قەدر و ڕێزی تۆ چاک دەزانین و بە دوورت دەگرین لەو شتانەی شایستەی تۆ نین؟ پەروەردگار فەرمووی: بێگومان ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.»

ئەم توانایەی مرۆڤەکان بۆ ئەنجامدانی تاوانی قێزەون دژی یەک ڕاستییەکی دڵتەزێنی ئەم ژیانەیە، بەڵام زۆرێک لە ئێمە ڕەحممان پێ کراوە، زۆرێک لە ئێمە تووشی ئەم جۆرە بەڵایانە نابین کە کەسانی پێش ئێمە بەرگەیان گرتووە.

زۆرێک لە ئێمە خێزانەکانمان نابینین لەژێر ئازار و ئەشکەنجە و هەڕەشەی کوشتندا بن. هەندێک لە ئێمە تاکو ئێستا بە هیچ شێوەیەک لە لایەن کەسانی ترەوە ئازار نەدراوە. هەرچەندە زۆرێکمان پێویست ناکات بزانین لەبرسامردن یاخود بێکەسبوون چۆنە کاتێک ماڵەکانمان

وێران دەکرێن، زۆرێکمان دەزانین چۆنە کاتێک لە دڵێکی بریندارەوە هاوار دەکەیت. ئایا دەکرێت لەمە ڕزگارت ببێت؟ تاڕادەیەک بەڵێ، دەکرێت ڕزگارت ببێت.

هەرگیز ناتوانین لە هەموو ئازارەکان ڕزگارمان ببێت، بەڵام لە ڕێگای ڕێکخستنەوەی چاوەڕوانی و کاردانەوە و گرنگیدانمانەوە دەتوانین لە تێکشکانی زیاتر ڕزگارمان ببێت. بۆ نموونە بوونی متمانەی تەواو و پشتبەستن و هیوامان بە کەسانی تر کارێکی تەواو گەمژانەیە. پێویستە لە بیرمان بێت مرۆڤەکان شایستەی هەڵەکردنن، بۆیە دەبێت متمانە و پشتبەستن و هیوای تەواومان تەنها بە پەروەردگار بێت. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ۝٢٥٦﴾ (سورەتی البقره).

«هیچ زۆرلێکردن و ناچارکردنێک لە وەرگرتنی بیروباوەڕی ئیسلامدا نییە، چونکە بەڕاستی ڕێبازی چاک و دروست ڕوون و ئاشکرا بووە و جیابۆتەوە لە گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە تاغوت (ڕێگە و ڕێبازی لادان) و باوەڕی دامەزراو بێت بە پەروەردگار، بێگومان ئەو کەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە کە هیچ هەڵوەشانەوە و لەناوچوونێکی بۆ نییە، پەروەرێنی مەزن بیسەر و زانایە.»

بە زانینی ئەوەی پەروەردگار تاکە پاڵپشتییەکە کە هەرگیز ناشکێت، ڕزگارمان دەبێت لە نائومێدی زیاتر. مانای ئەوە نییە کە نابێت کەسمان خۆش بوێت، یاخود کەم خۆشمان بوێت، بەڵکوو شێوازی خۆشەویستییەکە گرنگە. نابێت خۆشەویستی تەواومان

بدەین بە هیچ کەس و شتێک جگە لە پەروەردگار. نابێت هیچ کەس و شتێک لە دڵەکانماندا گرنگتر و بایەخدارتر بێت لە پەروەردگار. نابێت بە هیچ شێوەیەک خۆشەویستیمان بۆ کەسانێک و شتانێک هەبێت جگە لە پەروەردگار بە ڕادەیەک کە نەتوانین بێ ئەو هەڵبکەین و بژین. ئەمە خۆشەویستی نییە، بەڵکوو پەرستنە و هیچ ئەنجامێکی نابێت جگە لە ئازار.

چی دەبێت کاتێک هەموو ئەوانەمان ئەنجام دا و هێشتا لە لایەن کەسانی ترەوە ئازار دراین و خراپەمان بەرامبەر کرا وەک ئەوەی هەمیشە ڕوو دەدات؟ چۆن دەتوانین نارەحەتترین کار ئەنجام بدەین؟ چۆن دەتوانین فێری لێبوردن ببین؟ چۆن دەتوانین برینەکانمان سارێژ بکەین و بەردەوام بین لە باشبوون بەرامبەر خەڵکی تەنانەت ئەگەر ئەوان باش نەبن بۆمان؟

چیرۆکی خەلیفە ئەبوبەکری صدیق نموونەیەکی جوانی ئەمە دەردەخات. دوای ئەوەی عائیشەی کچی بە ناشرینترین شێوە بوختانی بۆ کرا، ئەبوبەکری صدیق ئەو کەسەی دۆزییەوە کە سەرچاوەی بوختانەکە بوو، ئەو کەسە (مسطح)ی ئامۆزای ئەبوبەکر بوو، ئەبوبەکر بەردەوام بارمەتی دارایی پێشکەش دەکرد. وەک سیفەتی سروشتی هەر مرۆڤێکی تر، ئەبوبەکر هاوکارییە داراییەکەی بۆ (مسطح) ڕاگرت کە پێشتر پێی دەبەخشی. دوای ماوەیەک پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿وَلَا يَأْتَلِ أُوْلُوا۟ ٱلْفَضْلِ مِنكُمْ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤْتُوٓا۟ أُو۟لِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱلْمُهَٰجِرِينَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَلْيَعْفُوا۟ وَلْيَصْفَحُوٓا۟ ۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾﴾ (سورەتی النور).

«با سوێند نەخۆن ئەوانەتان کە خاوەنی چاکە و سەروەت و سامانن کە چاکە نەکەن بەرامبەر خزمان و هەژاران و کۆچبەرانی ڕێگەی پەروەردگار، با لێبووردە بن و چاوپۆشی بکەن، ئایا حەز

ناکەن پەروەردگار لێتان ببورێت، پەروەردگار هەمیشە لێخۆشبوو و میهرەبانە.»

کاتێک ئەبوبەکر ئەم ئایەتەی بیست بڕیاری دا هەوڵ بۆ لێخۆشبونی ئیلاهی بدات، بۆیە نەک تەنها لە بەخشینی پارە بە پیاوەکە بەردەوام بوو، بەڵکوو زیاتر لە پێشووتری پێ دەبەخشی. ئەم جۆرەی بەخشین لە ناخی دڵی باوەڕداردایە. پەروەردگاری خاوەن دەسەڵات لە ستایشی ئەم جۆرە باوەڕدارەدا دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ﴿٣٧﴾﴾ (سورەتی الشوری).

«ئەوانەی خۆیان لە تاوانی گەورە و ناشرین دەپارێزن، کاتێک کە تووڕە دەبن لەسەر هەڵەیەک کە بەرامبەریان دەکرێت، هەر ئەمان چاوپۆشی دەکەن و لێدەبوورن.»

توانای بەخشین پێویستە بەهۆی هۆشیاریمان لە هەڵەکان و کەموکوڕییەکانمانەوە بەرامبەر کەسانی تر بێت. زۆربەمان دەبێت بزانین ڕۆژانە هەڵە بەرامبەر پەروەرێنمان دەکەین کاتێک تاوان ئەنجام دەدەین. ئێمە چین بە بەراورد بە پەروەردگاری مەزن؟ پەروەرێنی خاوەن گەردوون شەو و ڕۆژ دەمانبەخشێت. ئێمە کێین تاکو کەسانی تر نەبەخشین؟ ئەگەر بمانەوێت پەروەردگار بمانبەخشێت، چۆن دەتوانین کەسانی تر نەبەخشین؟ بەم هۆیەوە پەیامبەر موحەمەد(ﷺ) فێرمان دەکات: **«مَنْ لَا يَرْحَمِ النَّاسَ، لَا يَرْحَمْهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ».**

«ئەوانەی ڕەحم و بەزەییان نییە بەرامبەر کەسانی تر، ئەوا پەروەرێنیش ڕەحم و بەزەییان پێ ناکات.» (رواه مسلم).

ئەم هیوابوونە بە ڕەحمی پەروەردگار پێویستە ئارەزووی بەخشین و چوونە ناو تاکە جیهانی کامڵ و بێ کەموکوڕیمان لە لا زیاد بکات.

# خەونی ژیان

ئەوەی بینیم تەنها خەوێک بوو. بۆ ساتێک دایگرتم. ئەو ئازارەی لە خەوە ناخۆشەکەمدا هەستی پێ دەکەم تەنها خەیاڵە. کاتییە هاوشێوەی چاوترووکاندنێک، بەڵام بۆچی خەو دەبینم؟ بۆچی لە خەوەکەمدا هەست بە لەدەستدان و ترس و خەمباری دەکەم؟

بە شێوەیەکی گشتی پرسیارێکە کە بە درێژایی کات پرسیار کراوە؟ بۆ زۆربەی خەڵکی وەڵامەکە ڕێچکەی بۆ دیاری کردوون -بەرەو باوەڕبوون یاخود دوورکەوتنەوە لێی. باوەڕبوون بە پەروەردگار، بە مەبەستەکانی ژیان، بە فەرمانێکی باڵا، یاخود وێستگەی کۆتایی، زۆر جار وەڵامی پرسیارەکە ئەمانەی دیاری کردووە. پرسیارکردن لەم بارەیەوە بریتییە لە پرسیارکردن لە بارەی ژیانەوە بە گشتی.

بۆچی ئازار دەچێژین؟ بۆچی شتی خراپ بەسەر کەسانی باشدا دێت؟ چۆن دەکرێت پەروەردگارێک هەبێت لەکاتێکدا منداڵانی بێتاوان لە برسا دەمرن و تاوانباران بە ئازادی دەگەڕێن؟ چۆن دەکرێت پەروەردگارێکی پرسۆز و بەهێز هەبێت و ڕێگە بدات ئەم نەهامەتیانە ڕووبدەن؟

ئەگەر بەڕاستی پەروەردگارێکی دادپەروەر و باش هەبێت بۆچی تەنها شتانی باش بۆ کەسانی باش، شتانی خراپ بۆ کەسانی خراپ

ڕوونادەن؟ لە ڕاستیدا چونکە پەروەردگار دادپەروەرترین و بەسۆزترینە. هیچ کەموکورپییەک لە زانیاری و تێگەیشتنی پەروەریێندا نییە. کێشەکە لەوەدایە ئێمە کەموکورپییمان هەیە لە تێگەیشتن و زانیارییەکانماندا.

بۆ تێگەیشتن لەم وتەیە «تەنها شتانی باش بۆ کەسانی باش و شتانی خراپ بۆ کەسانی خراپ ڕوودەدەن.» پێویستە سەرەتا پێناسەی «باش» و «خراپ» بکەین.

چەندین پێناسەی «باش» و «خراپ» هەن، چونکە کەسانی جیاواز و تێگەیشتنێکی گشتی و باو هەیە. بۆ نموونە زۆربەی خەڵکی هاوڕان لەسەر ئەوەی سەرکەوتن لە بەدەستهێنانی مەبەست و ئامانجەکانمان شتێکی باشە. لە لایەکی ترەوە شکستهێنانمان لە بەدەستهێنانی مەبەست و ئامانجەکەمان شتێکی خراپە. ئەگەر ئامانجەکەم بریتی بێت لە زیادبوونی کێشم لەبەر ئەوەی زۆر لاوازم، ئەوا زیادبوونی کێش شتێکی باشە.

ئەگەر ئامانجەکەم بریتی بێت لە داگرتنی کێشم لەبەر ئەوەی کێشم زیادە، ئەوا زیادبوونی کێش شتێکی خراپ دەبێت. هەمان شت دەکرێت باش یاخود خراپ بێت بە گوێرەی مەبەستەکەم. کەواتە «باش» بە لای منەوە بریتییە لە بەدەستهێنانی ئامانجە تایبەتەکەم، بەڵام ئامانجەکەم چییە؟

ئەم پرسیارە ئاڕاستەمان دەکات بەرەو پرسیارە گرنگەکەی ئامانج و مەبەستی بوون، دوو تێڕوانینی جیاواز هەن لەبارەی مەبەستی ئەم ژیانەوە. تێڕوانینی یەکەم ئەوەیە کە ئەم ژیانە وێستگەی کۆتایی و ئامانجی کۆتاییە. تێڕوانینی دووەم لە بارەی ئەم ژیانەوە ئەوەیە ئەم ژیانە بریتییە لە پردێک، هۆکارێک کە هیچ شتێک نییە جگە لە دیمەنێکی ڕاستەقینەی بێکۆتایی پەروەردگار.

بە لای کەسانی گرووپی یەکەمەوە ئەم ژیانە هەموو شتێکە. کۆتاییەکە

هەموو کارەکان پەیوەستە پێوەی. بە لای کەسانی گرووپی دووەمەوە ئەم ژیانە هیچە، بۆچی؟ چونکە بە بەراورد بە ژمارەی بێکۆتا، تەنانەت گەورەترین ژمارە دەبێتە هیچ، ئەم ژیانە هیچ نییە جگە لە خەوێک.

ئەم دوو تێڕوانینە جیاوازە کاریگەری دەکاتە سەر وەڵامی مەبەست و ئامانجی ئەم ژیانە. ئەگەر کەسێک باوەڕی وابێت ئەم ژیانە ژیانی ڕاستەقینە، وێستگەی کۆتایی و ئامانجەکەیە، مەبەستی ژیان بریتی دەبێت لە چێژوەرگرتن و خۆشی زیاتر لەم ژیانەدا. بەم شێوەیە شتە «خراپەکان» بەسەر کەسانی «باشدا» دێن لە هەموو ساتێکدا. بەم شێوەیە خەڵکی دەگەنە ئەو باوەڕەی هیچ دادپەروەرییەک بوونی نییە، بۆیە دەبێت هیچ پەروەردگارێک بوونی نەبێت، یاخود ئەوەی پەروەردگار دادپەروەر نییە، (پەنا بە پەروەردگاری مەزن).

ڕێک هاوشێوەی ئەو کەسەیە کە دەڵێت پەروەردگار بوونی نییە تەنها لەبەر ئەوەی خەوێکی ناخۆشیان بینیوە. بەڵام بۆچی گرنگی بە ئەزموونی خەوەکانمان نادەین؟ هەندێک خەو تۆقێنەرن و زۆر جار بۆ کەسانی باش ڕوودەدەن. لە خەونەکانماندا تووشی ترس و ناڕەحەتی زۆر دەبین، بەڵام بۆچی گرنگ نییە؟ چونکە خەوەکانمان هیچ نین بە بەراورد بەم ژیانە.

لە تێڕوانینی دووەمدا (بە پێی ئیسلام) مەبەست لە دروستبوونی جیهان بریتی نییە لە چێژوەرگرتن و بەدەستهێنانی شتی زیاتر لە ژیانێکدا کە هیچ نییە جگە لە خەوێک. بەم تێڕوانینە مەبەستی ژیان لە لایەن پەروەردگارەوە دیاری کراوە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ (سورەتی الذاريات)

«جن و مرۆڤەکانم بۆ هیچ مەبەستێک دروست نەکردووە تەنها بۆ پەرستشی من نەبێت.»

گرنگە سەرنج بدەین لە پێکهاتەی ئەم ئایەتە. ئایەتەکە بە حاڵەتێکی نەرێنی دەست پێ دەکات: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ...﴾ «جن و مرۆڤەکانم بۆ هیچ مەبەستێک دروست نەکردووە»، لە سەرەتادا پەروەردگار هەموو مەبەستەکانی تر وەلا دەنێت، پاشان تاکە مەبەست ئاماژە پێ دەدات کە بریتییە لە ﴿إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴾ «تەنها بۆ پەرستشی خۆم نەبێت»، مانای ئەوەیە وەک باوەڕدارێک دەزانم کە هیچ مەبەستێک نییە لە دروستبوونی مندا جگە لە ناسین و خۆشویستن و نزیکبوونەوە لە پەروەرێنم. ئەمە تاکە هۆکارە کە بۆی دروست بووم.

ئەمەیش گرنگترین تێگەیشتنە، چونکە پێناسەی هەموو ئەو شتانە دەکات کە ئەنجامی دەدەم، یاخود باوەڕم پێی هەیە. پێناسەی هەموو شتەکانی چواردەورم و ئەو شتانەی لە ژیانمدا تووشی دەبم دەکات.

کەواتە بۆ زانینی مانای «باش» و «خراپ» بە گشتی هەر شتێک نزیکترمان بکاتەوە لە مەبەستی سەرەکیمان ئەوا شتێکی «باشە»، هەر شتێکیش دوورمان بخاتەوە لە ئامانجی سەرەکیمان ئەوا شتێکی «خراپە». بە مانایەکی تر ئەوانەی ئامانجیان بریتییە لە جیهانی ماددی، شتە ماددییەکان «باش» و «خراپ»یان دیاری دەکەن. بە لای ئەوانەوە بەدەستهێنانی سامان و پلە و ناوبانگ و موڵک شتێکی «باشە»، لەدەستدانی سامان و پلە و ناوبانگ، یاخود موڵک بە لایانەوە شتێکی «خراپە».

بەم پێیە کاتێک کەسێکی بێتاوان هەموو شتە ماددیەکانی لەدەست دەدات، ئەوا شتێکی «خراپە» بەسەر کەسێکی «باش»دا دێت. ئەمە خەیاڵاتێکە بەهۆی تێڕوانینێکی هەڵەوە دروست دەبێت. کاتێک چاویلکەکە خۆی تەڵخ و ناڕوون بێت، وێنەکەیش تەڵخ و ناڕوون دەبێت. بە تێڕوانینی دووەم هەر شتێک نزیکمان بکاتەوە لە پەروەردگار و خۆشەویستی پەروەردگار، ئەوا شتێکی «باشە»، هەر شتێک لە پەروەردگار و خۆشەویستی پەروەردگار دوورمان بخاتەوە شتێکی «خراپە».

کەواتە بردنەوەی ملیارێک دۆلار ڕەنگە گەورەترین بەڵا بێت کە تاکو ئێستا بە سەرمدا هاتبێت، ئەگەر لە پەروەردگار دوورم بخاتەوە. لە لایەکی ترەوە، لەدەستدانی پیشەکەم و هەموو سامانەکەم و تەنانەت نەخۆشکەوتنم دەکرێت گەورەترین ڕەحمەت بێت کە تاکو ئێستا پێمبەخشرابێت ئەگەر لە پەروەردگار نزیکم بکاتەوە. ئەمەیش ئەو ڕاستیەیە کە پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژەی پێ دەدات: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾﴾ (سورەتی البقرە).

«جەنگ لە سەرتان بڕیار دراوە کە شتێکی گرانە لاتان، بەڵام لەوانەیە شتێک ڕووبدات بۆتان و ڕقتان لێی بێت، بەڵام خێری تێدابێت بۆتان. شتێکیش کە حەزتان لێیە، بەڵام خراپە بۆتان، پەروەردگار هەر خۆی زانایە و ئێوە نازانن.»

کەواتە وەک باوەڕدارێک پێوەری من چیدی بەدەستهێنان، یاخود لەدەستدانی شتە ماددییەکان نییە. پێوەری من شتێکی باڵاترە، ئەو شتەی لەم جیهانەدا هەمە، یاخود نیمە تەنها پەیوەستە بەوەی تاکو چەند لە خودا نزیکم دەکاتەوە، یاخود دوورم دەکاتەوە. ئەم ژیانە هیچ نییە جگە لە خەوێک کە بۆ ساتێکی کەم تێیدا دەژیم و پاشان بەئاگا دێمەوە. باشی و خراپی خەوەکە بە لای منەوە پەیوەستە بە باری من کاتێک بەئاگا دێم.

بە پێی پێوەری کۆتایی دادپەروەرییەکی تەواو هەیە. خودا تەنها باشە (نزیکی لە خۆی) دەبەخشێت بە کەسانی باش، خراپە (دووری لە خۆی) دەبەخشێت بە کەسانی خراپ. باشترین شت بریتییە لە نزیکبوون لە خودای گەورە لەم دونیا و ئەو دونیادا. تەنها کەسانی باش ئەم نیعمەتەیان بۆ دەبێت. بۆیە پەیامبەرمان دەفەرموێت: «**عَجَبًا لِأَمْرِ الْمُؤْمِنِ،**

إِنَّ أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيرٌ، وَلَيسَ ذَاكَ لأَحَدٍ إِلَّا لِلمُؤمِنِ، إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ، فَكَانَ خَيرًا لَهُ، وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ، صَبرَ فَكَانَ خَيرًا لَهُ». (رواه مسلم).

ئەم فەرموودەیە ڕوونی دەکاتەوە کە باشی و خراپی شتێک پەیوەست نییە بە ڕووکاری دەرەوەی شتەکە. باشە و خێر پەیوەستە بە ناوەڕۆکی باشی شتەکەوە وەک لەم فەرموودەیەدا ڕوون کراوەتەوە: ئارامی و سوپاسگوزاری ڕەنگدانەوەی ئارامی و نزیکبوونە لە پەروەردگاری مەزن.

لە لایەکی ترەوە گەورەترین بەڵا بریتییە لە دووربوون لە پەروەردگار لەم ژیانە و ژیانی دواییدا. تەنها کەسانی خراپ بەمە سزا دەدرێن. ئەو سەروەت و پلە و موڵک و ناوبانگەی ئەم کەسە دوورخراوانە هەیانە، تەنها خەیاڵاتە و لەو خەوە خۆشانە، یاخود ناخۆشانەی دەیبینێت گرنگتر و ڕاستەقینەتر نییە.

پەروەردگار لە بارەی ئەم خەیاڵاتانەوە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾﴾ (سورەتی طه).

«ئەی ئیماندار چاوەکانت مەبڕە ئەو ناز و نیعمەتەی کە هەندێک خەڵکمان لێ بەهرەوەر کردووە، کە زینەت و ڕازاوەی ژیانی دونیایە، بێگومان ڕزق و ڕۆزی پەروەردگارت لە بەهەشتدا چاکتر و بەردەوامترە.»

ژیانی هەمیشەیی ئەو ژیانەیە کە دوای بەئاگاهاتنمان دەست پێ دەکات، لەو بەئاگاهاتنەوەیەدا تێدەگەین ئەم ژیانە تەنها خەوێک بووە.



## دەرگا داخراوەکان و وەهمەکان کە نابینامان دەکەن

دوێنـێ کـوڕە بیسـتودوو مانگانەکـەم ویسـتی سـەربەخۆیی خـۆی پەیـڕەو بـکات، دوای دابەزینـی لـە ئۆتۆمبیلەکـە، ویسـتی دەرگای ئۆتۆمبیلەکـە دابخـات هاوشـێوەی کەسـێکی پێگەیشـتوو، بۆیـە لەوێـدا وەسـتام و چاودێریـم دەکـرد، هەسـتم کـرد ئەگـەر لێـی بگەڕێـم خـۆی دەرگاکـە دابخـات، ڕەنگـە سـەری بکێشـێت بـە دەرگاکـەدا، بۆیـە دوورم خستەوە و خۆم دەرگاکەم داخست. ئەم ڕەفتارەم تەواو ئەوی نائومێد کرد و دەستی بە گریان کرد. چۆن توانیم ڕێگری شتێکی لێ بکەم کە زۆر تامەزرۆیەتـی؟

کاتێک تەماشای دیمەنەکەم دەکرد، بیرێکی نامۆ بە مێشکمدا هات. هەمـوو ئـەو سـاتانەم بیـر هاتـەوە کـە لـە ژیانمانـدا ڕوویانـداوە. کاتێک زۆر تامـەزرۆی شـتێکین، بـەڵام پـەروەردگار ناهێڵێت بەدەسـتی بهێنیـن. بیـری هەمـوو ئـەو سـاتانەم کەوتـەوە کـە ئێمـەی پێگەیشـتوو تووشـی هەمـان نائومێدی بووینەتـەوە کاتێک شـتەکان بـەو شـێوەیە نەڕۆیشـتوون کە ویستومانە. لەناکاو شتەکەم بۆ ڕوون بوویەوە. من تەنها کوڕەکـەم لـە دەرگای ئۆتۆمبیلەکـە دوور خسـتەوە بـۆ ئـەوەی بیپارێـزم، بـەڵام ئـەو نەیزانـی و بـە هەڵـە لێمتێگەیشـت. لـە کاتـی گریانەکـەیدا نەیدەزانـی

پارێزگاریم لەو کردووە. زۆر جار شێوەنمان کردووە لەبەر شتێک کە ڕزگاری کردوین هاوشێوەی ئەوەی کە کوڕەکەم لە نەزانی و ساویلکەییدا گریا.

کاتێک فریای فڕۆکەیەک ناکەوین و درەنگ دەکەوین، کارەکەمان لەدەست دەدەین، یاخود ناتوانین هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسەدا بکەین کە دەمانەوێت، ئایا هەرگیز بیرمان کردۆتەوە کە ئەو شتە لەبەر سوود و خێری خۆمان بووە؟ پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ۝٢١٦﴾ (سورەتی البقرە).

«ڕەنگە شتێک هەبێت کە حەزتان لێیە، بەڵام خراپە بۆتان، پەروەردگار هەر خۆی زانایە و ئێوە نازانن.»

زۆر سەختە پشتەوەی شتەکان ببینین. پێویستی بە هێزێکی زۆرە تاکو پشتەوەی خەیاڵەکان ببینین، بە دوای ڕاستییەکدا بگەڕێین کە ڕەنگە لێی تێنەگەین. هەروەک چۆن کوڕەکەم تێنەدەگەیشت لەوەی چۆن ڕێگریکردنم لێی بۆ ئەنجامدانی ئەو شتەی زۆر تامەزرۆی بوو، تەنها بۆ ئاگاداربوون و پاراستنی ئەو بووە، ئێمە زۆر جار ڕاستییەکان نابینین و هەستی پێ ناکەین.

لە کۆتاییدا تەنها تەماشای دەرگا داخراوەکانی ژیانمان دەکەین و دەرگا کراوەکان لەبیر دەکەین. کاتێک ناتوانین هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو کەسەدا بکەین کە لە خەیاڵماندایە، نەتوانینمان بۆ تەماشاکردنی دیوی پشتەوە ڕەنگە وامان لێ بکات ئەو کەسە نەبینین کە لە ڕاستیدا باشترە بۆمان. کاتێک دانامەزرێین، یاخود شتێکی گرنگ لەدەست دەدەین، سەختە هەنگاوێک بەرەو دواوە بنێین و وێنەیەکی گەورەتر ببینین.

زۆر جار پەروەردگار شتانێکمان لێ دوور دەخاتەوە بۆ ئەوەی بە

شتانێکی باشتر شوێنی پڕ بکاتەوە، تەنانەت ئەگەر شتێکی تراژیدی ڕوویدات. کەسی وا هەیە لەدەستدانی منداڵ زۆر بە ئازارتر دەزانێت لە کارەساتەکانی تر.

تەنانەت ئەم لەدەستدانەیش دەکرێت لەپێناو پاراستن و ڕزگارکردنی ئێمە بوو بێت و بە شتێکی باشتر شوێنی پڕ بکرێتەوە. پەیامبەرمان دەفەرموێت:

**(إذَا مَاتَ وَلَدُ العَبْدِ قَالَ اللَّهُ لِمَلاَئِكَتِه: قَبَضْتُمْ وَلَدَ عَبْدِي، فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيَقُولُ: قَبَضْتُمْ ثَمَرَةَ فُؤَادِه، فَيَقُولُونَ: نَعَمْ، فَيَقُولُ: مَاذَا قَالَ عَبْدِي؟ فَيَقُولُونَ: حَمِدَكَ وَاسْتَرْجَعَ، فَيَقُولُ اللَّهُ: ابْنُوا لِعَبْدِي بَيْتًا فِي الجَنَّةِ، وَسَمُّوهُ بَيْتَ الحَمْدِ).**

«ئەگەر منداڵی بەندەیەک بمرێت، پەروەردگار بە فریشتەکانی دەفەرموێت: ئایا منداڵی بەندەکەمت بردەوە؟ فریشتەکان وەڵام دەدەنەوە: بەڵێ پەروەردگارمان. پەروەردگار پێیان دەفەرموێت: ئایا جەرگی بەندەکەمتان بردەوە؟ وەڵام دەدەنەوە: بەڵێ پەروەردگارمان. پاشان پەروەردگار پێیان دەفەرموێت: بەندەکەم چی گوت؟ فریشتەکان وەڵام دەدەنەوە سوپاس و ستایشی تۆی دەکرد و وتی «**انا لله و انا اله الرجعون**»، هەموومان موڵکی پەروەردگارین و هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. پەروەردگار پێیان دەفەرموێت: خانوویەک لە بەهەشتدا بۆ بەندەکەم دروست بکەن و ناوی بنێن (بيت الحمد)، (خانووی سوپاسگوزاری)»، ( رواه الترمذي).

کاتێک پەروەردگار شتێکی خۆشەویستمان (بۆ نموونە منداڵێک)مان لێ دەسەنێتەوە بۆ ئەوەیە بە شتێکی باشتر شوێنی پڕ بکاتەوە بۆمان. ڕەنگە بەهۆی ئەو لەدەستدانەوە بچینە ناو بەهەشتەوە، ژیانێکی هەمیشەیی لەگەڵ منداڵەکەماندا بەسەر بەرین. بە پێچەوانەی ژیانی ئەم دونیا، ژیانی دوایی ژیانێکی هەمیشەیی و نەبڕاوەیە کە تێیدا

منداڵەکەمان هیچ ئازار و ترس و نەخۆشییەکی تووش نایەت.

بەڵام لەم ژیانەدا نەخۆشییەکانمان ڕەنگە بەو شێوەیە نەبن کە دەردەکەون. ڕەنگە پەروەردگار بەهۆی نەخۆشییەکانمانەوە لە تاوانەکانمان پاکمان بکاتەوە. کاتێک پەیامبەرمان موحەمەد تووشی تایەکی بەرز بوو، فەرمووی: **(مَا مِنْ مُسْلِمٍ يُصِيبُهُ أذًى شَوْكَةٌ فَمَا فَوْقَهَا إلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا سَيِّئَاتِهِ كَمَا تَحُطُّ الشَّجَرَةُ وَرَقَهَا).**

«هیچ مسوڵمانێک تووشی ناڕەحەتییەک نایەت تەنانەت بە دڕکێک، ئیللا بەهۆیەوە تاوانەکانی هەڵدەوەرێنێت هەروەک چۆن درەختێک گەڵاکانی هەڵدەوەرێت»، (رواه البخاری).

لە فەرموودەیەکی تردا پەیامبەرمان ڕوونی دەکاتەوە: **(مَا يُصِيبُ المُسْلِمَ مِنْ نَصَبٍ ، وَلاَ وَصَبٍ ، وَلاَ هَمٍّ ، وَلاَ حُزْنٍ ، وَلاَ أذًى ، وَلاَ غَمٍّ حَتَّى الشَّوْكَةِ يُشَاكُهَا إِلاَّ كَفَّرَ اللَّهُ بِهَا مِنْ خَطَايَاهُ).**

«هەرکاتێک مسوڵمانێک تووشی ناڕەحەتییەک، نەخۆشییەک، نیگەرانییەک، زیانێک، یاخود نائومێدییەک هات تەنانەت بەوەی دڕکێک بچەقێتە قاچی، پەروەردگار بەهۆیەوە تاوانەکانی هەڵدەوەرێنێت.»، ( رواه البخاري).

با هەژاری بە نموونە وەربگرین. زۆربەی ئەوانەی سەروەت و سامانیان نییە، هەرگیز نەبوونی سەروەت و سامان بە نیعمەت نازانن، بەڵام نەبوونی سەروەت و سامان نیعمەتێکی گەورە بوو بۆ ئەوانەی لە دەوروبەری قاروون دەژیان.

قاروون پیاوێک بوو لە سەردەمی پەیامبەر موسادا دەژیا، پەروەردگار سەروەت و سامانێکی زۆری پێ بەخشیبوو، تەنانەت کلیلەکانی گەنجینەکەی، گەنجینەیەک بوون بۆ خۆیان. پەروەردگارمان لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ فِى زِينَتِهِۦ ۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا يَٰلَيْتَ لَنَا مِثْلَ مَآ أُوتِىَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٍ ﴿٧٩﴾﴾ (سورەتی القصص).

«ئینجا ڕۆژێک قاروون خۆی سازدا و بە ڕازاوەیی چووە دەرەوە بۆ ناو قەومەکەی بۆ کەشخەکردن و خۆنواندن، ئەوانەی کە ئاواتیان ژیانی ئەم دونیایە وتیان: ئای خۆزگە ئێمەیش وەک قاروون سامان و دەسەڵاتمان ببوایە، بەڕاستی خاوەنی بەختێکی باش و گەورەیە.»

بەڵام قاروون تووشی لەخۆباییبوون و ناسوپاسگوزاری و یاخیبوون بوو بەهۆی سەروەت و ساماناکەیەوە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَخَسَفْنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلْأَرْضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٍ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصْبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوْا۟ مَكَانَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَقُولُونَ وَيْكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ وَيَقْدِرُ ۖ لَوْلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيْنَا لَخَسَفَ بِنَا ۖ وَيْكَأَنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾﴾ (سورەتی القصص).

«ئەوسا کە بینیمان قاروون بە تەواوی لە سنوور دەرچووە، کتوپڕ خۆی و ماڵ و سامانیمان برد بە ناخی زەویدا، هیچ دەستە و گرۆیەکی نەبوو فریای بکەوێت و لەدەست خەشم و قینی پەروەردگار ڕزگاری بکات، بێگومان لەو کەسانەیش نەبوو کە بتوانێت خۆی ڕزگاری بێت(٨١)، ئینجا ئەوانەی دوێنێ ئاواتیان بە قاروون دەخواست، دەیانوت: ئەی هاوار، بەس نەبوو وەکو ئەو تێدانەچووین، دیارە کە پەروەردگار ڕزق و ڕۆزی زۆر دەبەخشێت بە هەر کەس بیەوێت، یاخود کەمی دەکاتەوە، بێ حیکمەت نییە، ئەگەر فەزڵ و بەهرەی پەروەردگار نەبووایە لە سەرمان، ئێمەیش بە ناخی زەویدا ڕۆدەچووین، ئای کە ڕوون و ئاشکرایە، کافر و خوانەناسان سەرفراز نابن (٨٢)».

دوای ئەوەی چارەنووسی قاروونیان بینی، خەڵکەکەی دەورووبەری قاروون سوپاسگوزار بوون کە لە سەروەت و سامانەکەی قاروون پارێزراو بوون. ڕەنگە هیچ نموونەیەکی باشتر نەبێت لە چیرۆکەکەی حەزرەتی موسا و حەزرەتی خضر کە لە (سورەتی الکهف)دا باس کراوە.

کاتێـک پەیامبـەر موسـا لەگـەڵ حەزرەتـی خضـردا (کـە دەوترێـت فریشـتەیەک بـووە لـە شـێوەی پیاوێکدا)، فێر بـوو شـتەکان زۆر جار بـەو شـێوەیە نیـن کـە دەردەکـەون، ژیـری و زانایـی پـەروەردگار ناتوانرێـت هەمیشـە بـە ڕووکـەش دەربکەوێت. حەزرەتـی خضـر و پەیامبـەر موسـا گەیشـتنە نـاو شـارۆچکەیەک، حەزرەتـی خضـر دەسـتی کرد بـە کونکردنی بەلەمێک.

بـە ڕووکـەش ئـەم کارە زیانگەیاندنـە بـە خاوەنـی کەشـتییەکە، بـەڵام حەزرەتـی خضـر ڕوونـی کـردەوە کـە لـەم ڕێیـەوە خەڵکەکـە و کەشتییەکەیانی پاراستووە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِي ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾﴾ (سـورەتی الکهـف).

«زاناکـە وتـی: ئیتـر لێـرە بـەدواوە کاتـی جیابوونـەوەی مـن و تۆیـە، مـن تاوێکـی تـر ئـاگادارت دەکەمـەوە لـە حەقیقـەت و دەرئەنجامـی ئـەو شـتانەی کـە نەتتوانـی ئـارام بگریـت لـە سـەریان(٧٨) ئـەو کەشـتییەی عەیبدارم کرد، چەند هەژارێک خاوەنـی بـوون لـە دەریـادا کاریـان دەکرد، منیش ویسـتم عەیبداری بکـەم، چونکـە لـەو نـاوەدا پادشـایەک هەبوو کـە هەمـوو کەشـتییەکی چـاک و ڕێکوپێکـی داگیـر دەکـرد(٧٩)».

حەزرەتـی خضـر لـە ڕێـی کونکردنـی کەشـتییەکەوە خەڵکەکـەی پاراسـت، چونکە ئەو پادشـایەی کە دەسـتی بەسـەر کەشتییەکاندا دەگرت ئـەو کەشـتییەی بـە دڵ نەبـوو. هەندێک جار لـە ژیاندا ئـەم جۆرە شـتانە ڕوودەدەن. لەپێنـاو سـەلامەتیماندا شـتێکمان لـێ دەسـەندرێتەوە، یاخـود بە شـێوەیەک پێمـان دەبەخشـرێت کـە نامانەوێت. بـە لای ئێمـەوە هاوشـێوەی کوڕێکـی بیسـتوودوو مانـگ و دەرگایەکـی داخـراو دەردەکەوێت.

## ئازار و لەدەستدان و ڕێگای بەرەو پەروەردگار

تاكو ئیستا نائومێدییەكەم لە یادە. لە نائومێدییەكی قووڵدا كە زۆر جار لەدوای تێرامان لە خوددا دەهات، ڕووم كردە پەروەردگارم تاكو بپاڕێمەوە. لە پەروەردگار پاڕامەوە بۆ شتێك كە ناخەملێنرێت و نافرۆشرێت، یاخود مامەڵەی پێوە ناكرێت.

نائومێد بووم بۆ درهەمێكی ڕاستەقینەتر، نائومێد بووم لەوەی ڕزگار بم لە زوڵمی نەفسی خۆم و گۆڕانم بۆ كەسێكی باشتر. دڵی خۆم دایە دەستی پەروەردگار، نزام كرد تاكو پاك ببمەوە. هەمیشە باوەڕم بەهێز و جێگیر بوو كە پەروەردگار بیسەری هەموو نزاكانە، هەرگیز پێشبینیم نەدەكرد كەی و چۆن ئەو نزایەم وەڵام دەدرێتەوە.

كەمێك پاش نزاكەم تووشی یەكێك لە ناڕەحەتترین ساتەكانی ژیانم بووم. لەو ماوەیەدا خۆم ئامادە كرد و نزام كرد بۆ ڕێنمایی و هێز، بەڵام هیچ پەیوەندییەكم بە نزاكەی پێشووەوە بەدی نەكرد.

تاكو ئەو ساتە تێپەڕی و لێی تێرامام و تێگەیشتم چەندە گەورە بووم، لەناكاو نزاكەم بیر هاتەوە، بیرم هاتەوە ناڕەحەتییەكە خۆی لە خۆیدا وەڵامی ئەو نزایەم بوو كە زۆر نائومێدانە كردم.

وشەکانی (جلال الدینی ڕوومی) زۆر بە جوانی ڕوونی دەکەنەوە:

«عندما یـضرب احدنـا الـسجادة بقطعـة مـن خشـب فلیـس قصـدة ضرب الـسجادة انمـا قصـدة نفـض التراب عنهـا .نفسـك ملیئـة بالـتراب المتراكم من حجـاب ألانـا وهـذا الـتراب لا یمكـن نفضـة مرة واحدة .مـع كل قسـوة وكل ضربـة ینفـض الـتراب شـیئا فشـیئا عـن وجـة القلب.»

«کاتێـک کەسـێک بـە دار بـە فەرشـێکدا دەکێشـێت، مەبەسـتی لـە لێدانـی خـودی فەرشـەکە نییـە، بەڵکـوو ئامانجـی پاككردنـەوە و نەهێشتنی خۆڵ و تۆزەکەیە. ناخت پڕە لە تۆز و خۆڵی خودپەرستی، ئەو تـۆزە بـە یەکجار نـاڕوات. لەگەڵ هـەر توندییـەک و لێدانێکدا وردە وردە ئاسـەواری بەسـەر دڵـەوە نامینێت، هەندێک جار لـە کاتی خـەودا و هەندێک جار لـە کاتی بەئاگاییدا.»

زۆر جار لـە ژیانـدا تووشـی شـتانێک دەبیـن و هەرگیـز پەیوەنـدی شـتەکان بـە یەکـەوە نابینیـن. کاتێـک تووشـی ناڕەحەتییـەک، یاخـود ئازارێـک دەبیـن، دەرک بـەوە ناکەیـن ڕەنگـە ئـەو ناڕەحەتـی، یاخـود ئـازارە هـۆکاری ڕاسـتەوخۆ یاخـود ئەنجامـی شـتێکی تـر بێت. هەندێک جـار شکسـت دەهێنیـن لـە دەرککـردن بـە پەیوەنـدی ڕاسـتەوخۆی نێـوان ئازارەکانـی ژیانمـان و پەیوەندیمـان لەگـەڵ پـەروەردگاردا.

ئەو ئازار و نەهامەتییە خزمـەت بە چەندین ئامانج دەکات لە ژیاندا. سـاتی ناڕەحەتییـەکان دەکرێـت وەکـو ئاماژەیـەک و چارەسـەرێک بـن بۆ پەیوەندییە پچڕاوەکەمـان لەگـەڵ بەدیهێنەرماندا.

سـاتی ناڕەحەتییـەکان بـاوەڕ و هێـز و توانامـان تاقی دەکەنـەوە. لـەم سـاتانەدا پلـەی ئیمانمـان دەردەکەوێت. نەهامەتی ڕووپۆشـەکانمان ڕادەماڵـێ و ڕاسـتەقینەی پشـت باوەڕەکەمـان ئاشـکرا دەکات. ناڕەحەتییـەکان باوەڕهێنەرانی ڕاستەقینە لـە ساختەکان جیا دەکاتەوە.

پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝﴾ (سورەتی العنكبوت).

«ئایا خەڵکی وایانزانیوە کە وازیان لێ دەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێن، ئەگەر بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، لەکاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوە و تووشی سزا و ئازار نەکرێن؟»

ناڕەحەتییەکان تاقیمان دەکەنەوە. دەکرێت ڕەحمەت بن و ئاماژەیەک بن بۆ خۆشەویستی پەروەردگار. پەیامبەرمان موحەممەد دەفەرمویت: «**إِذَا أَرَادَ اللَّهُ تَعَالَىَ بِعَبْدِهِ الْخَيرَ عَجَّلَ لَهُ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا**».

«کاتێک پەروەردگار خێر و چاکەی کەسێکی بوێت، تووشی ناڕەحەتیی دەکات لە دونیادا.» (رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ).

هێشتا زۆربەی خەڵکی ناتوانن تێبگەن چۆن دەکرێت نەهامەتی خێر و چاکەی تێدا بێت. زۆرکەس هەست بەوە ناکەن ناڕەحەتییەکان لە ڕاستیدا خاوێنکەرەوەن و خەڵکی بەرەو پەروەردگار دەگەڕێننەوە. چی ڕوودەدات کاتێک کەسێکی لەخۆبایی دەکەوێتە بارودۆخێکەوە کە دەسەڵاتی بەسەردا نییە؟ چی ڕوودەدات کاتێک کەسێک بە تەنها لە زەریایەکدا لە ناوەڕاستی زریانێکدایە؟ چی ڕوودەدات کاتێک کەشتییەکی نقوومنەبوو دەبێتە چیرۆکی تایتانیک؟

ئەم نەهامەتییانە لەڕاستیدا بەئاگاهێنەرەوەن، دەتهەژێنن، بیرمان دەهێننەوە چەندە بچووک و لاوازین، پەروەردگار چەندە گەورە و بەهێزە. بەو شێوەیە لە فریوخواردن و بێئاگایی و لاڕێی بەئاگامان دێننەوە و دەمانگەڕێننەوە بۆ لای پەروەردگارمان. ناڕەحەتییەکان ڕووی دڵدانەوە لە چاوەکانمان ڕادەماڵن و بیرمان دەهێننەوە چین و بۆکوێ دەچین.

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ٩٤﴾ (سورەتی الاعراف).

«لە هیچ شار و وڵاتێکدا هیچ پەیامبەرێکمان نەناردووە کە خەڵکەکەی بە درۆیان زانی بێت و بە گوێیان نەکردبێت، مەگەر خەڵکی ئەو شوێنەمان بە تەنگانە و نەخۆشی گیرۆدە کردووە، بۆ ئەوەی دابچڵەکێن و تێفکرن و دەست بکەن بە نزا و پاڕانەوە و لاڵانەوە».

ئەم وانەیە ڕۆحی مرۆڤ پاک دەکاتەوە بە ڕادەیەک کە پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دڵی باوەڕداران دەداتەوە و دڵنیایان دەکاتەوە هەر ئازارێک کە تووشی دەبن بۆ بەرزکردنەوەی پلە و سوودی خۆیانە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٤٠ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٤١ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٢﴾ (سورەتی ال عمران).

«ئەگەر زام و سەختی و ناخۆشییەک تووشی ئێوە هاتووە، ئەو خەڵکەیش تووشی هەمان زام و سەختی و ناخۆشی هاتن، ئێمە ئەو ڕۆژگارانە دەستاودەست پێ دەکەین لەناو خەڵکیدا تاکو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پەروەردگار دەریانبخات و هەندێکتان بکات بە شایەت و بە پلەی شەهیدی بگەن، بێگومان پەروەردگار ستەمکارانی خۆش ناوێت(١٤٠)، بێگومان پەروەردگار تاقیتان

دەكاتـەوە تاكو ئەوانـەی ئیماندارن پاک و بێگەردیان بکات، کافرانیش نابـوت و ڕیسـوا بـکات(١٤١)، یاخـود وا گومانتـان بـرد هـەروا بـە ئاسـانی دەچنـە بەهەشـتەوە؟ کـە هێشـتا پـەروەردگار دەرینەخسـتووە کامتـان هـەوڵ و کۆشـش و جیهـادی کـردووە و کامتـان خۆڕاگـر و ئارامگـر بـووە! (١٤٢)».

جەنگـی خاوێنکردنـەوەی خـود، بنچینـەی ڕێـگای بـەرەو پـەروەردگارە. ئـەو ڕێگایـە بـە فیداکردنـی خـود دەسـت پـێ دەکات و بـە ئارەقی ململانـێ چنـراوە. پـەروەردگار لـە قورئانـی پیـرۆزدا ئامـاژە بـەم ڕێگەیـە دەدات و دەفەرموێت: ﴿وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۚ كُلًّا هَدَيْنَا ۚ وَنُوحًا هَدَيْنَا مِن قَبْلُ ۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٤﴾﴾ (سـورەتی الانعـام).

«دواتـر ئیسـحاق و یەعقوبمـان پـێ بەخشـی، هەریـەک لەوانمـان ڕێنموویی کـرد، پێشـتریش نوحمـان ڕێنمویـی کردبـوو و لـە نەوەکانـی تـری (ئیبراهیـم)، داود و سـلێمان و ئەیـوب و یوسـف و موسـا و هـاروون، (هاتنـە دونیـاوە و بوونـە ڕابـەر و چاوسـاغ بـۆ خەڵکـی)، بـەو شـێوەیە پاداشـتی چاکەخـوازان دەدەینـەوە، (نـەوەی چـاک و پـاک و خواناسـیان پـێ دەبەخشـین(٨٤)».

## کاردانەوەی باوەڕداران بۆ ناڕەحەتییەکان

ئێستا کاتی ناڕەحەتییە بۆ مسوڵمانان، هەندێک جار سەخت دەبێت هەست بە نائومێدی نەکەیت. زۆربەمان دەپرسین بۆچی ئەمەمان بەسەردا دێت؟ چۆن دەکرێت ئەمە ڕووبدات لە کاتێکدا هیچ هەڵەیەکمان ئەنجام نەداوە؟ چۆن دەکرێت تووشی ئەو جیاکارییە زۆرە ببین لەو وڵاتەی کە لەسەر ئازادی و سەربەستی و دادپەروەری هەمووان بنیات نراوە؟

ئەم هەموو بیرکردنەوانە سروشتین، پێویستە تەماشای پشتی ئەم ڕووداوانەوە بکەین، پێویستە بۆ ساتێک تەماشای پشتی خەیاڵاتەکە بکەین و ئەو ڕاستییەی پشتیەوە ببینین، پێویستە جارێکی تر سەرنج بدەینەوە ئەگەر بمانەوێت ڕاستی پشتی ئەم خەیاڵاتە ببینین.

ڕاستییەکە یەکێکە لە پەند و وانە زۆر دووبارەبووەکانی ناو قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پەیامبەر، ڕاستییە بنچینەییەکە بریتییە لەوەی هەموو شتەکانی ئەم ژیانە تاقیکردنەوەن.

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴿٢﴾﴾ (سورەتی الملک).

«هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدی هێناوە، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکتر و پەسەندترە، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە بەسەر بێباوەڕاندا و لێخۆشبووە لە ئیمانداران(٢)».

لێرەدا پەروەردگار پێمان دەفەرموێت: مەبەست لە دروستبوونی ژیان و مردن بریتییە لە تاقیکردنەوەی ئێمە، بۆ ساتێک بیر لە هۆڕنی فریاکەوتن بکەرەوە، ئایا مەبەست لێی چییە؟ هۆرنەکە ئاماژەیەک و ئاگادارکردنەوەیەکە کە شتێکی زیانبەخش بەڕێوەیە. تووشی ترس دەبین کاتێک گوێمان لێی دەبێت، بەڵام چی دەبێت ئەگەر بیانەوێت هۆڕنەکە تاقی بکەنەوە؟ چی دەبێت ئەگەر تەنها بۆ ئەوە بێت بزانرێت کاردانەوەمان چۆن دەبێت؟ هۆڕنی تاقیکردنەوەکە هەمان دەنگی هۆڕنی فریاکەوتنەکەی هەیە، بەڵام ئەمەیان تەنها بۆ تاقیکردنەوەیە. هەرچەندە دەنگ و شێوە و هەستکردن پێی هاوشێوەی هۆڕنی فریاکەوتنی ڕاستەقینەیە، بەڵام ئەمەیان تەنها بۆ تاقیکردنەوەیە. چەندین جار لە ڕێی تاقیکردنەوەکەوە ئەوەمان بیر دەکەوێتەوە.

ئەمەیش هەمان شتە کە پەروەردگار لە بارەی ئەم ژیانەوە لە قورئانی پیرۆزدا پێمان دەفەرموێت: ئەم ژیانە شێوە و دەنگ و هەستکردن پێی زۆر ڕاستەقینە دەردەکەوێت. هەندێک جار دەمانترسێنێت. هەندێک جار دەمانگریێنێت. هەندێک جار وامان لێ دەکات هەڵبێین لەبری ئەوەی ڕێک لە شوێنەکانمان بوەستین. ئەم ژیانە و هەموو شتەکانی ناوی تەنها تاقیکردنەوەن، هیچیان ڕاستەقینە نین، هاوشێوەی سیستەمی پەخشی لەناکاو ڕامان دەهێنێت بۆ شتە ڕاستەقینەکە، ڕاماندەهێنێت بۆ ئەو ڕاستییەی پشتی هۆڕنی تاقیکردنەوەکەوە.

چی دەبێت ئەگەر هۆڕنی تاقیکردنەوەکە هیچ جێی سەرسامی نەبێت؟

چی دەبێت ئەگەر هەمووان ئاگادار بکرێنەوە لەوەی تاقیکردنەوەیەک ئەنجام دەدرێت؟ بۆ ساتێک سەرنج لە ئاگادارکردنەوەی پەروەردگار بدە: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِيٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓاْ أَذًى كَثِيرًا وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾﴾ (سورەتی ال عمران).

«سوێند بێت بێگومان تاقی دەکرێنەوە لە ماڵ و دارایی و خۆیشتاندا (زیان لە ساماندا دەکەن، خۆتان تووشی ناخۆشی و ئازار دەبن)، هەروەها سوێند بێت لە خاوەنانی کتێبی پێش خۆتان و لە موشریک و هاوەڵگەرانەوە ئازارێکی زۆر دەبیستن، بەڵام ئەگەر خۆڕاگر بن و پارێزکار بن و لە پەروەردگار بترسن، بەڕاستی ئەو هەڵوێستە لە کارە پەسەند و کردەوە پایەدارەکانە (١٨٦)».

ئێستا سەرنجی ئەم ئاگادارکردنەوانە بدە کە زانیاریمان پێ دراوە لە بارەی چەندین کۆمەڵگە و نەتەوەی تر کە تووشی هەمان تاقیکردنەوە بوون، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ وَلَمَّا يَأْتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِكُم مَّسَّتْهُمُ ٱلْبَأْسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلْزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصْرُ ٱللَّهِ أَلَآ إِنَّ نَصْرَ ٱللَّهِ قَرِيبٌ ﴿٢١٤﴾﴾ (سورەتی البقرە).

«ئایا لاتان وایە هەروا بە ئاسانی دەچنە بەهەشتەوە بێ تەنگانە و ناخۆشی؟ مەگەر نموونەی ئیماندارانی پێشووتان بۆ باس نەکراوە، کە تووشی شەڕ و ناخۆشی و تەنگانە و گرانی و نەداری بوون و تەکانیان خواردووە و زۆریان بۆ هاتووە بە ڕادەیەک هەتا پەیامبەرەکەیان و ئەوانەی باوەڕیان هێناوە لەگەڵیدا، دەیانوت: کەی پەروەردگار سەرکەوتن دەبەخشێت؟ کەی پەروەردگار یارمەتی دەنێرێت؟ ئاگادار بن و دڵنیا بن بەڕاستی یارمەتی خودایی زۆر نزیکە (٢١٤)».

کەواتە نەک ئەوەی ئاگادارکردنەوەکە پێشبینیکراو بووە، بەڵکوو شتێکی نوێیش نەبووە. وادابنێ بە کۆمەڵگاکەمان ڕاگەیەندرابێت کە تایبەت نین، دوای ئەو هەموو شتە چۆن کاردانەوەمان دەبوو کاتێک ئاگادارکردنەوەکە دەهات؟ ئەگەر تەنها تاقیکردنەوەیەک بێت، ئەوا هیچ ترس و پەشۆکانێک و بێباوەڕییەک ڕوونادات، ناترسین و تەنانەت تووشی پەشۆکانیش نابین، تەنها نمایش دەکەین.

لێرەدا خاڵێکی گرنگ هەیە، ئایا نمایش بۆ کێ دەکەین؟ کێ تاقیمان دەکاتەوە؟ کێ تەماشامان دەکات؟ کەناڵەکانی سی ئێن ئێن، سی سپان، یاخود کۆماری ئەمریکا؟ نەخێر. هەموویان بەشێکن لە خەیاڵاتەکە: هەموویان بەشێکن لە تاقیکردنەوەکە، هەموویان دروستکراوی تاقیکردنەوەکەن، تەنها نمایش و کردار بۆ یەک دادوەر دەکەین، تەنها نمایش بۆ یەک ڕاستی دەکەین. کردار دەکەین، چونکە دەزانین تەماشامان دەکات و تاکە کەسە بڕیار لەسەر ئەم تاقیکردنەوەیە دەدات.

کاتێک ئەم ڕاستییەمان بۆ دەردەکەوێت، شتێکی گرنگ ڕوودەدات. کاتێک بۆمان دەردەکەوێت کە تەنها تاقیکردنەوەیەکە، پرسیارەکانمان بە تەواوی دەگۆڕێن. لەبری پرسینی چۆن دەکرێت ئەمە ڕووبدات؟ «بۆچی ئەم ژیانە هێندە نادادپەروەرە؟»

پرسیارەکانمان دەگۆڕێن بۆ «دەبێت کاردانەوەم چۆن بێت؟»، «چۆن دەبێت لەم تاقیکردنەوەیەدا دەربچم؟» «دەبێت چی لێوە فێر ببم؟» دەبێت چۆن لەم خەیاڵاتە، چۆن لە پەروەردگاری ئەو کەسەی ئازارم دەدات، ئەو کەسەی دەمچەوسێنێتەوە و تاقیکردنەوەکە بڕوانم؟»

«چۆن دەتوانین ئەم تاقیکردنەوەیە بەکار بهێنین بۆ نزیکبوونەوەمان لە وێستگەی کۆتاییمان کە پەروەردگارە؟» و «چۆن

دەتوانین ئەم تاقیکردنەوەیە بەکار بهێنین بۆ بەدەستهێنانی ئامانجی سەرەکی تاقیکردنەوەکە؟ وەکو ئامرازێک بۆ نزیکبوونەوەمان لە پەروەردگار؟ الله اکبر –پەروەردگار گەورەیە.

سەرنجڕاکێشیی تاقیکردنەوەکانی پەروەردگار لەوەدایە کە پێش هاتنیان ئاگادارمان دەکاتەوە و ڕەچەتەی تەواومان پێ دەدات بۆ زاڵبوون بەسەریاندا: ئارامگرتن و تەقوا.

پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِۖ فَمَن زُحْزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدْخِلَ ٱلْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَۗ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ۝١٨٥ ۞لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًاۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ۝١٨٦﴾ (سورەتی ال عمران).

«هەموو کەسێک دەبێت بمرێت و مردن بچێژێت، تەنها لە ڕۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتتان بە تەواوی پێ دەدرێت، ئەوسا ئەوەی دوور خرایەوە لە ئاگری دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە، ئەوە بەڕاستی سەرفراز بووە، ژیانی ئەم دونیایە جگە لەوەی رابواردنێکی خەڵەتێنەرە، شتێکی تر نییە (١٨٥)، سوێند بێت بێگومان تاقی دەکرێنەوە لە ماڵ و دارایی و خۆیشتاندا، (زیان لە ساماندا دەکەن، خۆتان تووشی ناخۆشی و ئازار دەبن)، هەروەها سوێند بێت لە خاوەنانی کتێبی پێش خۆتان و لە موشریک و هاوەڵگەرانەوە ئازارێکی زۆر دەبیستن، بەڵام ئەگەر خۆڕاگر بن و پارێزکار بن و لە پەروەردگار بترسن، بەڕاستی ئەو هەڵوێستە لە کارە پەسەند و کردەوە پایەدارەکانە (١٨٦)».

پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا جەخت لەم دوو خاڵە گرنگە دەکاتەوە بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەر پلانێکی زیانبەخش کە دژی ئێمە دادەنرێت: ﴿إِن تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِن تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ

يَفْرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصْبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿١٢٠﴾ (سورەتی ال عمران).

«ئەگەر چاکەیەکتان تووش بوو، یاخود خێرێک ڕووی تێکردن، ئەوا پێی غەمبار دەبن و پێیان ناخۆشە، خۆ ئەگەر بەڵا و ناخۆشییەکتان بۆ پێش بێت، ئەوا پێی دڵخۆش دەبن، جا ئەگەر خۆگر بن و پارێزکار بن، پیلان و تەڵەکەی ئەوانە هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێت، چونکە بەڕاستی پەروەردگار دەوری پیلان و پیلانگێڕانی داوە و ئاگادارە بە هەموو کار و کردەوە و نەخشەیەکیان (١٢٠)».

وەک بەشێک لە ڕێگای زاڵبوونمان بەسەر ئەم تاقیکردنەوانەدا، پەروەردگار ئاگادارمان دەکاتەوە لەبارەی کاردانەوەی ئەوانەی کە پێش ئێمە تاقی کراونەتەوە، ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدْ جَمَعُواْ لَكُمْ فَٱخْشَوْهُمْ فَزَادَهُمْ إِيمَٰنًا وَقَالُواْ حَسْبُنَا ٱللَّهُ وَنِعْمَ ٱلْوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾ فَٱنقَلَبُواْ بِنِعْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضْلٍ لَّمْ يَمْسَسْهُمْ سُوٓءٌ وَٱتَّبَعُواْ رِضْوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ (سورەتی ال عمران).

«ئەوانەی کە خەڵکی باوەڕ لاواز پێیان دەڵێن: بەڕاستی خەڵکی بێباوەڕ و خوانەناس خۆیان بۆ ئێوە کۆ کردۆتەوە و خۆیان مەڵاس داوە، لێیان بترسن، بەڵام ئیمانداران باوەڕیان زیاتر دامەزراو دەبێت وتیان: پەروەردگارمان بەسە کە یاریدەدەر و یارمەتیدەرێکی چاکە (١٧٣)، پاشان مسوڵمانان گەڕانەوە هاوڕێ لەگەڵ فەزڵ و ناز و نیعمەتی ئیلاهیدا، هیچ ناخۆشییەکیان بۆ پێش نەهات، چونکە شوێنی ڕەزامەندی پەروەردگار کەوتبوون، پەروەردگاریش هەر خۆی خاوەن فەزڵ و ڕێزێکی زۆرە (١٧٤)، ئەوە بەڕاستی تەنها شەیتانە یاوەرەکانی خۆی دەترسێنێت، ئێوەی ئیماندار لێیان مەترسن، بەڵکوو هەر لە من بترسن ئەگەر ئیماندارن.(١٧٥)».

له چەند ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسْتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوْلَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسْرَافَنَا فِيٓ أَمْرِنَا وَثَبِّتْ أَقْدَامَنَا وَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا وَحُسْنَ ثَوَابِ ٱلْأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٤٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾ بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ ﴿١٥٠﴾﴾ (سورەتی ال عمران).

«چەندەها پەیامبەر هەبوون کە خواناس و پیاوچاکانی زۆر لەگەڵیدا بوون و دژ بە دوژمنان جەنگاون، جا ئەوانە هیچ کات سستی و بێزاری و بێتاقەتی ڕووی تێنەکردوون بەهۆی ئەوەی کە تووشیان هاتووە لەپێناو ڕێبازی پەروەردگاردا، لاواز و بێهێز و سەرشۆڕ نەبوون بۆ دوژمنان، پەروەردگار ئەو ئارامگر و خۆڕاگرانەی خۆش دەوێت (١٤٦)، ئەو کاتە گوفتاریان تەنها ئەمە بووە کە وتوویانە: پەروەردگارا لە گوناه و هەڵەکانمان ببوورە و لە زیادەڕەوی کاروبارمان خۆش بە، دامەزراومان بکە، سەرمان بخە بەسەر ئەم گەلە بێباوەڕەدا (١٤٧)، ئەوسا ئیتر پەروەردگار پاداشتی دونیای پێ بەخشین و پاداشتی چاکی قیامەتیشی بۆ مسۆگەر کردن، پەروەردگار ئەو چاکەکارانەی خۆش دەوێت(١٤٨)، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر ملکەچ و گوێڕایەڵی ئەوانە بن کە کافر و بێدینن، ئەوە بەرەو دوا دەتانگێڕنەوە و پاشگەزتان دەکەنەوە و لە دین وەرتاندەگێڕن، پاشان بە دۆڕاوی دەگەڕێنەوە(١٤٩)، دڵنیا بن کە خوانەناسان یارویاوەری ئێوە نین، بەڵکوو پەروەردگار یار و یاوەرتانە، بێگومان ئەو زاتە چاکترین پشتیوان و یاریدەدەرتانە(١٥٠)».

پەروەردگار ئەم چیرۆکانەمان بۆ دەگێڕێتەوە تاکو پەند و

وانەیان لێوە فێر بین. کاردانەوەی کەسانی پێش ئێمە بریتی بووە لە «پەروەردگار بەسە بۆمان و هەر خۆی باشترین پارێزەرە»، «پەروەردگارمان، لە تاوانەکان و زیادەڕەوییەکانمان خۆش ببە، جێگیرمان بکە و لە دژی بێباوەڕان هاوکاریمان بکە.»

کاردانەوەیان بریتی نەبووە لە تەماشاکردنی تاقیکردنەوەکە، بەڵکوو تەماشای مەبەستی پشت تاقیکردنەوەکەیان دەکرد. لە خەیاڵاتەکەیان دەڕوانی و جەختیان لە پەروەردگار دەکردەوە. تێگەیشتبوون لەوەی پەروەردگار تەنها تاقیکردنەوەکەی ئەنجام نەداوە، بەڵکوو هەر خۆی دەتوانێت بیانپارێزێت. بۆیە پەنایان بۆ پەروەردگار دەبرد لە ڕێی تۆبەکردن و ئارامگرتن و باشکردنی ڕەفتاریان لە ڕێی تەقواوە. لە هەمووی دڵنیاتر پەروەردگار خۆی باوەڕداران دڵنیا دەکاتەوە و بەڵێنی سەرکەوتنیان پێ دەدات: ﴿وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ١٣٩ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ١٤٠ وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٤١ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٢﴾ (سورەتی ال عمران).

«ئەی ئیمانداران کۆڵ مەدەن و سارد مەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەربەرز و سەرفراز و سەرکەوتووترن، ئەگەر ئیمانداری چاک و ڕاست و دروست بن(١٣٩)، ئەگەر زام و سەختی و ناخۆشییەک تووشی ئێوە هاتووە، ئەو خەڵکەیش تووشی هەمان زام و سەختی و ناخۆشی هاتن، ئێمە ئەو ڕۆژگارانە دەستاودەست پێ دەکەین لەناو خەڵکیدا تاکو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پەروەردگار دەریانبخات و هەندێکتان بکات بە شایەت و بە پلەی شەهیدی بگەن، بێگومان پەروەردگار ستەمکارانی خۆش

ناوێت(١٤٠)، بێگومـان پـەروەردگار تاقیتـان دەکاتـەوە تاکو ئەوانـەی ئیمانـدارن پاک و بێگەردیـان بکات، کافرانیش نابووت و ڕیسوا بکات (١٤١)، یاخود وا گومانتـان برد هـەروا بـە ئاسـانی دەچنـە بەهەشتەوە؟ کـە هێشـتا پـەروەردگار دەرینەخسـتووە کامتـان هـەوڵ و کۆشـش و جیهاد و تێکۆشـانی کردووە و کامتان خۆڕاگر و ئارامگر بووە(١٤٢)».

کاتێک چاویلکەکانمـان دەگۆڕیـن کـە لـە ڕێیـەوە ژیانمـان دەبینیـن، کاردانـەوەی ناوەکـی و دەرەکیمـان بـە تـەواوی دەگۆڕێت. کاتێک پیاوچاکانـی پێش ئێمـە تاقی کرانـەوە، تەنهـا بـاوەڕ و پابەندییـان زیادی دەکرد. قورئانـی پیرۆز ئاماژەی پێ دەدات: ﴿وَلَمَّـا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُـونَ ٱلۡأَحۡـزَابَ قَالُـواْ هَـٰذَا مَـا وَعَدَنَـا ٱللَّهُ وَرَسُـولُهُۥ وَصَـدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُـولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُـمۡ إِلَّآ إِيمَـٰنٗـا وَتَسۡـلِيمٗا ﴿٢٢﴾﴾ (سـورەتی الاحزاب).

«کاتێک ئیمانداران ئـەو هەمـوو دەسـتە و گرۆهانەیـان بینـی، وتیان: ئەمـە ئەوەیە کـە پـەروەردگار و پەیامبەرەکەی بەڵێنـی پێ داوین، پـەروەردگار و پەیامبەرەکەی ڕاسـتیان فەرمـوو لـە پێش هاتنیدا، بێگومـان ئـەو دژایەتییـە بـاوەڕ و ملکەچـی نەبێت هیچـی تـری بۆ زیـاد نەکردن و سـووربوون لەسـەر ئیمانەکەیـان(٢٢)».

لەگەڵ ئەوەیشـدا تاکو چاویلکەکانمـان نەگۆڕین، ناتوانیـن لـە دیـوی پشـتەوەی تاقیکردنەوەکان بڕوانین، «چۆن ئەمە بەسـەر ئێمەدا دێت؟» بۆ تێگەیشـتن لـە مەبەسـتی سـەرەکی تاقیکردنەوەکە: ئامرازێکە بۆ پاککردنـەوە و بەهێزکـردن و نزیکبوونـەوەمـان لـە پـەروەردگار، کـە پـەروەردگاری مـن و تـۆ و هەمـوو دوژمنانـە.



## ئەم ژیانە: زیندان یاخود بەهەشت؟

لەنـاو فڕۆکەخانــەدا بـووم، لـە هێڵـی سـەلامەتی وەسـتابووم و چاوەڕێـی بەڕێوەچوونـی لێکۆڵینەوەکـەم دەکـرد. کیژۆڵەیەکـی بچووکم بینی لەگەڵ دایکیدا بوو. کیژۆڵەکە دەگریا و ناساغ دیار بـوو، دایکەکـە ڕۆیشـتە لای جانتاکـە و هەندێـک دەرمانـی داپێـی، نیگـەران بـووم بـە خەمبـاری کیژۆڵەکـە و لەنـاکاو هەسـتم کـرد تەماشـای کەسـێک دەکـەم کـە کەوتۆتـە نێـو تەڵـەوە. ئـەم ڕۆحـە بێتاوان و پاکە زیندانی کراوە لە لایەن جەستەیەکی دونیاییەوە کە نەخۆش دەکەوێت و هەست بە ئازار دەکات و تووشـی نەهامەتی دەبێت، پاشـان ئـەو فەرموودەیـەم هاتـەوە یـاد کـە پەیامبـەر دەفەرموێت: **«الدُّنْيَـا سِـجْنُ الْمُؤْمِـنِ، وَجَنَّـةُ الْكَافِـرِ»**، «ئـەم دونیایـە زیندانـی باوەڕدارانـە و بەهەشـتی بێبـاوەڕان»، (رواه مسـلم).

بـۆ یەکەمجـار بـە شـێوەیەکی زۆر جیاوازتـر لـە پێشـوو لێـی تێگەیشـتم، بـڕوام وایـە زۆرێکمـان بـە هەڵـە لـەم فەرموودەیـە تێگەیشـتوین و لێکدانـەوەی هەڵەمـان بـۆی کـردووە، وا دەزانیـن مەبەسـتی ئـەم فەرموودەیـە بریتییـە لـەوەی کـە بێبـاوەڕان لـەم ژیانـەدا چێـژ و خۆشـی وەردەگـرن، بـەڵام بـاوەڕداران دەبێـت بـە

حەرامەکان و حەڵاڵەکان سنووردار بکرێن و چاوەڕێ بکەن تاکو لە ژیانی دواییدا چێژ و خۆشی وەرگرن. ڕەنگە هەندێکمان وا بیر بکەینەوە کە مەبەست لێی ئەوەیە ئەم ژیانە نەهامەتییە بۆ باوەڕداران و نیعمەتە بۆ بێباوەڕان، بەڵام هەست ناکەم ئەوە هەموو مەبەستەکە بێت. لەناکاو هەستم کرد ڕاستیی پشتی ئەم فەرموودەیە لەو کیژۆڵەیەدا دەبینمەوە، وەک ڕۆحێکی بەندکراو دەردەکەوت، چونکە پەیوەست بوو بە جیهانێکی ترەوە، جیهانێکی باشتر کە هەرگیز نەخۆش ناکەوێت تێیدا.

چی ڕوودەدات ئەگەر بە پێچەوانەوە بێت؟ چی ڕوودەدات ئەگەر ڕۆحەکە وا هەست بکات کە لە بەهەشتدایە؟ ئایا ئەو ڕۆحە دەیەوێت لە شوێنێکی تردا بێت؟ لە شوێنێکی باشتر؟ نەخێر، بەڵکوو ئەو شوێنەیە کە دەیەوێت لێی بێت. بە لای ئەو ڕۆحەوە شوێنێکی باشتر بوونی نییە، کاتێک لە بەهەشتدایت، بیر لەوە ناکەیتەوە لە شوێنێکی باشتردا بیت، تامەزرۆی هیچی تر نابیت. ڕەزامەند و قایلیت بەو شوێنەی کە تێیدایت، ئەمە بارودۆخی بێباوەڕانە. پەروەردگارمان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ۝٧﴾ (سورەتی یونس).

«بەڕاستی ئەوانەی بەنیازی ئامادەبوونی بەر بارەگای ئێمە نین و ڕازی بوون بە ژیانی ئەم دونیایە و پێی دڵخۆش بوون و ئەوانەیش کە خۆیان غافڵ و بێئاگان لە ئاماژە و نهێنی دروستکراوەکانمان».

ئەم جیهانە کاتی و بەئازار و نائومێدکارە بۆ خۆی بەهەشتێکە بە لای ڕۆحە بێباوەڕەکانەوە. ئەم دونیایە هەموو ئەو شتەیە کە دەیزانن. بیهێنە پێش چاوت ئەو جیهانەی کە تێیدا تووشی

نەخۆشی و خوێنڕژان دەبیت و لە کۆتاییدا دەمریت، تاکە بەهەشتێک بوایە. ئەو ئازارە بهێنە پێش چاوت.

ئەوانەی باوەڕیان وایە شوێنێکی باشتر بوونی نییە و ئەم جیهانە باشترین شوێنە زۆر نائارام دەبن کاتێک بۆیان دەردەکەوێت ئەم جیهانە کامڵ و تەواو نییە. زوو تووڕە دەبن و زوو نائومێد دەبن، چونکە وا پێشبینی دەکرا ئەم جیهانە بەهەشتێک بێت بۆ خۆی. دەرک بەوە ناکەن کە شتێکی باشتر بوونی هەیە، چونکە ئەم جیهانە هەموو ئەو شتەیە کە دەیانەوێت. ئەم جیهانە هەموو ئەو شتەیە کە هەوڵی بۆ دەدەن. هەموو توانا و وزە و دەرفەت و بەهرەکانیان کە لە لایەن پەروەردگارەوە پێیان بەخشراوە دەخەنە کار تەنها لەپێناو بەدەستهێنانی ئەم ژیانەدا، لەڕاستیدا هیچ شتێکی تر بەدەست ناهێنن جگە لەوە کە بۆیان نووسراوە.

ڕۆحیان وابەستە بووە بە جەستەیەکی دونیاییەوە، چونکە وا هەست دەکات جەستەکە تاکە بەهەشتە کە هەیەتی و دەیبێت، بۆیە بە ئاسانی دەستبەرداری نابێت. بە هەر نرخێک بێت دەیەوێت پەیوەست بێت پێوەی، دەرهێنانی ڕۆحەکە لەناو بەهەشتەکەی گەورەترین سزا و ئازارە. پەروەردگار وەسفی مەرگی بێباوەڕەکان دەکات بە بچڕاندنی ڕۆحەکە لە جەستەی، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا ۝١﴾ (سورەتی النازعات).

«سوێند بەو فریشتانەی کە گیانی خەڵکی دەکێشن، یان بەو ئەستێرانەی کە لە قوولایی ئاسماندا دەدرەوشێنەوە و دەسوڕێنەوە(١)».

ڕۆحەکە دەبچڕێت، چونکە نایەوێت لە جەستەکە جیا بێتەوە، باوەڕی وابووە جەستەکە بەهەشت بووە، دەرکی بەوە نەکرد کە

شتێکی زۆر گەورەتر و باشتر هەیە، بەڵام بۆ ڕۆحی باوەڕداران تەواو جیاوازە، باوەڕدار لە زینداندان نەک بەهەشت، بۆچی؟ زیندانی چییە؟ زیندانی کەسێکە کە کەوتبێتە تەڵەوە.

زیندانی دوورە لە ماڵ و داهاتەکەی و هیواخوازە لە شوێنێکی باشتردا بێت. جەستە دونیاییەکەی زیندانێکە بۆ باوەڕدار نەک لەبەر ئەوەی کە ئەم ژیانە ناخۆشە بۆ ڕۆحی باوەڕداران، بەڵکوو لەبەر ئەوەی ڕۆحەکە ئارەزوو دەکات لە شوێنێکی باشتردا بێت. ئارەزوو دەکات لە بەهەشتدا بێت. گرنگ نییە ئەم ژیانە چەندە جوان و سەرنجڕاکێش بێت بە لای باوەڕدارانەوە، ئەم ژیانە زیندانێکە بە بەراورد بە ژیانە کامڵ و بێ کەموکوڕییەکەی کە چاوەڕێیان دەکات. ئەم ڕۆحە وابەستەی پەروەردگار و بەهەشتی ڕاستەقینە بووە. دەیەوێت لەوێدا بێت، بەڵام ئەم ژیانە بۆ ماوەیەک ڕێگری لە ڕۆحەکە دەکات بگەڕێتەوە بۆ بەهەشت. ئەم ژیانە بەربەستێک و زیندانێکە. هەرچەندە دڵی باوەڕدار تەنها بەهەشتی ئەم ژیانە لەخۆ دەگرێت، بەڵام ڕۆح هێشتا تەماشای پشتی دەکات. ڕۆحەکە تەماشای بەهەشتەکەی خۆی دەکات، بەڵام ئەم ڕۆحە دەبێت بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لەنێو زیندانی جەستەدا بێت. دەبێت کاتەکەی تەواو بکات پێش ئەوەی بگەڕێتەوەناو بەهەشت. وابەستەبوونی ڕۆحی باوەڕدار بۆ جەستەکە نییە. کاتێک ماوەی سزاکە تەواو دەبێت و بە زیندانییەکە دەوترێت بگەڕێتەوە بۆ بەهەشت، هەرگیز وابەستەی زیندانەکە نابێت. پەروەردگار بە شێوەیەکی زۆر جیاواز باسی مردنی باوەڕداران دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشۡطٗا۝٢﴾ (سورەتی النازعات)، «سوێند بەو فریشتانەی کە گیانی ئیمانداران دەکێشن بە چالاکی و بێوچان دەسووڕێنەوە(٢)».

ڕۆحی باوەڕدار زۆر بە ئاسانی لە جەستە دەردێت. ماوەی سزاکەی کۆتایی هاتووە و دەگەڕێتەوە ناو بەهەشت. هاوشێوەی ڕۆحی بێباوەڕ نامێنێتەوە کە وا هەست دەکات لە باشترین شوێندایە. نەمتوانی بەراوردێکی زۆر باشتر لەوە بکەم کە لە لایەن پەیامبەری خۆشەویستمانەوە بەکار هێنراوە. لەڕاستیدا ئەم ژیانە زیندانێکە بۆ باوەڕداران و بەهەشتێکە بۆ بێباوەڕان، هەموومان لە لایەن هەمان بانگکەرەوە بانگ دەکرێینەوە، پرسیارەکە ئەوەیە ئایا بەو شێوەیە دەژین کە ئەگەر بانگەکە بکرێت وابەستەی زیندانەکە دەبین؟ یاخود بەو شێوەیە دەژین کە بانگەکە بانگی ڕزگاری بێت، بانگکردنێک بێت بەرەو بەهەشت.

# پەیوەندیمان
# لەگەڵ پەروەردگاردا

پەروەردگار تێکت دەشکێنێت تاکو دروستت بکات.
دادەبڕێت تاکو پێت ببەخشێت. ئازارەکانی ناو دڵت
بۆ ئەوەیە کەمتر تامەزرۆی ئەم ژیانە بیت و زیاتر
تامەزرۆی بەهەشت بیت.



## گەڕان بە دوای پەروەردگاردا

تەواوی ژیانم بە دوای پەروەردگاردا گەڕاوم، بەڵام دەرکم پێی نەکرد. کاتێک لەو شتانە دەکۆڵینەوە کە لەم ژیانەدا بەدوایدا وێڵین لە هاوەڵێک و هەموو شتێکی تردا بۆمان دەردەکەوێت هەردوو باوەڕداران و بێباوەڕان بە دوای پەروەردگاردا وێڵن، پەروەردگار دیزاینەرەکەیە.

جا باوەڕدار بیت، یاخود بێباوەڕ، پەروەردگار دیزاینەری پێویستییەکان و ویستەکان و ئارەزووەکانتە. پاڵنەری ناوەکی دروست کردووە تاکو لەگەڵ ویستی سروشتیدا بگونجێت کە تەوحیدە.

ساتێک بیر لەو شتە بکەرەوە کە من و تۆ بەدوایدا وێڵین، بۆ نموونە چیت لە هاوەڵێک دەوێت؟ بە دوای چیدا ڕادەکەین و هەموو شتێک دەبەخشین لەپێناو ئەوەی بیبیستین؟

خۆم ئاگادارت دەبم.

هەموو شتێک باش دەبێت.

هەمیشە خۆشم دەوێیت، خۆشەویستیم بۆت هەرگیز کۆتایی نایات و ناگۆڕێت.

دەتوانیت پشتم پێ ببەستیت.

هەرگیز نائومێدت ناکەم.
هەرگیز ئازارت نادەم.
هەرگیز جێتناهێڵم.
هەمیشە لێرە دەبم بۆت.
سوپاست دەکەم.
دەتبینم.
لێت تێدەگەم.
دەزانم کێیت.
نزیکم لێت.
دەتبەخشم.
پێویست ناکات کامل و بێکەموکوڕی بیت.
هەرگیز بەجێت ناهێڵم.
هەرگیز خیانەتت لێ ناکەم.
پشتتم گرتووە.
خۆم گرفتەکانت چارەسەر دەکەم.
گوێم گرتووە، بەڕاستی گوێم گرتووە.
هەرگیز ناهێڵم ئازارت بدەن.
هەمیشە دەتپارێزم.
هەرگیز بە تەنها نیت.
کاتێک هەموو شتەکانی چواردەورت لەناو دەچن و دادەڕوخێن، من ڕاتدەگرم.
بەڕاستی باشترین شتم دەویَ بۆت.
لێت خۆش دەبم تەنانەت کاتێک هەڵە دەکەیت.
من هەمیشە پێت دەبەخشم، تەنانەت کاتێک کە ناتوانیت ببەخشیت.
میهرەبان دەبم و جێتناهێڵم، تەنانەت کاتێک کە دژم دەجەنگیت.

گرنگ نییه چی دەکەیت، من هەمیشە دەتبەخشم.
خۆشم دەوێیت سەرەڕای لاوازی و هەڵەکانت.
ئارامیت پێ دەبەخشم.
دڵخۆشت دەکەم.
سەقامگیرت دەکەم.
هێز و توانات پێ دەبەخشم.
چارەسەرت دەکەم.
پلە و ڕێزت پێ دەبەخشم.
هەمیشە دڵنەواییت دەکەم.

گرنگ نییە ئامآژەکە چەندە بچووکە، ئەگەر لەپێناو مندا ئەنجامی بدەیت، پێی دەزانم و پاداشتت دەکەم.

ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ لام، لێرە دەبم بۆت، گرنگ نییە چی ڕوویدات.

گرنگ نییە چیت بەرامبەرم کردووە، هەمیشە دەتوانم بتبەخشم.

ڕاستییەکە ئەوەیە کاتێک بۆ هاوسەرێکی باش و کارێکی باش و پارەیەکی زۆر و ناوبانگی زۆر دەگەڕێین، بۆ پەروەردگار دەگەڕێین، چونکە هیچ جێی سەرسامی نییە کە نائومێد دەبین کاتێک هاوسەر، کار، پارە و ناوبانگەکە پێویستی و بۆشاییەکانمان پڕ ناکەنەوە، تەنانەت ئەو بۆشاییەیش خۆی لە خۆیدا بۆ مەبەستێک دروست کراوە تاکو هانمان بدات پڕی بکەینەوە.

کێشەکە ئەوەیە هەوڵ دەدەین بە شتانێکی هەڵە پڕی بکەینەوە. هەموو شتێک لە ئێمەدا دروست کراوە تاکو بتوانین لە گەشتەکەماندا پڕکەرەوەیەکی ڕاستەقینە کە پەروەردگارە، بدۆزینەوە. واتا تەنانەت شەیتان و نەفس ئەگەر بە دروستی کار بکەن دەکرێت ببنە هۆکار بۆ گەیشتن بە پەروەردگار، شەیتان و نەفس دوژمنی ئێمەن. ئەوە ڕاستییە، بەڵام چۆن خۆمان لێیان بپارێزین؟

ئایا خەڵکی دەتوانن یارمەتیدەر بن؟ ئایا پارە دەتوانێت یارمەتیدەر بێت؟ ئایا هێزی جیهانی و چەک دەتوانن لە گەورەترین دوژمنەکانمان بمانپارێزن؟ تاکە پەناگە کوێیە بۆ پاراستنمان لە شەیتان و نەفسمان؟ تاکە پەناگە پەروەردگارە. وەک ئەوەیە زریانێک بنێردرێت تاکو پاڵمان بنێت بۆ تاکە پەناگەیەک کە هەیە، پاڵمان بنێت بەرەو لای پەروەردگار.

تەنانەت تاوانەکانیشت دەکرێت بەکار بێت بۆ پاڵنانت بەرەو لای پەروەردگار، کێ دەتوانێت لە تاوانەکانت خۆش بێت؟ لە کوێی تر دەتوانیت پەناگەیەک بدۆزیتەوە بۆ پاراستنت لە زریان و ترسی تاوانەکانت؟ کێی تر دەتوانێت گرنگیان پێ بدات و بیانسرێتەوە؟ تەنانەت بیانگۆڕێت بە خێر و چاکە؟

ترسەکانت دەکرێت ببنە هۆکار، کێی تر دەتوانێت پارێزگاریت لێ بکات کاتێک دەترسیت؟ کێی تر دەتوانێت دڵنیایی و سەلامەتیت بۆ فەراهەم بکات، کاتێک لە ناوەڕاستی زەریایەکدا بە تەنها جێهێڵراویت؟ کێی تر دەتوانێت شتت بۆ دابین بکات، کاتێک هەژاریت؟ کێی تر دەتوانێت دڵخۆشت بکات کاتێک خەمباریت؟ کێی تر دەتوانێت دڵ و ژیانت چاک بکاتەوە کاتێک تێکدەشکێیت؟ کێی تر دەتوانێت ژیان بە مردوویەک ببەخشێتەوە؟ کێی تر دەتوانێت چارەسەرت بکات؟ کێی تر دەتوانێت بتپارێزێت؟ کێی تر دەتوانێت ڕێت نیشان بدات کاتێک ون دەبیت؟ کێی تر...؟

واتزانی زریان، زەریا، ترس، خەمباری، هەڵە، لەدەستدان و تێکشکانەکان هەمووی خراپ بوون بۆت، بەڵام ئەوانە تەنها هۆکار بوون. تەنها هۆکارێک بوون تاکو بە دوای پەروەردگاردا بگەڕێیت. بتگەڕێننەوە بەرەو کامڵی و دڵخۆشی و ژیان. بتگەڕێننەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی دەستت پێ کردووە. بتگەڕێننەوە بۆ هەموو ئەو شتەی بەڕاستی بۆی دەگەڕێیت. بتگەڕێننەوە بەرەو لای پەروەردگار.

## نوێژ: مەبەستە لەبیرکراوەکەی ژیان

بە درێژایی ژیان مرۆڤ چەندین گەشتی ئەنجام داوە، بەڵام گەشتێک هەیە کە کەس تاکو ئێستا ئەنجامی نەداوە جگە لە یەک کەس. گەشتەکە لەسەر گوازەرەوەیەک بووە کە هیچ مرۆڤێک تاکو ئێستا بەکاری نەهێناوە، بە ڕێگایەکدا ئەنجام دراوە کە هیچ کەسێک تاکو ئێستا نەیبینیوە، بۆ شوێنێک بووە کە هیچ دروستکراوێک پێشتر پێی نەخستۆتە ناویەوە. ئەوە گەشتی پیاوێک بوو بۆ چاوپێکەوتنی لەگەڵ پەروەردگاردا، گەشتەکەی پەیامبەرمان موحەممەد بوو بۆ بەرزترین تەبەقی بەهەشت.

ئەو گەشتە گەشتی ئیسڕا و میعراج بوو، لەو گەشتەدا پەروەردگار پەیامبەری برد بۆ حەوتەمین تەبەقی بەهەشت، شوێنێک تەنانەت جبرائیلیش نەیتوانی بچێتە ناوی، هەموو پەیام و فەرمان و ڕێنماییەک لە ڕێگای جبرائیلەوە دەنێردرا بۆ پەیامبەرمان، بەڵام یەک فەرمان هەیە کە لە ڕێی جبرائیلەوە نەنێردراوە، بەڵکوو پەروەردگار خۆی ڕاستەوخۆ بە پەیامبەری فەرمووە.

فەرمانەکە زۆر گرنگ بوو کە پەروەردگار پەیامبەری بۆ لای خۆی بەرز کردەوە تاکو ڕاستەوخۆ لە بارەیەوە قسەی لەگەڵدا

بكات، ئەو فەرمانە بریتی بوو لە نوێژ، کاتێک پەیامبەرمان یەکەمین جار فەرمانی نوێژی پێ کرا، بریتی بوو لە پەنجا نوێژ لە ڕۆژێکدا.

دوای داواکردنی لە پەروەردگار بۆ کەمکردنەوە و ئاسانکردنی، فەرمانەکە لە کۆتاییدا کەمکرایەوە بۆ پێنج نوێژ لە ڕۆژێکدا، بەڵام بە پاداشتی پەنجا نوێژ.

بە تێڕامان لەم ڕووداوە، زانایان ڕوونیان کردۆتەوە کە پرۆسەی کەمکردنەوەی پەنجا نوێژ بۆ پێنج نوێژ بە مەبەست بووە، بۆ ئەوە بووە گرنگی نوێژ لە ژیانماندا دەربخات. بیهێنە پێش چاو ئەگەر ڕۆژی پەنجا نوێژمان ئەنجام بدایە، ئایا دەمانتوانی هیچ شتێکی تر ئەنجام بدەین جگە لە نوێژ؟ نەخێر، ئەوە مەبەستە سەرەکییەکەیە. چی ڕێگایەکی تر لەوە باشتر دەتوانێت مەبەستی سەرەکی ژیانمان ڕوون بکاتەوە؟

وەک ئەوەیە بوترێت نوێژ بریتییە لە ژیانی ڕاستەقینەمان: هەموو ئەو شتانەی تر کە لە ژیانماندا ئەنجامیان دەدەین تەنها چەند جووڵەیەکن. هێشتا بە شێوەیەک دەژین وەک ئەوەی پێچەوانەکەی ڕاست بێت. نوێژ شتێکە کە ڕۆژانە بە زۆر شوێنی بۆ دەکەینەوە و کاتی بۆ تەرخان دەکەین، هەر کاتێک دەرفەتمان هەبوو ئینجا ئەنجامی دەدەین. ژیانمان پەیوەست نییە بە نوێژەوە، بەڵکوو نوێژ پەیوەستە بە ژیانمانەوە. ئەگەر لە پۆلدا بین، نوێژەکانمان فەرامۆش دەکەین بۆ دوای تەواوبوونی وانەکان. ئەگەر لە مۆڵێکدا بین، ئەوا کڕینی پێویستییەکانمان گرنگتر دەبن لە نوێژەکانمان، شتێکی تەواو هەڵەیە کە تاکە مەبەستی سەرەکی ژیانمان فەرامۆش دەکەین تاکو تەماشای یارییەکی باسکە بکەین.

ئەمە سەبارەت بەو کەسانەی کە نوێژەکانیان ئەنجام دەدەن، بەڵام کەمتەرخەمن تێیدا. کەسانێک هەن نەک ئەوەی کەمتەرخەمن

تێیدا، بەڵکوو هەرگیز نوێژەکانیان ئەنجام نادەن. واز لە نوێژ دەهێنین، بەڵام هەست بەوە ناکەین کە هیچ زانایەک تاکو ئێستا نەیوتووە ئەنجامدانی زینا بێباوەڕت دەکات، هیچ زانایەک تاکو ئێستا ئەو بۆچوونەی نەبووە کە دزی و خواردنەوە و بەکارهێنانی دەرمانی بێهۆشکەر بێباوەڕت بکات، هیچ زانایەک باسی ئەوەی نەکردووە کە کوشتن بێباوەڕت بکات، بەڵام هەندێک لە زانایان لە بارەی نوێژەوە فەرموویانە ئەو کەسەی نوێژ ئەنجام نەدات لە مسوڵمانان نییە. ئەمەیش بە پشتبەستن بەم فەرموودەیەی پەیامبەرمان کە فەرموویەتی: «**الْعَهْدُ الَّذِي بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ الصَّلاَةُ فَمَنْ تَرَكَهَا فَقَدْ كَفَرَ**».

«ئەو بەڵێنەی لەنێوان مسوڵمان و بێباوەڕدا هەیە بریتییە لە نوێژ، ئەگەر کەسێک واز لە نوێژ بهێنێت، بێباوەڕ دەبێت.» (**رَوَاهُ أَحْمَدُ وَالتِّرْمِذِيّ وَالنَّسَائِيّ وَابْن مَاجَه**).

بیر بکەرەوە لە کردارێک کە پەیامبەر بەو شێوەیە لە بارەیەوە بدوێت. بۆ ساتێک بیر بکەرەوە شەیتان چی هەڵەیەکی ئەنجام دا؟ شەیتان باوەڕی بە پەروەردگار هەبوو، بەڵام ڕەتی کردەوە سوجدەیەک ببات. بیر بکەرەوە ڕۆژانە ئەو هەموو سوجدەیە ڕەت دەکەینەوە. بیر لە مەترسی ئەو ڕەتکردنەوەیە بکەرەوە، بیر بکەرەوە چەندە بە سانایی بیرمان لە نوێژ کردۆتەوە. نوێژ یەکەمین شتە کە لە ڕۆژی دواییدا لە بارەیەوە پرسیارمان لێ دەکرێت، بەڵام کۆتا شتە کە بە خەیاڵماندا دێت. پەیامبەر فەرموویەتی: (**إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ العَبْدُ يَوْمَ القِيَامَةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلاَتُهُ، فَإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفْلَحَ وَأَنْجَحَ، وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خَابَ وَخَسِرَ**).

«یەکەم شت کە لە بارەیەوە پرسیار لە خەڵکی دەکرێت لە ڕۆژی زیندووبوونەوەدا بریتییە لە نوێژ. ئەگەر بە شێوەیەکی باش

و ڕێک ئەنجامی دابێت، ئەوا سەرکەوتوو و سەرفراز دەبێت. [illegible]ر کەموکوڕی زۆر تێدا کردبوو، ئەوا دۆڕاو و خەسارەتمەند [illegible]ت». (رواه الترمـذي).

لەو ڕۆژەدا خەڵکی بەهەشت پرسیار لە دۆزەخ[illegible]ان دەکەن: بۆچی چوونەتە ناو دۆزەخەوە؟ پەروەردگار لە ق[illegible]دا بە دەقیقی وەڵامی دۆزەخییەکانمان پێ دەفەرموێت: ﴿مَا [illegible]كُمْ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُوا۟ لَمْ نَكُ مِنَ ٱلْمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾﴾ (سورةتی [illegible]ر).

«چی شتێک ئێوەی هێناوەتە [illegible]اگری دۆزەخەوە؟ دۆزەخییەکان دەڵێن: لە دەستەی [illegible]ێژخوێنان نەبووین.»

ئایا دەبێت چەند کەسمان لەوان[illegible] کە دەڵێن: «لە دەستەی نوێژخوێنان نەبووین، لەو کەسانە[illegible]ین کە نوێژەکانیان لە کاتی خۆیدا ئەنجام دەدا، یاخود لەو[illegible]انە نەبووین کە نوێژەکانیان کردبوویە ئامانجی لەپێشینە[illegible]انیان؟» بۆچی ئەگەر لە پۆل، یان لەسەر کار بین، یاخو[illegible]کاتی نوێژی بەیانیاندا کە خەومان لێ دەکەوێت، ئەگەر پ[illegible]تمان بە بەکارهێنانی تەوالێت بێت، کاتی بۆ تەرخان دەک[illegible] لە ڕاستیدا پرسیارەکە زۆر نالۆژیکانە دیارە، تەنانەت بیر[illegible]ی لێ ناکەینەوە. تەنانەت ئەگەر گرنگترین تاقیکردنەوەی ژیا[illegible] ئەنجام بدەین، هەر کاتێک پێویست بکات بڕۆین ئەوا دە[illegible]، بۆچی؟چونکە دەرئەنجامی نەڕۆیشتنمان هیچ بژاردەیەکما[illegible]اتە بەردەم.

زۆر ک[illegible]ەڵێن کاتمان نییە نوێژەکانمان بکەین، کاتێک لەسەر کار و ل[illegible]ابخانە و لە دەرەوەن، بەڵام چەند کەس تاکو ئێستا وتوو[illegible]کە کاتییان نییە بۆ تەوالێت کاتێک لە دەرەوەن و لەسەر کا[illegible] لە خوێندنگان، لەبری ئەوە حەفازەیان بەکار هێناوە؟ چەند

کەس لە ئێمە حەز ناکات لە کاتی نوێژی بەیانیاندا هەڵبسێت ئەگەر پێویستمان بە تەوالێت بێت، بەڵکوو ئەو بژاردەیە هەڵبژێرین کە جێی نوستنەکەمان تەڕ بکەین؟

ڕاستییەکە بریتییە لەوەی کە لە جێگاکەمان دەردەچین، یاخود پۆل بەجێ دەهێڵین، یاخود لە کارکردن دەوەستین بۆ ئەوەی بڕۆین بۆ تەوالێت، نەک ئەنجامدانی نوێژەکانمان.

شتەکە کۆمیدی دیارە، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە پێویستییە جەستەییەکانمان دەخەینە پێش پێویستییە ڕۆحییەکانمانەوە. خواردن بە جەستەمان دەدەین، چونکە دەمرین ئەگەر وا نەکەین، بەڵام زۆرێک لە ئێمە ڕۆحمان برسی دەکەین، لە بیری دەکەین کە ڕۆحمان دەمرێت ئەگەر نوێژەکانمان ئەنجام نەدەین. ئەو جەستەیەی کە زۆر گرنگی پێ دەدەین کاتییە، بەڵام ئەو ڕۆحەی فەرامۆشی دەکەین هەمیشەیی و هەتاهەتاییە.

و ڕێک ئەنجامی دابێت، ئەوا سەرکەوتوو و سەرفراز دەبێت. ئەگەر کەموکورِی زۆر تێدا کردبوو، ئەوا دۆڕاو و خەسارەتمەند دەبێت»، (رواه الترمـذي).

لەو ڕۆژەدا خەڵکی بەهەشت پرسیار لە دۆزەخییەکان دەکەن: بۆچی چوونەتە ناو دۆزەخەوە؟ پەروەردگار لە قورئاندا بە دەقیقی وەڵامی دۆزەخییەکانمان پێ دەفەرموێت: ﴿مَا سَلَكَكُمْ فِي سَقَرَ ۝٤٢ قَالُوا لَمْ نَكُ مِنَ الْمُصَلِّينَ ۝٤٣﴾ (سورةتی المدثر).

«چی شتێک ئێوەی هێناوەتە نێو ئاگری دۆزەخەوە؟ دۆزەخییەکان دەڵێن: لە دەستەی نوێژخوێنان نەبووین.»

ئایا دەبێت چەند کەسمان لەوانە بین کە دەڵێن: «لە دەستەی نوێژخوێنان نەبووین، لەو کەسانە نەبووین کە نوێژەکانیان لە کاتی خۆیدا ئەنجام دەدا، یاخود لەو کەسانە نەبووین کە نوێژەکانیان کردبوویە ئامانجی لەپێشینەی ژیانیان؟» بۆچی ئەگەر لە پۆل، یان لەسەر کار بین، یاخود لە کاتی نوێژی بەیانیاندا کە خەومان لێ دەکەوێت، ئەگەر پێویستمان بە بەکارهێنانی تەوالێت بێت، کاتی بۆ تەرخان دەکەین؟ لە ڕاستیدا پرسیارەکە زۆر نالۆژیکانە دیارە، تەنانەت بیریشی لێ ناکەینەوە. تەنانەت ئەگەر گرنگترین تاقیکردنەوەی ژیانمان ئەنجام بدەین، هەر کاتێک پێویست بکات برۆین ئەوا دەڕۆین، بۆچی؟چونکە دەرئەنجامی نەڕۆیشتنمان هیچ بژاردەیەکمان ناخاتە بەردەم.

زۆر کەس دەڵێن کاتمان نییە نوێژەکانمان بکەین، کاتێک لەسەر کار و لە قوتابخانە و لە دەرەوەن، بەڵام چەند کەس تاکو ئێستا وتوویانە کە کاتییان نییە بۆ تەوالێت کاتێک لە دەرەوەن و لەسەر کارن و لە خوێندنگان، لەبری ئەوە حەفازەیان بەکار هێناوە؟ چەند

کەس لە ئێمە حەز ناکات لە کاتی نوێژی بەیانیاندا هەڵبسێت ئەگەر پێویستمان بە تەوالێت بێت، بەڵکوو ئەو بژاردەیە هەڵبژێرین کە جێی نوستنەکەمان تەڕ بکەین؟

ڕاستییەکە بریتییە لەوەی کە لە جێگاکەمان دەردەچین، یاخود پۆل بەجێ دەهێڵین، یاخود لە کارکردن دەوەستین بۆ ئەوەی بڕۆین بۆ تەوالێت، نەک ئەنجامدانی نوێژەکانمان.

شتەکە کۆمیدی دیارە، بەڵام ڕاستییەکە ئەوەیە کە پێویستییە جەستەییەکانمان دەخەینە پێش پێویستییە ڕۆحییەکانمانەوە. خواردن بە جەستەمان دەدەین، چونکە دەمرین ئەگەر وا نەکەین، بەڵام زۆرێک لە ئێمە ڕۆحمان برسی دەکەین، لە بیری دەکەین کە ڕۆحمان دەمرێت ئەگەر نوێژەکانمان ئەنجام نەدەین. ئەو جەستەیەی کە زۆر گرنگی پێ دەدەین کاتییە، بەڵام ئەو ڕۆحەی فەرامۆشی دەکەین هەمیشەیی و هەتاهەتاییە.

# نوێژ و خراپترین جۆری دزی

تاکە ناخۆشی دۆزینەوەی ڕێگای ڕاست ئەوەیە کە ڕێگاکە ون دەکەیت. شکستی زۆر هەیە، بەڵام هیچ شکستێک هێندەی شکستهێنان لە دین و ئاییندا تراژیدی نییە. هەندێک جار خوشکێک بڕیاری داوە حیجابەکەی لابەرێت و ژیانێکی جیاواز بژی، هەندێک جار برایەکی چالاک و کارا لە کۆمەڵگادا تووشی دەستە و کۆمەڵێکی خراپ دەبێت. لە هەر یەک لەم چیرۆکانەدا برایان و خوشکانمان زۆر بە خراپی شکست دێنن.

بەداخەوە ئەم چیرۆکانە نامۆ نین. هەندێک جار ناتوانین هیچ بکەین جگە لەوەی تەماشا بکەین و بپرسین چۆن شتی وا دەبێت؟ بۆچی ئەمە ڕوویدا؟ بپرسین چۆن دەبێت کەسێک کە لەسەر ڕێگای ڕاست بووە بەو ڕادەیە لە ڕێگا ڕاستەکە لابدات؟ لەم پرسەدا زۆر جار دەرک بەوە ناکەین، ڕەنگە وەڵامەکە زۆر ئاسانتر و سادەتر بێت لەوەی بیری لێ دەکەینەوە.

خەڵکی تووشی هەموو جۆرەکانی تاوان دەبن، بەڵام تاوانێک هەیە زۆرێک لە خەڵکی تووشی دەبن. تایبەتمەندییەکی هاوبەش هەیە لە هەموو ئەو کەسانەدا کە ژیانێکی پڕ لە تاوان بەسەر

دەبـەن. جـا ئایـا ئـەو کەسـە لەسـەر ڕێـی ڕاسـت بوو‌بێـت و دواتـر تووشـی لادان بووبێت، یاخود ئـەو کەسـە هەرگیز لەسـەر ڕێی ڕاسـت نەبووبێـت هـەر یـەک شـتە و جیاوازی نییـە. ئـەو کەسـە سـەرەتا نوێژەکانی واز لـێ هێنـاوە و کەمـی کردۆتـەوە و فەرامۆشـی کـردووە پێـش ئـەوەی تووشـی شکسـت و لادانەکـە ببێـت.

ئەگـەر کەسـێک نوێـژ ئەنجام بـدات، بـەڵام بـەردەوام ژیانێکی پـڕ لـە تـاوان بەسـەر بەرێت، ئـەو نوێژە تەنهـا کردارێکی جەسـتەییە نـەک دڵ و ڕۆح. تایبەتمەندییەکی گرنگی نوێژ کە زۆر جار فەرامۆش دەکرێت، جگـە لـەوەی چاوپێکەوتنێکـی پیـرۆزە لەگـەڵ پەروەردگارمانـدا، نوێـژ باشـترین پارێزەرە. پـەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۗ وَلَذِكۡرُ ٱللَّهِ أَكۡبَرُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَصۡنَعُونَ ٤٥﴾ (سـورەتی العنکبوت).

«ئـەی پەیامبـەر ئـەوەی بـۆت ڕەوانـە دەکرێت لـە قورئانـی پیرۆزدا بیخوێنـەرەوە و نوێـژ بـە چاکـی ئەنجـام بـدە، چونکـە بەڕاسـتی نوێـژ بەرهەڵسـتی لـە گونـاه و تـاوان دەکات، بێگومـان یـادی پـەروەردگار لـە هەمـوو شـت گەورەتـر و بەنرختـرە، پـەروەردگار خـۆی زانایـە بـە هەمـوو ئـەو کار و کردەوانـەی کـە ئەنجامـی دەدەن(٤٥)».

کاتێـک کەسـێک بڕیـار دەدات واز لـە نوێـژ بهێنێـت، ئـەوا واز لـەو پارێـزەرە دەهێنێت. زۆر گرنگـە لـە یـادت بێت وازهێنـان لـە نوێـژ زۆر جـار ڕاسـتەوخۆ ڕوونـادات، بەڵکـوو بـە قۆنـاغ و هەنـگاوە. سـەرەتا بـەوە دەسـت پـێ دەکات کـە نوێژەکانـت لـە کاتـی خۆیـدا ئەنجـام نادەیـت، پاشـان نوێـژی فەڕزێـک دەبەیـت بـۆ لای فەرزێکـی تـر. دواتـر نوێـژەکان فەرامـۆش دەکەیـت، تاکـو وای لـێ دێـت نوێژنەکـردن دەبێتـە خـوو و نەریـت.

لـە هەمـان کاتـدا شـتێکی تـر ڕوودەدات کـە بـە چـاوی سـەر نابینرێت.

لەگەڵ هەر دواخستن و لەدەستدانی هەر نوێژێکدا جەنگێکی شاراوە هەڵدەگیرسێت، ئەو جەنگەیش لەگەڵ شەیتاندایە کە دوژمنی سەرسەخت و سەرەکی مرۆڤایەتییە. بە وازهێنان لە نوێژەکان، مرۆڤەکان ئەو قەڵغانە دادەنێن کە پەروەردگار پێی بەخشیون، بەبێ قەڵغان و پارێزەر دەچنە گۆڕەپانی جەنگەکەوە، ئەو کات شەیتان دەسەڵاتی تەواوی بە سەریانەوە هەیە. پەروەردگار دەفەرموێت:
﴿وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ﴿٣٦﴾﴾ (سورەتی الزخرف).

«کەسێک خۆی کوێر بکات لە ئاستی قورئان و یادی پەروەردگاری میهرەباندا، ئەوە ئێمە شەیتانێک دەکەینە ملۆزمی و هەمیشە دەبێتە یار و یاوەری و لەگەڵیدا دەبێت(٣٦)».

هیچ جێی سەرسوڕمان نییە کە وازهێنان لە نوێژەکان دەبێتە یەکەم هەنگاوی بەرەو ژیانێکی پڕ شکست و بێبەهایی. ئەو کەسانەی تووشی لادان هاتوون تەنها پێویستە تەماشای ئەوە بکەن لە کوێوە و بە چی هۆیەکەوە لە ڕێگا ڕاستەکە لایانداوە. بۆیان دەردەکەوێت کە بە وازهێنان لە نوێژەکان دەستی پێ کردووە، بە پێچەوانەیشەوە دروستە. ئەوانەی کە دەیانەوێت ژیانیان بگۆڕن بە گرنگیدان بە نوێژەکان و ئەنجامدانیان بە ڕێکی دەست پێ دەکەن. کاتێک نوێژەکانت دەخەیتە ئامانجی لەپێشینەت و دەیخەیتە پێش خوێندنگا، کار، ڕابواردن، کۆبوونەوە، بازاڕکردن، تەلەفزیۆن و یاری تۆپێن، ئەو کاتە دەتوانیت ژیانت بەرەو باشە بگۆڕیت.

گرفتەکە لەوەدایە کە زۆرمان فریومان خواردووە بەوەی دەمانەوێت ژیانمان بگۆڕین پێش ئەوەی دەست بە ئەنجامدانی نوێژەکانمان بکەین. ئەم بیرکردنەوەیەیش تەڵەکەیەکی ترسناکی شەیتانە، چونکە دەزانێت نوێژ وزە و ڕێنیمایی پێویست دەبەخشێت

بـە خەڵکی بۆ گۆڕینـی ژیانیـان. ئـەم جۆرە کەسـانە وەک شـۆفێرێک وان کە ئۆتۆمبیلەکەی خاڵییە لـە سـووتەمەنی و بەنزین، بەڵام سـوورە لەسـەر تەواوکردنـی گەشـتەکەی بێ ئـەوەی تەنکی سـووتەمەنییەکەی پڕ بکاتـەوە. ئـەو کەسـە ناگاتـە هیـچ شـوێنێک. بـە هەمـان شـێوە ئـەو کەسـانە دوای تێپەڕینـی چەندیـن سـاڵ لـە هەمـان شـوێندا دەمێنێـەوە: نوێـژ نەکـردن و نەگۆڕینـی ژیانیـان، شـەیتان ڕووبەڕوویـان دەبێتـەوە و شکسـتیان پـێ دێنێـت.

بـە وازهێنـان لـە نوێژەکانمـان، ڕێگـە بـە شـەیتان دەدەیـن بەهادارتریـن شـتمان لـێ بسـەنێتەوە. مـاڵ و ئۆتۆمبیلەکانمـان زۆر بەهـادار و گرنگـن بۆمـان، کـە هەرگیـز بـێ پاراسـتن جێیـان ناهێڵیـن. تەنانـەت سـەدان دۆلار دەدەیـن بـە سیسـتەمی پاراسـتن و پاسـەوانی تاکو مـاڵ و ئۆتۆمبیلەکانمـان بپارێزیـن، بـەڵام دینەکەمـان بـێ بەرگری جێهێشـتووەتەوە تاکـو لـە لایـەن خراپتریـن دزەوە بدزرێـت، دزێـک کـە پەیمانـی بـە پـەروەردگار داوە ببێتـە دوژمنێکـی سەرسـەختمان تاکـو کۆتایـی ئـەم ژیانـە. دزێـک کـە تەنهـا هەنـدێ کانـزای نەدزیـوە کـە هێمایەکـی مارسـیدزی لەسـەرە، بەڵکـوو دزێکـە ڕۆح و بلیتـی هەمیشـەیی بەهەشـتمان لـێ دەدزێـت.



## گفتوگۆیەکی پیرۆز

کاتێکی شەو هەیە کە هەموو جیهان دەگۆڕێت. لە کاتی ڕۆژدا زۆر جار ژاوەژاو دەست بە سەر تەواوی ژیانماندا دەگرێت. ئەرک و بەرپرسیارێتییەکانی کار و خوێندنگە و خێزان زۆربەی سەرنجمان داگیر دەکەن. جگە لە تەرخانکردنی کات بۆ پێنج نوێژە فەرزەکەی ڕۆژانە، سەختە کاتی تر بۆ تێرامان و تەنانەت پشوودانیش تەرخان بکەین. زۆرێکمان هێندە بە خێرایی دەژین کە هەست ناکەین شتێکمان لەدەست دابێت.

کاتێکی شەو هەیە کە کار کۆتایی دێت، هاتوچۆ دەوەستێت و بێدەنگی باڵ بەسەر جیهاندا دەکێشێت. لەو کاتەدا جیهانی دەوروبەرمان هەموو نوستوون، بەڵام کەسێک هەیە بەئاگایە و چاوەڕێمانە تاکو هانای بۆ بەرین. فەرموودەیەکی قودسی دەفەرموێت: **«يَنْـزِلُ رَبُّنَـا تَبَـارَكَ وَتَعَـالَى كُلَّ لَيْلَـةٍ إِلَى السَّـمَاءِ الدُّنْيَـا حِينَ يَبْقَـى ثُلُثُ اللَّيْـلِ الآخِـرُ، يَقُـولُ: مَـنْ يَدْعُـونِي فَأَسْتَجِيبَ لَـهُ؟ مَنْ يَسْـأَلُنِي فَأُعْطِيَـهُ؟ مَـنْ يَسْـتَغْفِرُنِي فَأَغْفِـرَ لَـهُ».**

«پەروەردگارمان لە سێیەکی شەودا دادەبەزێتە یەکەمین قاتی بەهەشت و دەفەرموێت: کەسێک هەیە هانام بۆ بهێنێت تاکو بتوانم وەڵامی

بدەمەوە؟ کەسێک هەیە داوام لێ بکات تاکو پێی ببەخشم؟ کەسێک هەیە داوای لێخۆشبوونم لێ بکات تاکو لێی خۆش ببم؟»، (مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ).

چـی ڕوودەدات ئەگـەر پادشـایەک بێتـە بـەردەرگای ماڵەکەمـان و هەمـوو شـتێکمان پێشـکەش بـکات کـە دەمانەوێـت؟ ڕەنگـە بڵێیـت تەنانـەت کەسـانی گەمژەیـش زەنگـی ئاگادارکردنەوەکانیـان دەنێنـەوە بـۆ ئـەو جـۆرە چاوپێکەوتنـە. ئەگـەر پێمـان بوترێـت یـەک کاتژمێـر پێـش کازیـوەی بەیـان چەکێکـی بانکـی بـە بـڕی (‎$١٠,٠٠٠,٠٠٠‎) دە ملیـۆن دۆلاری لــە بەردەرگامانـدا دادەنرێـت، ئایـا بەئـاگا نایەیـن بـۆ هەڵگرتنــەوەی چەکـی بانکیەکـە؟

پەروەردگار دەفەرموێت: کە لـەو کاتـەی شـەودا، پێش بەرەبەیان، دێـت بـۆ لای بەندەکانـی، بیهێنـە پێـش چـاو کاتێـک پـەروەردگاری جیهـان گفتوگۆیەکـی پیرۆزمـان لەگەڵـدا ئەنجـام دەدات. پـەروەردگار چاوەڕێمـان دەکات تاکـو بچیـن و گفتوگـۆی لەگەڵـدا بکەیـن، بـەڵام زۆرێکمـان لــە چاوەڕوانیـدا دەیهێڵینــەوە، چونکــە لــە جێگاکەمانـدا نوسـتووین. پـەروەردگار دێت بـۆ لامـان و پرسـیارمان لـێ دەکات کـە چـی شـتێکمان لێـی دەوێـت. پـەروەردگاری هەمـوو دروسـتکراوەکان پێمـان دەفەرموێـت: هـەر شـتێکمان بوێـت پێمـان دەبەخشـێت، کەچـی هێشـتا نوسـتووین.

ڕۆژێـک دێـت پـەردەی فریـودان هەڵدەماڵرێـت. پـەروەردگار لــە قورئانـی پیـرۆزدا دەفەرموێـت: ﴿لَّقَـدۡ كُنـتَ فِي غَفۡلَـةٖ مِّـنۡ هَـٰذَا فَكَشَـفۡنَا عَنـكَ غِطَـآءَكَ فَبَـصَرُكَ ٱلۡيَـوۡمَ حَدِيـدٞ ۝٢٢﴾ (سـورەتی ق).

«بـە بێبـاوەڕان دەوترێـت: سـوێند بـە پەروەرێن بەڕاستی تـۆ لـەم بەسـەرهاتانە بێئـاگا بوویـت و گوێـی خۆتـت لـێ خەواندبـوو، ئیسـتا ئێمـە پەردەمـان لەسـەر چاوەکانـت لاداوە و هەمـوو شـتێک وەکو خـۆی دەبینیت و ئەمـڕۆ چاوەکانـت تیـژە(٢٢)».

لەو ڕۆژەدا هەموو ڕاستییەکان دەردەکەون و ئاشکرا دەبن. لەو ڕۆژەدا تێدەگەین کە دوو ڕکات نوێژ لە هەموو شتەکانی سەر بەهەشت و زەوی خێرتر و باشترە. هەست بە گرنگی چەکی بانکییەکە دەکەین کە لە بەردەم دەرگاکەماندا هەموو شەوێک جێدەهێڵرا لە کاتێکدا ئێمە نوستبووین. ڕۆژێک دێت دەستبەرداری هەموو شتێک دەبین کە لەژێر ئاسمانەکاندایە تەنها بۆ ئەوەی بگەڕێینەوە و ئەو دوو ڕکات نوێژانە ئەنجام بدەین.

ڕۆژێک دێت دەستبەرداری هەموو ئەو شتانە دەبین کە خۆشمان ویستووە لەم ژیانەدا، هەموو شتێک کە دڵ و مێشکمانی داگیرکردووە، هەموو سەرابێک کە بەدوایدا ڕامانکردووە، تەنها بۆ ئەوەی گفتوگۆیەک لەگەڵ پەروەردگاردا ئەنجام بدەین، بەڵام لەو ڕۆژەدا هەندێک کەس هەن کە پەروەردگار ڕوویان لێ وەردەگێڕێت و فەرامۆشیان دەکات، هەروەک چۆن ئەوان پێشتر پەروەردگاریان فەرامۆش کردبوو.

پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا (سورەتی طه)دا دەفەرموێت:
﴿قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِيٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾﴾

«ئەو جۆرە کەسە دەڵێت: ئەی پەروەردگار بۆ بە کوێری حەشرت کردم، خۆ من کاتی خۆی چاوساغ و بینا بووم(١٢٥)، پەروەردگار لە وەڵامدا دەفەرموێت: تۆ بەو شێوەیە بوویت، کوێر بوویت لە ئاستی ئایەت و بەڵگەکانی ئێمەدا کاتێک پێتڕادەگەیەنرا، ئێمەیش ئەمڕۆ ئاوا مامەڵەی کەسێکی لەبیرکراوت لەگەڵدا دەکەین، لە سزا و ئازاردا دەهێڵرێیتەوە(١٢٦)».

هەروەها لە سورەتی (المؤمنون)، ئایەتی (٦٥)دا دەفەرموێت:

﴿لَا تَجْـَٔـرُواْ ٱلْيَـوْمَۖ إِنَّكُـم مِّنَّـا لَا تُنـصَرُونَ ۝٦٥﴾ «لـە قیامەتیشـدا پێیـان دەوترێت ئەمڕۆ ئیتر ئێوە چرکەتان لێوە نەیەت و هاوار نەکەن، چونکە بێگومـان ئێوە لـە لایـەن ئێمـەوە هیـچ جۆرە پشتگیرییەکتان لـێ ناکرێت(٦٥)».

دەتوانیـت بـۆ سـاتێک لـەم ئایەتانـە تێبفکریـت و بزانیـت باسـی چـی دەکـەن؟ باسـی فەرامۆشـکردن و لەبیرکردنـت نـاکات لـە لایـەن هاوڕێیـەک، یاخـود هاوپۆلێکی دێرینـەوە، بەڵکوو باسی فەرامۆشکردن و لەبیرکردنێـک دەکـەن لـە لایـەن پـەروەردگاری جیهانیانـەوە. هیـچ سـزایەک (ئاگـری دۆزەخ، یاخـود ئـاوی کـوڵاو، یاخـود هەڵکەندنـی پێسـتی سـەر...) نییـە سـەختتر و بەئازارتـر بێـت لـەم سـزایە.

هـەروەک چۆن هیچ سـزایەک نییـە سـەختتر و بەئازارتر بێت لـەم سزایە، هیچ پاداشـتێکیش نییـە باشـتر و خێرتـر لـەوەی پەیامبـەر لـەم فەرموودەیـەدا ئاماژەی پـێ داوە:

**إِذَا دَخَـلَ أَهْـلُ الْجَنَّـةِ الْجَنَّـةَ يَقُـولُ اللَّـهُ تَعَـالَى: تُرِيـدُونَ شَـيْئًا أَزِيدُكُـمْ؟ فَيَقُولُـونَ: أَلَـمْ تُبَيِّـضْ وُجُوهَنَـا؟ أَلَـمْ تُدْخِلْنَـا الْجَنَّـةَ وَتُنَجِّنَـا مِـنَ النَّـارِ؟ " قَـالَ: «فَيَرْفَـعُ الْحِجَـابُ فَيَنْظُـرُونَ إِلَى وَجْـهِ اللَّـهِ فَـمَا أُعْطُوا شَـيْئًا أَحَـبَّ إِلَيْهِـمْ مِـنَ النَّظَـرِ إِلَى رَبِّهِـمْ» ثُـمَّ تَـلَا (لِلَّذِيـنَ أَحْسَـنُوا الْحُسْـنَى وَزِيَـادَةٌ).**

«کاتێـک ئەوانـەی شایسـتەی بەهەشـتن، دەچنـە بەهەشـتەوە. پـەروەردگار دەفەرموێـت: «ئایـا هیـچ شـتێکی ترتـان دەوێـت تاکـو پێتـان ببەخشـم؟ بەهەشـتییەکان دەفەرمـوون: ئایـا ڕووخسـارت ڕووناک نەکردووینەتـەوە؟ ئایا نەتخستووینەتە نـاو بەهەشتەوە و لـە ئاگری دۆزەخ نەتپاراسـتوین؟ پـەروەردگار پەردەی سـەر ڕووخسـاری ڕادەماڵێـت و هەمـوو ئـەو شـتانەی کـە پێیـان بەخشـراوە نـاگات بـە پیشـاندانی ڕووخسـاری پـەروەردگاری مـەزن و بـاڵا». (رَوَاهُ مُسـلم).

لەگەڵ ئەوەیشدا پێویست ناکات چاوەڕێ بین تاکو ئەو ڕۆژە بۆ ئەوەی ئەنجامی چاوپێکەوتنەکەی ئەم کاتەی شەو لەگەڵ پەروەردگاردا بزانین. ڕاستییەکە ئەوەیە هیچ وشەیەک نییە بۆ وەسفکردنی ئارامییەکەی ئەم جیهانە لەم جۆرە گفتوگۆیەدا، تەنها ئەو کەسانە هەستی پێ دەکەن کە دەچنە ناو ئەم جۆرە گفتوگۆیەوە. کاریگەرییەکەی لەسەر ژیانی کەسەکان نەخەملێنراوە.

کاتێک ئەزموونی قیام (نوێژی کۆتایی شەو) دەکەیت، تەواوی ژیانت دەگۆڕێت. لەناکاو ئەو بارگرانییەی کە تێکیشکاندیت دەبێتە ڕووناکی، کێشەکان کە چارەیان نەبوو، چارەسەر دەکرێن. ئەو نزیکبوونەوەیەت لە پەروەردگار کە پێی نەدەگەیشتی دەبێتە تاکە ڕزگارکەری ژیانت.



## تاریکترین کاتژمێر و هاتنی بەری بەیان

پەندێک هەیە دەڵێت «فإن ساعه أشد ظلمه هي تلك التي تسبق بزوغ الفجر»، «کاتژمێری پێش بەری بەیان تاریکترین کاتژمێرە»، هەرچەندە لە ڕووی ئەستێرەناسییەوە تاریکترین کاتژمێر لە کاتژمێرەکانی پێشتردایە، ڕاستی ناو ئەم پەندە مەجازییە، بەڵام هیچی کەم نییە لە ڕاستییەکە.

زۆر جار دەبینین بەنرخترین ساتەکان بە دوای سەختترین ساتەکاندا دێن. زۆر جار ئەو ساتەیە کە هەموو شتێک بەسەر یەکدا تێکچووە، بەڵام شتێکی زۆر لەناکاو و پێشبینینەکراو ڕزگارمان دەکات. ئایا پەیامبەر ئەیوب هەموو سەروەت و ماڵ و منداڵی لەدەست نەدا، پێش ئەوەی هەموویی بە زیادەوە بۆ بگەڕێتەوە؟

بەڵێ شەوەکە ڕاست بوو بۆ پەیامبەر ئەیوب، ڕەنگە هەمیشە ڕاست بێت بۆ زۆرێک لە ئێمەیش، بەڵام پەروەردگار ڕێگە بە شەوێکی بێ کۆتا نادات. بەهۆی میهری خۆیەوە خۆرەکەمان پێ دەبەخشێت، بەڵام هەندێک جار هەست دەکەین کە ناڕەحەتییەکانمان کۆتایی نایەن. ڕەنگە هەندێکمان هێندە لاواز ببین لە دینەکەماندا کە هەست بە دابڕان بکەین لە پەروەردگارمان، ڕەنگە بۆ هەندێکمان هێندە تاریک بێت تەنانەت هەستیشی پێ نەکەین.

بەلام هەروەک چۆن خۆر هەڵدێت لە کۆتایی شەودا، بەرەبەیانی ئێمەیش هاتووە و دێت. بەهۆی میهری زۆری خۆیەوە پەروەردگار ڕووناکی مانگی ڕەمەزانی بۆ ناردوین بۆ لابردنی تاریکی شەو. مانگی قورئانی ناردووە تاکو بەرزمان بکاتەوە بەرەو نزیکی لە خۆیەوە و لە تەنهایی ڕزگارمان بکات.

پەروەردگار ئەم مانگە پڕ ڕەحمەتەی بۆ ناردوین تاکو ڕۆحی خاڵیمان پڕ بکاتەوە، تەنهاییمان چارە بکات، ڕۆحمان دەوڵەمەند بکات. پەروەردگار بەرەبەیانی بۆ ناردوین تاکو لە تاریکیدا نوور و ڕووناکی بدۆزینەوە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾﴾ (سورەتی الاحزاب).

«هەر ئەو زاتە خۆی سەڵاوات و ڕەحمەتی خۆیتان بەردەوام و هەمیشە بەسەردا دەبارێنێت، هەروەها فریشتەکانیشی داوای لێخۆشبوونتان بۆ دەکەن بۆ ئەوەی لە تاریکستانەکان دەرتانبکات و ڕزگارتان بکات و بتانخاتە ناو نوور و ڕووناکی دینداریییەوە لە دونیا و بەهەشتی بەرینی لە قیامەتدا، پەروەردگار هەمیشە و بەردەوام بۆ ئیمانداران بەڕەحم و میهرەبان و دلۆڤانە(٤٣)».

ئەم میهرەی پەروەردگار هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە بە شوێنیدا وێڵن، تەنانەت بە تاوانبارترین کەس دەفەرموێت: هەرگیز نائومێد مەبە لە میهر و بەزەیی بێسنووری پەروەردگار. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾﴾ (سورەتی الزمر).

«ئەی پەیامبەر پێیان بڵێ، پەروەردگار دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم

کە زوڵم و ستەمتان لە خۆتان کردووە بەهۆی ئەنجامدانی تاوانی زۆرەوە، نەکەن هەرگیز لە ڕەحم و بەزەیی پەروەردگار نائومێد ببن. بەڕاستی پەروەردگار لە هەموو تاوانەکان خۆش دەبێت، پەروەردگار هەر خۆی بەخشندە و میهرەبانە.»

پەروەردگار خاوەنی میهر و بەزەییە، هیچ کاتێکی تر نییە کە ئەو میهر و بەزەییەمان پێ ببەخشرێت زیاتر لەوەی لە مانگی ڕەمەزاندا پێمان دەبەخشرێت. پەیامبەرمان موحەممەد لەبارەی مانگی ڕەمەزانەوە دەفەرموێت: (**أَوَّلُ شَهْرِ رَمَضَانَ رَحمَةٌ وأوْسَطهُ مَغْفِرَةٌ وآخِرُهُ عِتْقٌ مِنَ النَّارِ**).

«سەرەتاکەی ڕەحمەتە، ناوەڕاستەکەی لێخۆشبوونە، کۆتاییەکەی ڕزگاربوونە لە ئاگری دۆزەخ»، (رواه ابن ابي الدنيا).

هەر ساتێکی مانگی ڕەمەزان دەرفەتێکی زێڕینە بۆ گەڕانەوە بۆ لای پەروەردگارمان. ئەو شتانەی لە ژیاندا پێیدا تێدەپەڕین و تووشی دەبین لە ئەنجامی کارەکانی خۆمانەوەیە. ئەگەر بە کەم سەیر بکرێین، یاخود هەست بە کەمی بکەین بەهۆی تاوانەکانمانەوەیە کە نزمی کردووینەتەوە. تەنها لە ڕێگای پەروەردگارەوەیە کە دەتوانین بەرز ببینەوە. ئەگەر بەردەوام نەتوانین بۆ نوێژی بەیانیان بەئاگا بێین، یاخود بە سەختی بزانین خۆمان لە حەرام بە دوور بگرین، پێویستە لە پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگاردا ورد ببینەوە، نابێت هەرگیز فریو بخۆین، نابێت هەرگیز وا بیر بکەینەوە هەموو شتێکی ئەم جیهانە بە سەرکەوتن، شکست، بەخشین و وەرگرتن بەبێ پەروەردگار ئەنجام دەدرێت. تەنها بەهۆی پەیوەندیمان لەگەڵ پەروەردگارەوەیە کە سەردەکەوین، یاخود شکست دێنین لە پەیوەندیمان لەگەڵ جیهان و هەموو مرۆڤایەتیدا.

بە پێچەوانەی مرۆڤەکانەوە، پەروەردگار هیچ ڕق و کینەیەک بەرامبەر بەندەکانی هەڵناگرێت، بیهێنە پێش چاو کاتێک پەڕەیەکی سپی

و خاوێنت پێ دەدرێت، یاخود هەموو ئەو شتانەی کە پەشیمانیت لە ئەنجامدانیان بە تەواوی دەسڕێنەوە.

ڕەمەزان ئەو دەرفەتەیە. پەیامبەرمان موحەممەد پێمان دەفەرموێت: **«مَنْ صَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا، غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ».**

«هەرکەسێک لە مانگی ڕەمەزاندا بەڕۆژوو ببێت بە باوەڕێکی پتەوەوە و بە ئومێدی بەدەستهێنانی پاداشتی پەروەردگار بێت، هەموو تاوانەکانی ڕابردووی دەسڕێتەوە»، (متفق علیه).

کاتێک ئەم دەرفەتە زێڕین و بێهاوتایەمان پێ دەدرێت، چۆن بتوانین بە باشترین شێوە سوودی لێ وەرگرین؟ دوو بابەتی تێبینیکراو پێویستە لە یاد نەکەین:

## «بزانە بۆچی بەڕۆژوو دەبیت»

زۆر کەس وەکو خوو و نەریت بەڕۆژوو دەبێت بەبێ ئەوەی لە مانای ڕاستەقینەی ڕۆژوو تێبگات. هەندێ کەس وەکو خەمخۆری و هاودڵییەک بۆ هەژارەکان بەڕۆژوو دەبن، هەرچەندە ئەمانە دەرئەنجامی سەرنجڕاکێشی بەڕۆژووبوونن، بەڵام مەبەستی سەرەکی ڕۆژوو نین کە لە لایەن پەروەردگارەوە ئاماژەی پێ دراوە، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴿١٨٣﴾﴾ (سورەتی البقره).

«ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووی ڕەمەزان لە سەرتان پێویست کراوە هەر وەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کرابوو، بۆ ئەوەی خواناسی و پارێزکاری بکەن(١٨٣)».

بە کۆنترۆڵکردن و دەستبەسەرداگرتنی پێویستییە جەستەییەکانمان، بەهێز دەبین و ئامادە دەبین بۆ جەنگێکی گەورەتر: کۆنترۆڵکردن و دەستبەسەرداگرتنی نەفسمان. کاتێک بەڕۆژوو دەبین، هەموو کەسێکی

برسی پەروەردگارمان بیر دێننەوە، ئەو کەسانەی قوربانییان ئەنجام داوە لە پێناویدا. بە بیرکەوتنەوەی پەروەردگار و قوربانیدان لەپێناویدا زیاتر هەست بە ئامادەیی پەروەردگار دەکەین، بەو شێوەیە تەقوامان، (ترس و بەئاگابوونمان لە پەروەردگار)، زیاد دەکەین. تەقوا ڕێمان لێ دەگرێت نان بخۆین و ئاو بخۆینەوە بەبێ ئەوەی کەس بمانبینێت و ڕامانده‌هێنێت لە تاوانەکانی تر دوور بکەوینەوە کاتێک کەس چاوی لێمان نییە.

## «مەهێڵە بەڕۆژووبوون تەنها برسی و تینووت بکات»

پەیامبەرمان موحەممەد دەفەرموێت: **(مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ وَالعَمَلَ بِهِ وَالجَهْلَ فَلَيْسَ لِلَّهِ حَاجَةٌ أَنْ يَدَعَ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ)**.

«هەر کەسێک واز لە بوختان و کاری خراپە نەهێنێت، پەروەردگار پێویستی بە برسێتی و توونێتی ئەو نییە»، (رواه البخاري).

هەروەها دەفەرموێت: **«رُبَّ صَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ صِيَامِهِ إِلَّا الجُوعُ، وَرُبَّ قَائِمٍ لَيْسَ لَهُ مِنْ قِيَامِهِ إِلَّا السَّهَرُ»**.

«زۆر کەس بەڕۆژوو دەبن و هیچیان دەست ناکەوێت جگە لە برسێتی، زۆر کەس شەونوێژ دەکەن، هیچیان دەستناکەوێت جگە لە بەئاگابوون»، (رواه الدارمي).

کاتێک بەڕۆژوویت لە هەموو ماناکەی تێبگە. بیرت بێت بەڕۆژووبوون تەنها بریتی نییە لە دوورکەوتنەوە لە خواردن و خواردنەوە، بەڵکوو بریتییە لە هەوڵدان بۆ بوونە کەسێکی باشتر، لەو هەوڵدانەماندا دەرفەتێکمان پێ دەدرێت بۆ ڕزگاربوون لە تاریکی دووریمان لە پەروەردگار، بەڵام هاوشێوەی خۆر کە لە کۆتایی ڕۆژدا ئاوا دەبێت، مانگی ڕەمەزانیش دێت و دەڕوات و تەنها مۆرکەکەی لەسەر دڵەکانماندا جێدەهێڵێت.



## ئیمڕۆکە پیاوێکمان ناشت: تێڕامان لە مردن

ئـەم بابەتـەم لەنـاو ئۆتۆمبیلەکەمـدا نووسـی، کاتێـک لـە ناشـتنی پیاوێکی چاکەخواز دەگەڕامەوە بەرەو ماڵ. پەروەردگاری بەڕەحم و میهرەبان میهر و بەزەیی خۆی بڕژێنێت بەسـەر خۆی و خێزانەکەیدا.

ئیمـڕۆ پیاوێکمـان ناشـت، ئێسـتا وا لـە ڕێگادام، بـە ئۆتۆمبیـل دەگەڕێمـەوە بـەرەو ماڵـەوە، هێشـتا مـن و ئێـوە لـەم شـەمەندەفەری ژیانـەدا ماویـن. نـەک لەبـەر ئـەوەی بـەرەو خاکێکی جیـاواز ڕێمـان گرتۆتـە بـەر، نـەک لەبـەر ئـەوەی ئـەوان دەڕۆن و ئێمـە ناڕۆیـن، بەڵکـوو گالیسـکەکەمان لـە دواوە بەجـێ مـاوە. ئێسـتا دەگەڕێینـەوە بـۆ مـاڵ، جێگا، تەلەفزیـۆن، کار، تاقیکردنـەوە، هـاوڕێ، فەیسـبووک و چاتەکانمـان.

دەگەڕێینـەوە بـەرەو ئـەو شـتانەی سـەرقاڵمان دەکـەن و فریومـان دەدەن، بـەڵام ڕاسـتییەکە ئەوەیـە کـە بـەرەو مـاڵ، جێگا، تەلەفزیـۆن و کارەکـەم ناگەڕێمـەوە. ناگەڕێمـەوە بـۆ کار، تاقیکردنـەوە، هـاوڕێ، فەیسـبووک و چاتەکانم. ناگەڕێمەوە بەرەو لای ئەو شـتانەی سـەرقاڵم دەکـەن و خەیاڵاتەکانـم.

بـەرەو ئـەو شـوێنە دەگەڕێمـەوە کـە لێـوەی دەسـتم پـێ کـرد.

دەگەڕێمـەوە بۆ ئـەو شـوێنەی کـە ئـەو پیـاوە بـۆی ڕۆیشـت. بـەرەو هەمـان جێـگا دەڕۆم، بـەڵام نازانـم گەشـتەکەم چەندێـک دەخایەنێـت.

بـەرەو ئـەو شـوێنە دەڕۆم کە لێوەی دەسـتم پێ کـرد: دەگەڕێمـەوە بـەرەو لای پـەروەردگار، چونکـە پـەروەردگار (الأوّل)، (سـەرەتا) و (الأخِـر)، (کۆتایـە). جەسـتەم هاوشـێوەی گالیسـکەیەکە کـە بـەرەو ئەوێـم دەبـات. کاتێـک دەگەمـە ئەوێ، جەسـتەم لـە دواوە دەمێنێتـەوە. جەستەم لـە خاکەوە هاتـووە و دەگەڕێتـەوە بۆ خـاک. جەسـتەم تەنهـا قاوغێکە، هەڵگری ڕۆحەکەمـە، هاوڕێیەکی کاتیمە. کاتێک دەگەڕێمەوە، لـە دوای خـۆم جێـی دەهێڵـم. دەگەڕێمـەوە، چونکـە ماڵـی ڕاسـتەقینەم بەهەشـتە نـەک ماڵـی سـەر زەوی. کاتێـک پـەروەردگار بانگـی ڕۆحـە باشـەکان دەکاتـەوە دەفەرموێـت: «ارجعـی»، (بگەڕێـرەوە).

ئـەو ڕۆحـە پاک و چاکەی کـە ناشـتمان لـەم جیهانەمـان دانەبڕاوە، بەڵکـوو بـە ویسـتی پـەروەردگار گەیشـتۆتە ئاسـتێکی بـاڵا و باشـتر. ئـەو گەڕاوەتـەوە ماڵـەوە (بەهەشـت)، بـەڵام جەسـتەی لەسـەر زەوی بەجێهێشـتووە، چونکـە جەسـتەکە دروسـتکراوی ئـەم جیهانەیـە. جەسـتەکە سـەر بـە جیهانێکـی نزمتـرە، جیهانێـک کـە دەبێـت تێیـدا بخۆیـن، بخەویـن، خوێنمـان لـێ بێـت، بگریـن و بمریـن، بـەڵام ڕۆحەکە لـە جیهانێکـی باڵاتـرە. ڕۆحەکـە تەنهـا یـەک پێویسـتی هەیـە: تەنهـا لەگـەڵ پـەروەردگاردا بێـت.

کاتێـک جەسـتەکە دەگـری و خوێنـی لـێ دەڕژێـت و هەسـت بـە ئـازار دەکات لـەم جیهانـەدا، ئـەم شـتانە هیـچ کار ناکاتـە سـەر ڕۆحەکـە. تەنهـا یـەک شـتێک هەیـە کـە دەتوانێـت ڕۆحەکـە لـەت بـکات، برینـداری بـکات، یاخـود ئـازاری بـدات. تەنهـا یـەک شـتێک هەیـە کـە دەتوانێـت ڕۆحەکـە لەنـاو بەرێـت: دابڕاندنـی لـە تاکـە شـتێک کـە زۆر پێویسـتێتی: نزیکبـوون لـە شـوێنی بنچینـەیی و پـەروەردگاری.

بۆیە نابێت بگرین و شیوەن بکەین بۆ گەیشتنی ڕۆحەکە بە مەنزەڵگای خۆی، ڕۆحەکە نەمردووە. پێویستە بۆ ئەوانە بگرین کە جەستەکانیان هێشتا زیندووە، بەڵام ڕۆحەکانیان مردووە بەهۆی دابڕانی لەو کەسەی کە خوڵقاندوویەتی و ژیانی بە بەردا کردووە، کە پەروەردگارە.

بۆیە ڕۆحە باوەڕدارەکان پێشبڕکێ دەکەن بۆ گەڕانەوە بۆ ماڵە سەرەکییەکەیان کاتێک لەم ژیانەدان. ئەی پەروەردگار شوێنێک و پەناگەیەک بۆ ڕۆحم دروست بکە کە هیچ کەس و شتێک نەتوانێت بێزاری بکات، شوێنێکی ئارام و بێدەنگ و هێمن بێت و دەستی جیهانی دەرەکی پێی نەگەیشتبێت. پەروەردگار ئەو جۆرە ڕۆحە بە (النفس المطمئنة)، ناو دەبات. پەروەردگار بانگیان دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ٢٧ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرۡضِيَّةً ٢٨﴾ (سورەتی الفجر).

«بە ئیمانداری سەرفراز لە سەرەمەرگدا دەوترێت ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی(٢٧)، بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازییە(٢٨)».



## بۆچی نزاکانمان گیرا نابن؟

پرسیار: بۆچی نزاکانمان گیرا نابن؟

وەڵام: پەروەردگار پاداشتی بە خێرت بداتەوە بۆ پرسینی ئەم پرسیارە گرنگە. پەروەردگار بەرەو ڕێی ڕاست ڕێنوێنیت بکات.

بڕوام وایە لەم جۆرە بارودۆخانەدا هۆکارەکان و ئامانجەکانمان لێ تێکدەچێت و تێکەڵیان دەکەین. بۆ نموونە کاتێک نزا دەکەین هاوسەرێکی باشمان بە قسمەت ببێت، ئایا ئەو هاوسەرگیرییە هۆکارە، یاخود ئامانج؟

بڕوام وایە زۆرێکمان وەکو ئامانجێک لێی دەڕوانین کە زۆرێک لەو خەیاڵات و نائومێدییەی لە دوای هاوسەرگیرییەکەوە پەیدا دەبێت ڕوون دەکاتەوە. هاوشێوەی هەموو شتەکانی ئەم دونیایە، هاوسەرگیری تەنها هۆکارێکە، هۆکارێکە بۆ گەیشتن بە پەروەردگار. ئەگەر نزای هاوسەرگیرییەکی باش بکەین و نزاکەمان گیرا نەبێت، ڕەنگە پەروەردگار هۆکارێکی تری بۆ بڕیار دابێت، ڕەنگە بیەوێت لە ڕێی نارەحەتییەوە تاقیمان بکاتەوە کە دەبێتە هۆی پاکبوونەوە و ئارامگرتن و گەیاندنمان بە ئامانجەکەمان: پەروەردگار، ڕەنگە پەروەردگار کە زانایە بە هەموو شتەکان ئەو

هاوسـەرە باشـەمان بـە قسمەت بکات کـە نـزای بـۆ دەکەیـن، بـەڵام ببێتـە هـۆی دوورکەوتنەوەمـان لـە ئامانجەکەمـان.

بڕوام وایە گرفتەکە لەوەدایە کە شتەکان بە پێچەوانەوە دەبینین. دونیـا (پیشـە باشـەکەمان، هاوسـەرە تایبەتەکەمـان، بوونـی منـداڵ، خوێندنگا، پیشـە... هتد)، ئامانجمانـە. پـەروەردگار هۆکارێکـە بـەکاری دەهێنیـن بـۆ بەدەسـتهێنانیان. ئـەو هـۆکارە بـەکار دێنیـن لـە ڕێـی نزاکردنـەوە بۆ بەدەستهێنانی ئامانجەکانمـان (هـەر شتێک کـە نزای بۆ دەکەیـن)، پاشـان نائومێد دەبیـن کاتێـک هۆکارەکەمـان (پـەروەردگار) هاوکاریمـان نـاکات. دەسـتەکانمان بـەرەو ئاسـمان بـەرز دەکەینـەوە و دەڵێیـن نزاکانمـان گیـرا نابـن. هۆکارەکەمـان هاوکاریمـان نـاکات.

بـەڵام پـەروەردگار هـۆکار نییـە، بەڵکـوو ئامانجەکەیـە. مەبەسـتی سـەرەکی دروسـتبوونی دونیـا بریتییـە لـە دروسـتبوونی پەیوەنـدی لەگـەڵ پـەروەردگاردا. لـە ڕێـی نزاکانمانـەوە لـە پـەروەردگار نزیـک دەبینـەوە. گرفتەکـە لەوەدایـە جەختمـان لـە شـتێکی هەڵـە کردۆتـەوە، نزای ئیستیخارەم زۆر خۆش دەوێت، چونکە تەواو و بێ کەموکوڕییە و جەخـت دەکاتـەوە لـەوەی تەنهـا پـەروەردگار زانایـە بـە شـتەکان، پاشـان داوا لـە پەروەردگار دەکەین هـەر شتێک کـە بـاش و خێرە بـە قسـمەتمان بـکات، هـەر شـتێکیش خراپـە لێمانـی دوور بخاتـەوە.

جەخـت خسـتنە سـەر دونیـا بریتـی نییـە لـەوەی کـە نـزای بـۆ دەکەیـت. جەخـت کردنـەوە بریتییـە لـەوەی چـی باشـترینە لـەم دونیـا و دونیـای دواتـر. مانـای ئـەوە نییـە نـزا بـۆ ئـەو شـتانە نەکەیـن کـە دەمانەوێت، بە پێچەوانـەوە پەروەردگار پێی خۆشـە داوای لـێ بکەین. واتـا کاتێـک داوا دەکەیـن کاری خۆمـان جێبەجـێ دەکەیـن و ئـەوەی تـری دەدەینـە دەسـتی پـەروەردگار، دڵخۆشـین بـەوەی پـەروەردگار بڕیـاری لەسـەر دەدات.

تێدەگەین پەروەردگار نزاکانی گیرا کردووین، بەڵام بەو شێوەیە نییە کە خۆمان پێشبینی دەکەین، چونکە زانیاریمان سنووردارە و زانیاری پەروەردگار بێسنوورە. بەهۆی زانیارییە بێسنوورەکەیەوە ئەو شتانەمان پێ دەبەخشێت کە خۆی دەزانێت باشترە بۆمان تاکو ئامانجە سەرەکییەکە بەدەست بهێنین کە دڵخۆشی پەروەردگارە. و الله اعلم، (پەروەردگار خۆی باشتر زانایە بە شتەکان).

## فەیسبووک: مەترسییە شاردراوەکە

لەم سەردەمەدا لە جیهانێک دەژین کە جێناوە لکاوەکانی تایبەت بە خود دەوریان تەنیوین. ئای/ فۆن، ئای/ پاد، مای/ سپەیس، یو/ توب، سەرنجدانەکە ڕوونە: سەرنجدان لە «من/ خۆم/ تۆ. پێویست ناکات لە دوور بڕوانیت بۆ بینینی هۆگربوون بە خود. ڕیکلامکاران پێویستە گرنگی بە خودپەرستی بدەن تاکو زیاتر بفرۆشن.

بۆ نموونە زۆر ڕیکلام سەرنجڕاکێشە بە لای ئەو بەشەمانەوە کە حەز بە دەسەڵات و بەرپرسیاریتی دەکات. کۆمپانیای (دایرێکت تی ڤی)، دەڵێت: تەماشای تەلەفزیۆن مەکە، تەلەفزیۆن ئاڕاستە بکە.» دوورگەی ماست دەڵێت: «تۆ فەرمانڕەوایی دەکەیت! بەخێر بێیت بۆ خاکی ماستە هەمیشەییەکان کە تێیدا خۆت بەشەکان و بژاردەکان و دیمەنەکان بەڕێوە دەبەیت.»

بەڵام تەنها ڕیکلامەکان نین کە بە لای خودپەرستیمانەوە پەسەند بن. دیاردەیەکی جیهانی هەیە کە شوێنێکی گونجاو و شیاو بۆ گەشەسەندنی ئەو خودپەرستییە دەڕەخسێنێت، ئەو دیاردەیەیش بریتییە لە فەیسبووک، ئێستا یەکەم کەسم کە دەڵێم دەکرێت فەیسبووک ئامرازێکی زۆر باش و بەهێز بێت. دەکرێت هاوشێوەی

هەمـوو شـتەکانی تـر بـۆ کاری بـاش و چـاک بـەکاری بهێنیـن.

دەکرێـت چەقـۆ بـۆ بڕینـی ئـەو خۆراکـە بـەکار بێـت کـە دەدرێـت بـە کەسـانی برسـی، یاخـود بـەکار بێـت بـۆ کوشـتنی کەسـێک. فەیسـبووک دەکرێـت هـاوکار بێـت لـە لەدەسـەڵاتلابردنی دیکتاتۆرێـک. دەکرێـت فەیسـبووک وەک ئامرازێکـی بەهێـز بـەکار بێـت بـۆ ڕێکخسـتن و پەیوەندیکـردن و بیرهێنانـەوە و یەکگرتنـی کەسـەکان. دەکرێت فەیسـبووک بـەکار بێت بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیمـان لەگـەڵ پەروەردگار و یەکتردا. هەروەهـا دەکرێت بـەکار بێت بۆ بەهێزکردنـی نەفسـمان.

دیاردەی فەیسـبووک دیاردەیەکی زۆر سەرنجڕاکێشـە. لـە هەمـوو تاکێکمانـدا خودپەرسـتییەک هەیـە. ئـەو بەشـەی لـە ئێمـەدا هەیـە پێویسـتە کپ بکرێتـەوە (ئەگـەر بمانەوێت لـە چارەنووسـی خراپە دوور بیـن). زیانـی خۆراکـدان بـە نەفسـمان بریتییـە لـەوەی بەهێزتـر ببێت. دەسـەڵاتی بـە سـەرماندا دەبێت کاتێک بەهێز دەبێت. تەنانـەت وای لـێ دێت کـە چیدی بەنـدەی پەروەردگار نەبیـن: دەبینـە بەنـدەی خۆمـان.

خـود ئـەو بەشـەی ئێمەیـە کـە حـەز بـە دەسـەڵات دەکات. ئـەو بەشـەیە کە ئـارەزوو دەکات ببینرێت و بناسـرێت و سـتایش بکرێت و خۆشبویسترێت. فەیسبووک شـوێنێکی تـەواو گونجـاو و شـیاو بۆ ئەم مەبەسـتە دەڕەخسـێنێت. سـەکۆیەکە لـە ڕێیـەوە هەمـوو وشـە و وێنـە و بۆچونەکانم دەکرێت ببینرێن و سـتایش بکرێن و لایک بکرێن. لە ئەنجامدا بـەدوای خوددا وێڵ دەبـم.

ئـەوە بـە تەنهـا لـە جیهانـی ئەنتەرنێتـدا نامێنێتـەوە، بەڵکـوو لـە بیرمـدا بـەم شـێوەیە ژیانـی حەقیقیـم بـەڕێ دەکـەم. لەنـاکاو بـە شـێوەیەک دەژیـم وەک ئـەوەی دەبێـت هەمـوو ئەزمـوون و وێنـە و بیرکردنەوەکانـم ببینرێـن، چونکـە لـە بەشـی پشـتەوەی مێشـکمدا بیر

دەکەمـەوە، «ئەمـە لـە ئەکاونتـی فەیسـبووکەکەمدا بـڵاو دەکەمـەوە.»
ئەمەیـش بارێکـی سەرنجڕاکێشـی بـوون دروسـت دەکات، هەسـتێکی
بـەردەوام کـە ژیانـم وەکو نمایشـێک بەسـەر دەبـەم. تەنانـەت ئاگادار
دەبـم لـەوەی تەماشـا بکرێـم، چونکـە هەمـوو شـتەکانم لـە فەیسـبووک
دادەنرێـت تاکـو کەسـانی دی ببینـن و کۆمێنتـی لەسـەر بکـەن.

لـە هەمـووی گرنگتـر هەسـتێکی هەڵـە دروسـت دەکات لـە بـارەی
گرنگـی خـودەوە. هەمـوو جووڵەیەکـی بێبەهـا دەکـەم کـە گرنگـە بـە
لای هەمووانـەوە. دواتـر دەبمـە جێـی سـەرنج، لەسـەر شـانۆکە دەبـم.
پەیامەکە بریتییـە لـەوەی مـن زۆر گرنگـم. ئەنجامەکـە بریتـی دەبێـت لـە
جیهانێکـی خـودی بەهێزتـر کـە مـن لـە ناوەڕاسـتی نمایشـەکەدام.

لـە دواییـدا دەردەکەوێـت کـە ئـەم ئەنجامـە تـەواو پێچەوانـەی
حەقیقەتـی بوونـە. مەبەسـتی ئـەم ژیانـە بریتییـە لـە درککـردن بـە
گەورەیـی پـەروەردگار، گرنگنەبوونـی خـود و پێویسـتیمان بـە
پـەروەردگار. ئامانجەکـە بریتییـە لـە دەرهێنانـی خـود لـە ناوەندەکـە و
دانانـی پـەروەردگار لـە شـوێنی خـود. فەیسـبووک بەردەوامـی دەدات
بـەو خەیاڵاتـەی کـە تـەواو پێچەوانەیـە.

ئـەو بـاوەڕەم بەهێـز دەکات کـە بەهـۆی گرنگـی خـودەوە هەمـوو
جووڵەیـەک، یاخـود بیرکردنەوەیەکـم پێویسـتە نمایـش بکرێـت. لەنـاکاو
ئـەو شـتەی بـۆ نانـی بەیانـی خواردوومـە، یاخـود کرێومـە دەبێتـە
هـەواڵ و پێویسـتە بـڵاو بکرێتـەوە.

کاتێـک وێنەیـەک دادەنێـم، چاوەڕێـی سـتایش و پێداهەڵـدان دەکـەم
لـە لایـەن کەسـانی دیکـەوە، بەهـۆی لایـک و کۆمێنتەکانـەوە وای لـێ
دێـت جوانـی ڕووخسـار دەبێتـە شـتێک کـە پێویسـتە دیـاری بکرێـت.
کاتێـک پۆسـتێک دەکـەم چاوەڕێ دەبـم لایـک بکرێـت. تەنانـەت ئاگادار
دەبـم و کێبڕکـێ دەکـەم لـە ژمـارەی (هاوڕێکانـم). (هـاوڕێ لێرەدا لـە

دوو کەوانەدایـە، چونکـە زۆربـەی ٨٠٪ـی هاوڕێیانـی نـاو ئەکاونتـی فەیسـبوکەکە خـۆی ناناسـێت).

ئـەم هۆگربـوون و کێبڕکێیـە بـۆ بەدەسـتهێنانی شـتە دونیاییـەکان زیاتـر لـە قورئانـی پیـرۆزدا بـاس کـراوە، پـەروەردگار دەفەرموێـت: ﴿أَلۡهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ۝١﴾ جا ئـەو کێبڕکێیە بۆ کۆکردنەوەی سـەروەت و سـامان بێـت، یاخـود هـاوڕێ و لایکـەکان لـە فەیسـبووکدا هەمـان ئەنجامیـان هەیـە: وابەسـتەی دەبیـن.

هەروەهـا فەیسـبووک سـەرنجێکی مەترسـیداری تـر بەهێـز دەکات ئەویـش سـەرنجدانە لـە کەسـانی دی و چـی دەکـەن و حەزیـان لـە چییـە، یاخـود چـۆن بیـر لـە مـن دەکەنـەوە. فەیسـبووک دەبێتـە هـۆی بـرەودان بـە بیرکردنـەوە لـە هەڵسـەنگاندنی مـن لـە لایـەن خەڵکییـەوە. زوو دەکەومـە نێو خولگەی دروسـتکراوەکانەوە. لەنـاو ئـەم خولگەیـەدا پێناسـە، ئـازار، دڵخۆشـی، گرنگـی خـود، سـەرکەوتن و شکسـتەکانم لـە لایـەن دروسـتکراوەکانەوە هەڵدەسـەنگێنرێن.

کاتێـک لەنـاو ئـەم خولگەیـەدا دەژیـم، لەگـەڵ دروسـتکراوەکاندا هەڵدەسـمەوە و دەکەومـەوە. سـەرکەوتووم کاتێـک خەڵکـی لەگەڵمـدا دڵخۆشـن. دەکـەوم کاتێـک دڵخـۆش نیـن و خەمبـارن. پلـەی مـن لـە لایـەن خەڵکییـەوە دیـاری دەکرێـت. وەک زیندانییـەک وام، چونکـە کلیلەکانـی دڵخۆشـی و خەمبـاری و نائومێدیـم داوەتـە خەڵکانـی دی هەڵـی بگـرن.

کاتێـک دێمـە نـاو خولگـەی دروسـتکراوەکانەوە و تێیـدا دەژیـم لەجیاتـی خولگـەی پـەروەردگار، دەسـت دەکـەم بـە بەکارهێنانـی ئـەو دراوە. بزانـە دراوی خولگـەی پـەروەردگار بریتییـە لـە دڵخۆشـی، یاخود خەمبـاری پـەروەردگار، پاداشـت، یاخـود سـزای پـەروەردگار، بـەڵام دراوی خولگـەی دروسـتکراوەکان بریتییـە لـە سـتایش یاخـود ڕەخنـەی

خەڵکی. تاکو زیاتر بچمە ناو ئەو خولگەیەوە، زیاتر تامەزرۆی هەبوونی دراوەکەی دەکەم، زیاتر دەترسم لەدەستی بدەم.

بۆ نموونە کاتێک یاری (مەنۆپۆلی) دەکەم زیاتر و زیاتر تامەزرۆی دراوەکەی دەبم. زۆر دڵخۆشکەرە بۆ ساتێک هەست بە دەوڵەمەندی بکەم، بەڵام کاتێک یارییەکە کۆتایی دێت، دەتوانم بە پارەی یارییەکە چی شتێک بکڕم لە جیهانی ڕاستەقینەدا؟

دراوی ستایشی مرۆڤ هاوشێوەی پارەی یاری مەنۆپۆلییە. بۆ ساتێک شتێکی خۆشە کۆی بکەیتەوە، بەڵام هیچ بەهایەکی نابێت کاتێک یارییەکە کۆتایی دێت. لە ڕاستی ژیانی ئەم دونیا بێبەهایە لەچاو ژیانی دواییدا. هێشتا تامەزرۆی ئەم دراوە هەڵەیەم لە پەرستشەکانمدا. بەم شێوەیە دەکەومە ناو شیرکی شاردراوەوە، ریا. ڕیا دەرئەنجامی ژیانە لەنێو خولگەی دروستکراوەکاندا. تاکو زیاتر بکەومە ناو ئەو خولگەیەوە، زیاتر تامەزرۆی بەدەستهێنانی ستایش و پێداهەڵدان و پەسەندکردن دەبم. تاکو زیاتر بکەومە ناو ئەو خولگەیەوە، زیاتر دەترسم ڕووخسار و پلە و ستایش پەسەندکردن لەدەست بدەم.

تاکو زیاتر لە خەڵکی بترسم، زیاتر دەبمە بەندەیان. ڕزگاری ڕاستەقینە کاتێک بەدەست دێت کە جگە لە پەروەردگار لە هیچ شتێکی تر نەترسین. لە فەرموودەیەکدا دەگێڕێتەوە: **أَتَى النَّبِيَّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلٌ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ دُلَّنِي عَلَى عَمَلٍ إِذَا أَنَا عَمِلْتُهُ أَحَبَّنِي اللَّهُ وَأَحَبَّنِي النَّاسُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «ازْهَدْ فِي الدُّنْيَا يُحِبَّكَ اللَّهُ، وَازْهَدْ فِيمَا فِي أَيْدِي النَّاسِ يُحِبُّكَ النَّاسُ».**

«پیاوێک هات بۆ لای پەیامبەرمان و وتی: ئەی پەیامبەری

خـودا، کردارێکم فێر بکە بە ئەنجامدانی پـەروەردگار خۆشی بوێم و خەڵکیش خۆشـی بوێم»، پەیامبـەر فەرمووی: "خۆت لـە دونیا داببڕە پـەروەردگار خۆشی دەوێی. خۆت لـە خەڵکی داببڕە، خەڵکی خۆشـی دەوێی"، (رواه ابـن ماجـه).

واتـا تاکو کەمتر بـە دوای پەسـەندکردن و خۆشەویستی خەڵکیدا ڕابکەین، زیاتر بەدەست دەهێنین. تاکو کەمتر پێویستمان بە کەسـانی دی بێـت، خەڵکـی زیاتـر شـوێنمان دەکـەون و حـەز بـە هاوەڵیمـان دەکـەن. ئـەم فەرموودەیـە ڕاستییەکی گرنگمـان فێر دەکات. تەنها بـە دەرچـوون لـەم خولگـەی دروسـتکراوانە دەتوانیـن سـەرکەوتوو بیـن لەگـەڵ پـەروەردگار و خەڵکیدا.

بۆیـە کاتێـک فەیسـبووک ئامرازێکـی بەهێـز دەبێـت، بـا ببێتـە ئامـرازی ڕزگاربوونـت، نـەک ئامـرازی کۆیلەبوونـی خـودی خـۆت و هەڵسـەنگاندنەکانی کەسـانی دی.

## تەوەکول:
## دەستگرتن بەو ڕێگای ڕزگارییەی کە هەرگیز لەناو ناچێت

کۆرپەکە زۆر نائومێد بوو، چونکە تاکە سەرچاوەی خۆراکی لەدەست چوو و دیار نەما. ئەو سەرچاوەیە هەموو شتێک بوو کە کۆرپەکە دەیزانی، پاشان لەناکاو دونیا سارد بوو و کەسانی سەیر و نامۆ لە دەوروبەریدا دەرکەوتن. کۆرپە تازە لەدایکبووەکە دەگریا، هەستی کرد ژیانی کۆتایی هاتووە.

نەیدەزانی کەسێک هەیە ئاگاداریەتی و چاودێری دەکات، پلانێک هەیە و بۆی دانراوە. پارێزەرەکەی شتێکی باشتری پێ دەبەخشێت لەبری هەموو ئەو شتانەی لێی سەندراوەتەوە. ئەو خۆراکەی کە تەنها لە ڕێگای خوێنەوە دەستی دەکەوت لەمەودوا لە ڕێگای شیری دایکیەوە دەستی دەکەوێت. ئارامی باوەشی خێزانەکەی شوێنی دیواری منداڵدانی دایکی دەگرێتەوە کە پێشتر وەک تاکە پارێزەری وابوو. هێشتا کۆرپە تازە لەدایکبووەکەوە هەست دەکات کە هەموو شتێکی لەدەست داوە.

زۆرێکمان وەک ئەم کۆرپەیە واین. هەندێک جار هەست دەکەین هەموو شتێکمان لەدەست داوە، یاخود شتەکان تێکشکاون و هیچ

شـتێک بـەو شـێوەیە نییـە کـە خۆزگەمـان بـۆی دەخواسـت. تەنانـەت هەندێک جار هەست دەکەین بە تەنها جێهێڵراوین و هیچ شـتێک بـەو شـێوەیە بەڕێوە ناچێت کـە پلانمـان بـۆی دانابوو.

وەک ئـەو کۆرپـە تـازە لەدایکبـووە واین و شـتەکان بـەو شـێوەیە نیـن کـە دەردەکـەون. تەوەکـول (پشتبەسـتن و متمانەبـوون بـە پـەروەردگار)، واتـا زانینـی ئـەوەی کـە پەروەردگارمـان پلانێکـی بۆمـان دانـاوە. تەوەکـول واتـا بوونـی متمانـەی تـەواو کـە پلانـی پـەروەردگار باشـترین پلانـە. تەوەکـول واتـا بوونـی بـاوەڕی تـەواو بەوەی پەروەردگار ئاگادارت دەبێت تەنانـەت کاتێک شـتەکان مەحاڵ دەردەکـەون. تەوەکـول واتـا وەسـتان لـە بـەردەم دەریـای سـووردا بەبێ ترس، هاوشێوەی پەیامبـەر موسـا کـە سـوپایەکیش لـە پشـتیەوە بوو، چونکە دەزانیت پەروەردگار ڕزگارت دەکات. بوونی باوەڕێکی تـەواوە بـەوەی کاتێک پـەروەردگار پەتکی ناوکت لـێ دەکاتـەوە، بـە شـیری دایکـت شـوێنی پڕ دەکاتـەوە.

هیـچ باوەڕێـک بەبـێ تەوەکـول بوونـی نییـە و نابێت. ئەگـەر باوەڕێکـی ڕاسـت و دروسـت بێـت، دەبێـت تەوەکولـی لەگەڵـدا بێـت. پـەروەردگار لـە قورئانـی پیـرۆزدا دەفەرموێـت: ﴿إِنَّمَـا ٱلۡمُؤۡمِنُـونَ ٱلَّذِيـنَ إِذَا ذُكِـرَ ٱللَّهُ وَجِلَـتۡ قُلُوبُهُـمۡ وَإِذَا تُلِيَـتۡ عَلَيۡهِـمۡ ءَايَٰتُـهُۥ زَادَتۡهُـمۡ إِيمَٰنًـا وَعَلَىٰ رَبِّهِـمۡ يَتَوَكَّلُـونَ ۝٢﴾ (سـورەتی الانفـال).

(بێگومـان ئیماندارانـی ڕاسـتەقینە تەنهـا ئەوانـەن، کـە کاتێک نـاوی پەروەرێـن بـردرا، دڵەکانیـان دەترسـێت و دەهەژێـت. کاتێک ئایـەت و فەرمانەکانـی ئێمەیـان بەسـەردا بخوێنرێتـەوە، ئیمـان و باوەڕیـان زیـاد دەکات. لـە هەمـوو کاروبارێکیشـدا هـەر پشـت بـە پـەروەردگاری خۆیـان دەبەسـتن(٢)».

ئەگـەر کەسێک بەڕاستی لـە ڕاستی و هێزی پـەروەردگار تێبگات،

تێدەگات کە لە ڕاستیدا ناجێگیری ئەقڵی مرۆڤ ئەوەیە پشت بە پەروەردگار نابەستێت. «هیچ شتێک لەم گەردوونەدا ڕوونادات بەبێ فەرمانی پەروەردگار، تەنانەت گەڵایەک لە درەختەکەی ناکەوێتە خوارەوە بەبێ مۆڵەتی پەروەردگار. (فەرمووده)». هەر پەروەردگارە هەموو شتەکانی بوون دابین دەکات.
﴿تَبَـٰرَكَ ٱلَّذِى بِيَدِهِ ٱلْمُلْكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝١ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ۝٢﴾ (سورەتی الملک).

«گەورە و موبارەک و پیرۆز، ئەو زاتەی کە هەموو بوونەوەر و جیهانی بە دەستە، ئەو زاتەی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە(١) هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدی هێناوە، تاکو تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکتر و پەسەندترە. هەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە بەسەر بێباوەڕاندا و لێخۆشبووە لە ئیمانداران(٢)»، کەواتە چۆن هەموو باوەڕ و متمانەمان بە پەروەردگار نەبێت؟ پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بە باوەڕداران دەفەرموێت: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝٥١﴾ (سورەتی التوبة).

پەروەردێن ڕوونی دەکاتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَـٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَىْءٍ قَدْرًا ۝٣﴾ (سورەتی الطلاق).

«لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کە خۆی پێی نازانێت، ئەوەی پشت بە پەروەردگار ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی پەروەردێن کار و فەرمانی خۆی بە ئەنجام دەگەیەنێت، بێگومان پەروەردگار بۆ هەموو شتێک نەخشە و پلانێکی دیاریکراوی بڕیار داوە(٣)».

﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا ٱكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَآ إِن نَّسِينَآ أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَآ إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ ۖ وَٱعْفُ عَنَّا وَٱغْفِرْ لَنَا وَٱرْحَمْنَآ ۚ أَنتَ مَوْلَىٰنَا فَٱنصُرْنَا عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾﴾ (سـورەتی البقـرة).

خـوای گـەورە ئـەرک ناخاتـە سـەر هیـچ کەسێک مەگـەر بـە قـەدەر توانایی خۆی نەبێت، هـەر کارێکی چاک ئەنجام بدات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هـەر خراپەیەکی کردبێت تەنها یەخـەی خـۆی دەگرێت و لەسـەر خۆیەتی (هەر بۆیە ئیمانداران دەڵێن): پەروەردگارا؛ لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسـەردا هات یان گوناهو هەڵەیەکمان لە دەست قەوما، پـەروەردگارا؛ ئەرکی سـەخت و کاری گران مـەدە بەسـەرماندا وەکو ئـەوەی داوتـە بەسـەر ئەوانـەی پێش ئێمەدا، پـەروەردگارا؛ ئەرکێک مـەدە بەسـەرماندا لـە تواناماندا نەبێت، تووشـی بـەڵاو ناخۆشیەکمان مەکە تواناو هێزو هەناومان لێ ببڕێت، گوناهمان بسڕەوە و چاوپۆشی بکە لـە هەڵـەو تاوانەکانمـان و دای پۆشـە، (داواکارین) بەزەییت بێتـەوە پیاماندا، ڕەحممـان پێ بکە، هـەر تۆ پشـت و پەنـاو یاریدادەری ئێمەیت، جا بۆیە داوا دەکەیـن سـەرمان بخەیت بەسـەر قەومـی کافرو خوانەناسـاندا، (ئا بـەو شـێوەیە پەروەردگاری مـەزن فێری نزای ڕێک و پێکمـان دەکات، ئومێدە کە لێشـمان وەربگرێت..) کاتێک ئایەتی (٢٨٤) دابەزیـووە هاوەڵانی پێغەمبـەر (صلـی الله علیه وسـلم) سـەغڵەت بوون و چوون بۆ خزمەتی.. ئەویش فەرموویەتی: بڵێن گوێڕایـەڵ و ملکەچین.. ئینجا خـوای گـەورە ئایەتـی (٢٨٥، ٢٨٦)ی دابەزاند بـۆ دڵدانەوەیـان). خـوای گـەورە ئـەرک ناخاتـە سـەر هیچ کەسێک مەگەر بە قـەدەر توانایی خۆی نەبێت، هـەر کارێکی چاک ئەنجام بدات قازانجی تەنها بۆ خۆیەتی و هـەر خراپەیەکی کردبێت تەنها یەخـەی خـۆی دەگرێت و لەسـەر

خۆیەتی (هەر بۆیە ئیمانداران دەڵێن): پەروەردگارا؛ لێمان مەگرە ئەگەر فەرامۆشیمان بەسەردا هات یان گوناهو هەڵەیەکمان لە دەست قەوما، پەروەردگارا؛ ئەرکی سەخت و کاری گران مەدە بەسەرماندا وەکو ئەوەی داوتە بەسەر ئەوانەی پێش ئێمەدا، پەروەردگارا؛ ئەرکێک مەدە بەسەرماندا لە تواناماندا نەبێت، تووشی بەلاو ناخۆشیەکمان مەکە تواناو هێزو هەناومان لێ ببڕێت، گوناهمان بسڕەوە و چاوپۆشی بکە لە هەڵەو تاوانەکانمان و دای پۆشە، (داواکارین) بەزەییت بێتەوە پیاماندا، ڕەحممان پێ بکە، هەر تۆ پشت و پەناو یاریدادەری ئێمەیت، جا بۆیە داوا دەکەین سەرمان بخەیت بەسەر قەومی کافرو خوانەناساندا، (ئا بەو شێوەیە پەروەردگاری مەزن فێری نزای ڕێک و پێکمان دەکات، ئومێدە کە لێشمان وەربگرێت..) کاتێک ئایەتی (٢٨٤) دابەزیووە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەغڵەت بوون و چوون بۆ خزمەتی.. ئەویش فەرموویەتی: بڵێن گوێڕایەڵ و ملکەچین.. ئینجا خوای گەورە ئایەتی (٢٨٥، ٢٨٦)ی دابەزاند بۆ دڵدانەوەیان).

[سورەتی البقرة:٢٨٦] ەفسیری ئاسان

پەیامبەرمان موحەممەد فەرموویەتی: **«لَوْ أَنَّكُمْ تَوَكَّلْتُمْ عَلَى اللَّه حَقَّ تَوَكُّلِه، لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيرَ، تَغْدُو خِمَاصًا، وَتَرُوحُ بِطَانًا».**

«ئەگەر تەوەکولت بە پەروەردگار هەبێت، خۆراک و ڕزقت دابین دەکات هەروەک چۆن خۆراکی باڵندەکان دابین دەکات. باڵندەکان بەیانیان بە گەدەی بەتاڵ و خاڵییەوە دەردەچن و ئێواران بە گەدەی پڕەوە دەگەڕێنەوە»، (رواه ابن ماجه).

پەروەردگار ڕزق و ڕۆزیمان بۆ دابین دەکات بە شێوەیەک کە هەرگیز پێشبینی ناکەین، هەروەک چۆن ڕزق و ڕۆزی باڵندە و کۆرپەی تازە لەدایکبوو دابین دەکات.

## تەوەکول و هیواو هەوڵدان تەواوکەری یەکترن

هاجـەرە خاتـوون لـە سـەرەتادا زۆر ترسـا و بانگـی مێردەکـەی (پەیامبـەر ئیبراهیم)ـی کـرد کـە دەیویسـت بـڕوات. «بۆچـی لێـرەدا جێمـان دەهێڵێت، تاکو بمرین؟» بـەڵام هیچ وەڵامێک نەبوو، دووبـارە بانگـی کـردەوە، هیـچ وەڵامێـک نەبـوو. جارێکـی تـر بانگـی کـردەوە: «ئایـا پـەروەردگار فەرمانـی پێ کردوویـت ئێمـە بهێنیـت بـۆ ئێـرە؟»

پەیامبەر ئیبراهیم وەڵامی دایەوە: «بەڵێ!»

دواتـر هاجـەرە خاتـوون ترسـەکەی نەمـا. هەرچەنـدە خـۆی و کۆرپەکـەی بـە تەنهـا لـە ناوەڕاسـتی بیابانێکدا بـوون و هیـچ ئاوێکـی لـێ نەبـوو، دڵنیابـوو لـەوەی پـەروەردگار بـە تەنهـا جێیـان ناهێڵێـت. ئیمانی زۆر بەهێز بوو و بە هیچ شێوەیەک ئیمانی بە پەروەرێن کز و لاواز نەبـوو. دوای ئـەوەی پەیامبـەر ئیبراهیـم ڕۆیشـت، حەزرەتـی ئیسـماعیل لـە تینوێتیـدا دەسـتی بـە گریـان کـرد.

هەرچەنـدە هاجـەرە خاتـوون تەوەکولـی تەواوەتـی بـە پـەروەردگار هەبـوو، دانەنیشـت چاوەڕێـی ئـاو بـکات لـە ئاسـمانەوە بـۆی بێتـە خـوارەوە. هەرچەنـدە دڵـی پڕ بـوو لـە ئیمـان بـە پـەروەردگار، بـەڵام هەمـوو هەوڵێکـی خـۆی دا.

بـە خێرایـی لەنێـوان چیاکانـی (سـەفا و مـەروا)دا ڕایدەکـرد و بـە دوای ئـاودا دەگـەڕا بـۆ کۆرپەکـەی. کاتێـک دەگەیشـتە سـەر چیاکـە و هیچـی نەدەدۆزییـەوە، بێتاقـەت و نائومێـد نەبـوو. ئیمانەکـەی جێگیـر بـوو و لـە هەوڵـدان بـەردەوام بـوو. لەڕاسـتیدا هاجـەرە خاتـوون زۆر هەوڵـی دا بـە شـێوەیەک کـە نەریتەکـە بـە «سـعی» ناسـراوە کـە بـە مانـای (هەوڵـدان) دێـت.

زۆر کـەس هـەن جیـاوازی ناکـەن لەنێـوان تەوەکـول و وازهێنـان لـە هەوڵـدان، بـەڵام تەوەکـول بـە هیـچ شـێوەیەک بـە مانـای وازهێنـان لـە هەوڵـدان نایـات. بەسـەرهاتی هاجـەرە خاتـوون یەکێکـە لـە جوانتریـن نموونەکانـی ئـەم وانەیـە کـە لـە لایـەن پەیامبەرمانـەوە فێـر کراویـن. کاتێـک پیاوێـک هـات بـۆ لای پەیامبەرمـان موحەممـەد و پرسـی ئایـا تەوەکولـم بـە پـەروەردگار هەبێـت و حوشـترەکەم بـە نەبەسـتراوی جێبهێڵـم؟ یاخـود حوشـترەکەم ببەسـتمەوە و پاشـان تەوەکولـم بـە پەروەرێـن هەبێـت؟ پەیامبەرمـان فەرمـووی: «حوشـترەکەت ببەسـتەرەوە و پاشـان تەوەکولـت هەبێـت و پشـت بـە پـەروەردگار ببەسـتە.»

تەوەکـول بریتـی نییـە لـە کردارێکـی جەسـتەیی، بەڵکـوو کـرداری دڵەکانـە. بۆیـە کاتێـک دەسـت و قـاچ زۆر هـەوڵ دەدەن، دڵ بـە تـەواوی پشتبەسـتوو بـە پـەروەردگارە. واتـا دەرئەنجامـی هەوڵدانـی دەسـت و قـاچ هـەر شـتێک بێـت، دڵ بـە تـەواوی ڕازییـە و دەزانێـت کـە ئـەوە بڕیارێکـی دروسـتی پـەروەردگارە بـۆ گەیشـتن بـەم ئاسـتە، پێویسـتە پڕئومێـد بیـت و بـە دەسـت و قـاچ و جەسـتە هـەوڵ بدەیـت و واز لـە دڵـت بهێنیـت.

## ئەمە بەئاگاهاتنەوەیە

زۆر سـەختە وەسـفکردنی ئـەو هەسـتەی کـە هەتـە. بیهێنـە پێش چاوت کە تـەواوی ژیانت لـە ئەشکەوتێکدا بەسـەر دەبەیت و بـاوەڕت وایـە ئـەو ئەشـکەوتە هەمـوو جیهانـی تۆیـە، دواتـر هەنـگاو دەنێیتـە دەرەوە، بۆ یەکەمجـار لـە ژیانتدا ئاسـمان دەبینیت. درەخـت و باڵندە و خـۆر دەبینیت. بۆ یەکەمجار لـە ژیانتدا تێدەگەیت ئـەو جیهانـەی کە پێشـتر دەتزانـی و پێـی ئاشـنابوویت جیهانێکـی سـاختە و هەڵـە بـووە. بۆ یەکەمجـار جیهانێکـی ڕاسـتەقینەتر و جوانتـر دەدۆزیتـەوە، بیـر لـەم دەرککردنـە بکـەرەوە.

بۆ ساتێک هەست دەکەیت کە دەتوانیت هەمـوو شـتێک ئەنجام بدەیت و هیچ شـتێکی ناو جیهانەکەی پێشـووت (ئەشـکەوتەکە)، بە لاوە گرنـگ نابێت. بەهێز دەبیت و تـەواو بەئـاگا دێیت و بۆ یەکەمجـار بـە تـەواوی بـە ئـاگا دێیتـەوە. هەسـتێکی وەسـفنەکراوە. ئەو هەسـتە ڕۆحییە بەهۆی دۆزینەوەی ڕاستییەکەوە دروست دەبێت، ئەمە بەئاگاهاتنەوەیە.

کەسـێکی تـازە مسـوڵمانبوو هەسـت بەمـە دەکات. کەسـێکی بـە مسـوڵمان لەدایکبـوو کـە لـەم دینـە لادەدات و پاشـان دەگەڕێتـەوە ئـەم هەسـتەی لا دروسـت دەبێـت.

هەر کەسێک دوور لە پەروەردگار بژی و پاشان بگەڕێتەوە سەر ئایینی پەروەردگار، ئەم هەستەی لا دروست دەبێت. ئیمامی (ابن القیم) لە پەرتووکەکەیدا بە ناوی (مدارج السالكين)، (ڕێچکەکانی ڕێبواران)، ئەم بارودۆخە ناو دەبات بە (اليقظة)، واتا (بەئاگاهاتنەوە). باسی ئەم دۆخە دەکات لە یەکەمین وێستگەی ڕێگەی بەرەو پەروەردگاردا. ئەم دۆخە هەندێک جار بە «پەرۆشیی گەڕانەوە» ناو دەبرێت. کاتێک کەسێک دەگەڕێتەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاستی پەروەردگار زۆر جار پڕن لە وزە و جۆش کە کەسانی دی نیانە و هەستی پێ ناکەن. هۆکاری ئەم وزەیە بریتییە لە هەستی ڕۆحی و تایبەتمەندی ئەم دۆخە.

## «تایبەتمەندییەکانی وێستگەی بەئاگاهاتنەوە»

پەروەردگاری مەزن پەرستشمان لەسەر ئاسان دەکات. کاتێک لەم دۆخەداین، پەرستش بە لامانەوە زۆر ئاسانتر دەبێت. کەسەکان زۆر پاڵنراو و هاندراون بە شێوەیەک زۆر بە ئاسانی هەموو شتێک دەکەنە قوربانی لەپێناو ئەو ڕاستییە تازەیەی کە بۆیان دەرکەوتووە. ئەم حەماسەت و جۆش و خرۆشە کەسەکە بەرز دەکاتەوە لە پلەی سفرەوە بۆ پلەی شەست.

وەک ئەوەیە لەسەر ستیرۆیدێکی[2] ڕۆحی بێت. ئەو هێزەی هەتە لە خودی خۆتەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکوو یارمەتییەکە کە لە لایەن پەروەردگارتەوە پێتبەخشراوە. هەندێک کەس ڕەنگە بڵێن نابێت زوو زوو و خێرا بگۆڕێیت. بڕوا ناکەم ئەم خێرا گۆڕانە کێشەیەک دروست بکات. بڕوام وایە لەخۆباییبوون و نەبوونی

---

٢ ) ستیرۆید: گرووپێکی دەرمانی پزیشکییە.

پاڵپشتی کێشـەیەکی زۆر گەورەیە. ئەگـەر پـەروەردگار خەڵاتێکت پێ ببەخشـێت کـە بتوانیـت شـتی زیاتـر ئەنجـام بدەیـت، ئـەوا هیـچ لێـی مەوەسـتە و بێ دوودڵـی بـەکاری بهێنە، بەڵام بۆ ئـەو وزە و توانایـە سوپاسـگوزاری پـەروەردگار بـە نـەک خـودی خۆت.

بزانـە ئـەم بەرزبوونەوەیـە کاتییە. رەنگە لـە ماوەیەکی زۆر کورتـدا لـە پلـەی سفرەوە بگەیتـە پلـەی شەسـت بەهـۆی ئـەو وزە و توانایـەوە، بـەڵام کاتێک ئـەم مـاوە و قۆناغـە تێپـەڕی، هیـوا لەدەسـت مـەدە، مەهێڵە نـزم بیتـەوە و لـە پلـەی شەسـتەوە بگەڕێیتـەوە سـەر پلـەی سـفر. ئـەم دۆخـی بەرزبوونەوەیـە و پڕ جـۆش و خرۆشـییە هاوشـێوەی هەمـوو دۆخەکانی ئـەم ژیانـە کاتییە. ئـەم ژیانـە هەرگیز زنجیرە نییـە. ڕێگای پەروەردگاریـش زنجیـرە نییـە، هەسـت نەکـردن بـەوەی ئـەم قۆناغـە هەمیشـەیی نییـە، دەبێتـە هـۆی نائومێدی کاتێک تێدەپەڕێت و نامێنێت.

## «گرفتەکانی ئەم دۆخە»

دوو گرفتەکـەی ئـەم دۆخـە پەیوەسـتن بـە تێنەگەیشـتن لـە تایبەتمەندییەکانـی ئـەم دۆخـەی کـە لـە سـەرەوە ئاماژەمـان پـێ دا. هەروەهـا ئـەم گرفتانـە دوو هـۆکاری سـەرەکین بـۆ ساردبوونەوە و لادان لـە ڕێگای پـەروەردگار: لەخۆباییبـوون/ لەخۆڕازیبـوون و نائومێدی. کەسـی لەخۆبایـی هەسـت دەکات هەمـوو شـتێکی هەیـە، بۆیـە پێویسـت ناکات چیدی هـەوڵ بدات. کەسـی نائومێد بڕوای وایـە کە کەسێکی زۆر گونجاو و شیاو نییە، بۆیـە لە هەوڵدان دەوەسـتێت. دوو نەخۆشـی پێچەوانـەی یەکترن، بـەڵام هەمـان دەرئەنجامیـان هەیـە، ئەوەیـش سـاردبوونەوەیە لـە پەرسـتش و بەردەوامبـوون لەسـەر ڕێـگای پـەروەردگار.

لەخۆباییبوون: یەکەمین گرفت پەیوەسـتە بە تێنەگەیشـتن لـەوەی

کە ئەو وزە و توانا زۆرەت لە پەرستشدا لە لایەن پەروەردگارەوەیە و پەیوەستە بە تایبەتمەندییەکی دۆخەکەوە نەک خودی کەسەکە. ئەو کەسەی لەم دۆخە تێناگات، بە هەڵە توانای زۆری کەسەکە لە پەرستش و چاکەکاریدا دەگەڕێنێتەوە بۆ توانا و لێهاتوویی خودی کەسەکە. ئەم تایبەتمەندییە هەڵەیە زۆر ترسناکە، چونکە دەبێتە هۆی لەخۆباییبوون و خۆبەچاکزانین، لەبری هەستکردن بەوەی ئەم دۆخە ئایینییە خەڵاتێکی پەروەردگارە، پەرستشکار هەست بە شانازییەکی شاراوە دەکات، بە کەم تەماشای ئەو کەسانە دەکات کە هەمان جۆش و خرۆشیان نییە.

نائومێدی: ئەم گرفتە پەیوەیستە بە تێنەگەیشتن لەوەی ئەم دۆخە ڕۆحییە هاوشێوەی هەموو دۆخەکانی تر کاتییە. مانای ئەوە نییە شکستت هێنابێت، یاخود شتێکی هەڵەت ئەنجام دابێت. زۆر کەس ئەو هەستەی دوای مانگی ڕەمەزان دەزانێت و ئەزموونی کردووە. ناجێگیری یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی ژیان. تەنانەت ئەبوبەکر پێویست بوو فێری ئەم وانەیە ببێت. ئەبوبەکر دەگێڕێتەوە: **(قُلتُ: نَافَقَ حَنظَلَةُ، يَا رَسُولَ اللهِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ «وَمَا ذَاكَ؟» قُلتُ: يَا رَسُولَ اللهِ نَكُونُ عِندَكَ، تُذَكِّرُنَا بِالنَّارِ وَالجَنَّةِ، حَتَّى كَأَنَّا رَأْيُ عَينٍ، فَإِذَا خَرَجْنَا مِنْ عِندِكَ، عَافَسْنَا الأَزْوَاجَ وَالأَوْلَادَ وَالضَّيْعَاتِ، نَسِينَا كَثِيرًا فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: «وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنْ لَوْ تَدُومُونَ عَلَى مَا تَكُونُونَ عِندِي، وَفِي الذِّكْرِ، لَصَافَحَتْكُمُ المَلَائِكَةُ عَلَى فُرُشِكُمْ وَفِي طُرُقِكُمْ، وَلَكِنْ يَا حَنظَلَةُ سَاعَةً وَسَاعَةً» ثَلَاثَ مَرَّاتٍ)**، (رواه مسلم).

«ڕۆژێکیان ئەبوبەکر و حەنزەلە هاتن بۆ لای پەیامبەر موحەممەد(ﷺ) و حەنزەلە فەرمووی: ئەی پەیامبەری خوا حەنزەلە بووە دووڕوو. پەیامبەرمان خوا لێی ڕازیبێت فەرمووی: بۆچی؟

فەرمـووی: ئـەی پەیامبـەری خـوا کاتێـک لەگـەڵ تۆدایـن، بەهەشـت و ئاگـری دۆزەخمـان دەخەیتـەوە یـاد، وەک ئـەوەی بـە چاوەکانمـان بەهەشـت و دۆزەخ ببینیـن. کاتێـک تـۆ بەجێدێڵیـن، بـە بێئاگاییەکـی زۆرەوە گرنگـی بـە هاوسـەرەکانمان و منداڵەکانمـان و موڵکەکانمـان دەدەیـن. پاشـان پەیامبەرمـان فەرمـووی: سـوێند بێت بـە پـەروەردگار کـە ڕۆحـی منـی بەدەسـتە، ئەگـەر بـە هەمـان بارودۆخـی لای مـن بمێننـەوە و لـە یـادی خـوادا بن، فریشـتەکان تەوقەتـان لەگەڵدا دەکـەن لەسـەر جێگا و سـەر شـەقامەکاندا، بـەڵام حەنزەلـە بیرت بێت هەمـوو کاتـەکان هاوشـێوەی یـەک نین، (پەیامبـەر سـێ جـار ئەمـەی فەرمـوو).

## «دوای ئەوەی ئیمانمان کز و لاواز بوو»

گرنگترین بەشـی ئـەم گەشـتە بریتییە لـەوەی هەرگیز کۆڵ نەدەیت. بزانـە هەمـوو کات هەست بە هەمـان جۆش و خرۆش ناکەیت، نـەک لەبـەر ئـەوەی شکسـتت هێنـاوە لـە شـتێکدا. کزی و لاوازی ئیمـان کـە بـەدوای ئـەم زیـادی ئیمانـەدا دێت بەشـێکی سروشـتیی ڕێگاکەیـە.

وەک پەیامبەرمـان بۆ ئەبوبەکر ڕوون کردەوە ئـەم بـەرز و نزمـی و زیـاد و کەمییـە بەشـێکن لـە ڕێگاکـە. ئەگـەر هەمیشـە لـە ئاسـتێکی بـەرزدا بمانیایەتـەوە، ئـەوا مـرۆڤ نەدەبوویـن، بەڵکـوو دەبووینـە فریشـتە. دیاریکردنـی سـەرکەوتن پەیوەسـت نییـە بـەوەی چـی دەکەیـن کاتێک لـە ئاسـتێکی بەرزدایـن. پرسـیارەکە ئەوەیـە چـی بکەیـن کاتێـک لـە ئاسـتێکی نزمدایـن و ئیمانمـان کـز و لاوازە، بـەڵام هەسـتی پـێ ناکەیـن. کلیلـی سـەرکەوتن لـەم ڕێگایـەدا بریتییـە لـەوەی کاتێـک دەگەیتـە ئاسـتێکی نـزم و ئیمانـت لاواز دەبێـت، بـەردەوام بیـت و بـە شـتێکی ئاسـایی بزانیـت.

## تەڵەکانی شەیتان:

بیرت بێت شـەیتان بـە چەندین شـێوەی جیاواز بۆت دێت بـە پێی دۆخەکەت.

## کاتێک لە ئاستێکی باڵادایت:

کاتێـک لـە ئاسـتێکی باڵادایـت، هـەوڵ دەدات فریـوت بـدات بـەوەی لەخۆبایـی بیـت. فریـوت دەدات لـە ڕێـی ئـەوەی بـە چاوێکـی کـەم تەماشـای ئەوانـی دی بکەیـت. لـە کۆتاییدا فریـوت دەدات بـەوەی زۆر لـە خـۆت ڕازی بیت، بـە ڕادەیـەک کـە هەسـت دەکەیـت چیدی پێویسـت نـاکات کۆشـش بکەیـت، چونکـە خـۆت بـە گـەورە دەزانیـت، وا هەسـت دەکەیـت لـە کەسـانی چـواردەورت باشـتریت. شـەیتان بـەردەوام وەسوەسـەت بـۆ دروسـت دەکات و وات لـێ دەکات سـەیری ئەوانـە بکەیـت کـە لـە تـۆ کاری کەمتـر ئەنجـام دەدەن بـۆ پاسـاوهێنانەوە بـۆ کەموکورییەکانـی خـۆت. بـۆ نموونـە: ئەگـەر حیجـاب نەپۆشـیت، وات لێ دەکات بیـر بکەیتـەوە کـە «زۆر ئافرەتـی حیجابپۆش هـەن چەندین کاری خـراپ ئەنجـام دەدەن. خـۆ مـن ئـەو کارە خراپانـە ناکـەم.

مـن چەندیـن کاری بـاش دەکـەم کـە حیجابـەکان نایکـەن»، یاخـود ئەگـەر لـە نوێژەکانتـدا کەمتەرخەمـی بکەیـت، وا بیـر دەکەیتـەوە کـە «خـۆ مـن ناچمـە ئارەقخانـەکان، یاخـود ئـارەق ناخۆمـەوە». بیـرت بێت پـەروەردگار هەڵسـەنگاندن نـاکات بەپێی بەراوردکردنـی کەسـەکان بـە کەسـانی دی. هیـچ گرنـگ نییـە کەسـانی دی چـی دەکـەن. هەموومـان لـە ڕۆژی دواییدا بـە تەنها دەوەسـتین. ئەمـە تەنها ئامرازێکـی شـەیتانە بـۆ وەسـتاندنمان و وازهێنانمـان لـە هـەوڵ و کۆشـش و پەرسـتش.

## کاتێک لە ئاستێکی نزمدایت:

کاتێـک لـە ئاسـتێکی نزمدایـت، شـەیتان بـە شـێوەیەکی جیاوازتـر وەسوەسـەت بۆ دروسـت دەکات و بۆت دێت. هـەوڵ دەدات لـە ڕێی نائومێدکردنتـەوە فریـوت بـدات. وات لـێ دەکات بـاوەڕ بکەیـت کـە کەسـێکی بێبەهایت، جا هیچ گرنگ نییە چەندە هـەوڵ بدەیت. هـەوڵ دەدات وا هەسـت بکەیـت کە کەسێکی شکسـتخواردوویت، گرنگ نییـە چـی دەکەیـت، هەرگیـز ناگەیتـەوە ئـەو ئاسـتەی پێشـووترت.

هەروەهـا هـەوڵ دەدات بڕوا بکەیـت کە کەسـێکی زۆر خراپیت، بۆیە ئەسـتەمە پـەروەردگار بتبەخشـێت. لـە ئەنجامـدا زیاتـر دادەڕوخێیت و نائومێد دەبیت. ڕەنگە پێشـتر لـە ئاسـتێکی بەرزدا بوویت، پاشـان زۆر هەسـت بـە خراپی دەکەیت، چونکە کەمتەرخەمیت لـە پەرستشـەکانتدا کردووە.

ڕەنگە بەهـۆی لەخواترسـی و چاکەکاری خۆتـەوە ڕێگـەت بە خەڵک نەدابێت هەڵـە بکـەن یاخـود لاواز بن. لـە کۆتاییدا تێکدەشـکێیت، چونکە چیـدی ڕێگـە بـە خـۆت نادەیـت هەڵـەی زیاتـر بکەیـت و لاواز بیـت. وا هەسـت دەکەیـت کـە نابێت هەڵـە بکەیـت، چونکـە مرۆڤیـت، کاتێـک هەڵەیـەک دەکەیت، زۆر سـەرزەنشـتی خـۆت دەکەیت بە ڕادەیەک کە زۆر نائومێـد دەبیـت. بـەردەوام دەبیـت لـەم نائومێدییـە. لـە ئەنجامـدا تاوانـی زیاتـر ئەنجـام دەدەیت کـە زیاتـر نائومێدت دەکـەن.

شـەیتان هـەوڵ دەدات وەسوەسـەت بـۆ دروسـت بـکات تاکـو تۆبـە نەکەیـت، یاخـود نوێژ نەکەیت لەبـەر ئـەوەی هەست دەکەیت کەسـێکی دووڕوو و خراپیت. وات لێ دەکات نائومێد بیت لە ڕەحمی بێسـنووری پەروەردگار. ئەمـە ئـەو شـتەیە کـە شـەیتان دەیەوێت لـە دڵ و زیهنتدا دروسـتی بـکات. بـە دڵنیاییـەوە هەمـووی درۆن. شـەیتان زۆر زیرەکـە

لـە فریـودان و خەڵەتاندنـدا. کاتێـک تاوانێـک ئەنجـام دەدەیـت، دەبێـت زیاتـر بگەڕێیتـەوە بـۆ لای پـەروەردگار.

بـۆ پاراسـتنی خـۆت لـەم نزمبوونەوەیـە، بیـرت بێـت نزمییـەکان بەشـێکن لـە ڕێگاکـە. بیـرت بێـت «فطـور»، (نزمـی) بەشـێکە لـە مرۆڤبـوون. کاتێـک تێدەگەیـت ئەمـە مانـای ئـەوە نییـە کـە هەڵـەت ئەنجـام داوە، یاخـود دووڕوویـت (وەک ئەبوبەکـر بیـری دەکـردەوە)، بـەڵام بـەردەوام دەبێت لـە وازهێنـان لـە پەرسـتش و عیبادەت کاتێک دەگەیتـە ئـەو ئاسـتە.

کلیلـی سـەرکەوتن بریتییـە لـەوەی بـەردەوام بێت لـە پەرسـتش و عیبـادەت، تەنانـەت لـە لاوازترین و خراپترین دۆخدا بێت. واتـا گرنـگ نییـە هەسـتت چۆنـە و چەنـدە بێهیـوا و هەسـت بـە کەمـی دەکەیـت، هێشـتا ئـەم پەرسـتش و کارانـە ئەنجـام بـدە. تێدەگەیـت کـە کاتێـک لـە ئاسـتێکی نزمدایـت، ڕێگاکـە و پەرسـتش و پابەندییـەکان سـەختتر دەبـن، بـەڵام بـەردەوام هـەوڵ دەدەیـت ئەنجامیـان بدەیـت. بـۆ نموونـە سـادەترین شـت بریتییـە لـە ئەنجامدانـی پێنـج نوێـژە فەرزەکـە لـە کاتـی خۆیانـدا. نابێـت هەرگیـز واز بهێنیـت، گرنـگ نییـە هەسـتت چـۆن بێـت. پێویسـتە وەک هەناسـەدان لـەو نوێـژە فەرزانـە بڕوانیـت. تەنهـا بهێنـە پێـش چـاوت چـی ڕوودەدات ئەگـەر هەسـت بـە ماندوویـی، یاخـود بێـزاری بکەیـت و بڕیـار بدەیـت چیـدی هەناسـە نەدەیـت؟

باشـتر و پەسـەندترە ئەرکەکانـی تـر ئەنجـام بدەیـت کـە بەشـێکن لـەو شـتانەی کـە گرنگـن ئەنجامـی بدەیـت. بـۆ نموونـە: نوێـژ و زیکـری زیاتـر ئەنجـام بـدە، یاخـود قورئـان بخوێنـەوە ئەگـەر کەمێکیـش بێـت. بیـرت بێـت پـەروەردگار پەرستشـی کـەم و بەردەوامـی پـێ خۆشـترە لـە زۆر و ناوبەنـاو. ئەگـەر لـە پەرستشـەکانت بـەردەوام بیـت لـە کاتـی کـزی و نزمـی ئیمانـدا، ئیمانـت بـەرەو هەڵکشـان دەچێـت. بـە ویسـتی

پەروەردگار کاتێک ئیمانت زیاد دەکات و بەرز دەبیتەوە لە ئاستێکی بەرزتردا دەبیت بە بەراورد بە جاری پێشوو.

بزانە ڕێگای پەروەردگار تەخت و ڕێک نییە. ئیمان زیاد و کەم دەکات، توانای پەرستشت زیاد و کەم دەکات. بەڵام لەگەڵ هەر نزمبوونەوەیەکدا، بەرزبوونەوەیەک هەیە. تەنها ئارام و بەردەوام بە، نائومێد مەبە و داوای یارمەتی لە پەروەردگار بکە. ڕێگای بەرەو پەروەرێن سەختە. ڕێگاکە بەرز و نزمی تێدایە. هاوشێوەی هەموو شتەکانی ئەم ژیانە ڕێگاکە کۆتایی دێت. ئەو کۆتاییە شایستەی هەموو شتێکە. پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ۞﴾ (سورەتی الانشقاق).

«ئەی ئینسان بەڕاستی تۆ خۆت زۆر ماندوو دەکەیت، زۆر ڕەنج و زەحمەت دەکێشیت، سەرئەنجامیش دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ لای پەروەردگارت تاکو پاداشتی ڕەنج و هەوڵەکەت وەربگریت(٦)».

# پلەوپایەی ئافرەتان

نەهاتوومەتە ئەم ژیانە تاکو خۆم نمایش بکەم. جەستەم بۆ ئەوە نییە هەمووان تەماشای بکەن. کەلوپەل، یاخود تەنها جووتێک قاچ نیم بۆ پێڵاوفرۆشتن بەکار بێم. من ڕۆح و عەقڵم هەیە و بەندەیەکی پەروەردگارم. بەهاکەم پەیوەستە بە جوانی ڕۆح و دڵ و ئەخلاقمەوە. پابەندی پێوەرەکانی جوانی ئێوە نابم، ملکەچ و پابەندی فاشیۆنەکانتان نابم، ملکەچی و پابەندیم بۆ شتێکی بالاترە.

# هێز و توانای ئافرەتان

کاتێک یاوەرەکانی پەیامبەر موحەممەد(ﷺ) دەچوونە ناو شارۆچکەیەکەوە تاکو پەیامی ئیسلامیان پێ بگەیەنێت، بە شێوەیەکی جوان دەیفەرموو: **(نَحنُ قَومٌ إبتَعَثَنا اللهُ لِنخرجَ العِبادَ مِنْ عِبَادَةِ العِبادِ الى عِبَادَةِ رَبِّ العباد).**

«هاتووین لە بەندایەتی بەندە ڕزگارتان بکەین بۆ بەندایەتی پەروەردگار.»

لەم وتەیەدا مانایەکی بەنرخ هەیە. لەناو ئەم وشانەدا کلیلی دەسەڵات و ڕێگای ڕاستەقینەی ڕزگاربوون هەیە. ببینە ئەو ساتەی من، یاخود تۆ ڕێگە دەدەین هەموو شتەکان جگە لە پەروەردگار سەرکەوتن و شکست و خۆشبەختی و بەهامان دیاری بکەن، کەوتووینەتە ناو بەندایەتیەکی بێدەنگ، بەڵام ڕووخێنەرەوە. ئەو شتە کۆنترۆڵم دەکات کە بەها و سەرکەوتن و شکستم دیاری دەکات. ئەو شتە دەبێتە گەورە و خاوەنم.

ئەو گەورەیەی کە بەهای ئافرەتی دیاری کردووە چەندین شێوەی لەخۆ گرتووە بە درێژایی مێژوو. یەکێک لە باوترین پێوەرەکانی ئافرەت بریتی بووە لە پێوەری پیاو.

بەڵام زۆر جار لە بیرمان دەچێت پەروەردگار ڕێزی لە ئافرەت ناوە و بە پێوەری خۆی بەهای دیاری کردووە نەک بە پێوەری پیاو. بەڵێ! کاتێک فێمینیستەکانی ڕۆژئاوا پەروەرێنیان سڕییەوە و لایانبرد، هیچ شتێک نەما وەکو پێوەری ئافرەتان دابنرێت جگە لە پیاوان. لە ئەنجامدا فێمینیستەکانی ڕۆژئاوا ناچار بوون بەهای خۆیان دیاری بکەن بە بەراوردکردنی خۆیان بە پیاوان. بەم شێوەیە گریمانەیەکی هەڵەیان هەڵبژارد. قبوڵیان کرد پیاوان پێوەر بن بۆیان. واتا ئافرەتان هەرگیز نابنە مرۆڤی تەواو و کامڵ تا ئەو کاتەی هاوشێوەی پیاوانیان لێ نەیات.

کاتێک پیاو قژی کورت دەکردەوە، ئەویش دەیویست قژی کورت بکاتەوە. کاتێک پیاو دەچوویە ڕیزی سوپاوە، ئەویش دەیویست بچێتە ڕیزی سوپاوە. ئەم شتانەی دەویست، چونکە پیاوان کە تاکە پێوەری ئافرەتان بوون هەیانبوو.

ئەوەی ئافرەتان هەستیان پێ نەکرد ئەوەبوو کە پەروەردگار پیاوان و ئافرەتانی بە جیاواز خوڵقاندووە، نەک هاوشێوەی یەکتر. کاتێک ئافرەتان پیاوان وەک پێوەری خۆیان دیاری دەکەن، هەر تایبەتمەندییەکی ئافرەتانە دەبێتە خاڵی لاوازیان. هەستیاربوون بە سووکایەتی دادەنرێت، بوونە دایک بێڕێزیی دەبێت. لە ململانێی نێوان عەقڵ (کە تایبەتمەندییەکی پیاوانەیە) و هەست و سۆزدا (کە تایبەتمەندی ئافرەتانەیە)، ئەقڵیەت دەسەڵات دەگرێتە دەست.

کاتێک قبوڵمان کرد هەر شتێک کە پیاوان هەیانە و ئەنجامی دەدەن باشتر بێت، ئەو شتانەی بە دوایدا دێت تەنها کاردانەوەیەکی کاتییە، پەرچەکردارێکی بێئاگاییانەیە، ئەگەر پیاوان هەیانبێت، ئافرەتانیش دەیانەوێت. ئەگەر پیاوان لە ڕیزەکانی پێشەوە نوێژ بکەن، وادەزانین

کە باشتر و خێرترە، بۆیە ئێمەیش دەمانەوێت لە ڕیزەکانی پێشەوە نوێژ بکەین. ئەگەر پیاوان پێشنوێژی بکەن، وادەزانین ئیمامەکە لە پەروەردگارەوە نزیکترە، بۆیە ئێمەیش دەمانەوێت پێشنوێژی بکەین. ئەو بۆچوونەمان قبوڵ و پەسەند کردووە کە پێشەواییکردن لەم دونیایەدا ئاماژەیەکە بۆ پلەی کەسەکان لە لای پەروەردگار.

بەڵام پێویست ناکات ئافرەتانی مسوڵمان بەم شێوەیە خۆیان کەم بکەنەوە، چونکە پەروەردگاریان وەک پێوەر هەڵبژاردووە. پەروەردگاریان هەیە بەهایان دیاری بکات، پێویستیان بە پیاوان نییە بەهایان پێ بدەن. تەنها خۆمان نزم دەکەینەوە بە هەوڵدانمان بۆ بوون بە شتێک کە نین، بە ڕاستی نامانەوێت وەک پیاوان بین، ئێمەی ئافرەتان هەرگیز ناگەین بە ئازادی ڕاستەقینە تاکو ئەو کاتەی واز دەهێنین لە لاساییکردنەوەی پیاوان، بەهای جوانیمان تەنها لەو جیاوازییەدایە کە پەروەردگار پێی بەخشیوین.

لە کۆمەڵگادا شتێکی تر هەیە ئەویش «سەرداربوون و گەورەیی»، کە بەهای ئافرەتان دیاری دەکات. ئەو گەورەیەیش بریتییە لە پێوەری جوانی. هەر لە منداڵیمانەوە ئێمەی ئافرەتان لە لایەن کۆمەڵگاوە فێری پەیامێکی ڕوون کراوین. پەیامەکە بریتییە لەوەی خاوەن لەشولارێکی ڕێک و سەرنجڕاکێش و قەشەنگ بین، ئەگەر نا هیچ بەهایەکمان نابێت.

پێمان وترا مکیاژ بکەین و تەنوورەی کورت لەبەر بکەین، ڕێنمایی کراین بەوەی ژیان و جەستە و شکۆمان لەپێناوی جوانیماندا تەرخان بکەین. بڕوامان وابوو گرنگ نییە چی دەکەین، چونکە تا ئەو ڕادەیە گرنگین کە پیاوان لە خۆمان ڕازی بکەین و بە لای پیاوانەوە جوان دەرکەوین. ژیانمان بەسەر برد لە ڕێی جوانکارییەوە، جەستەمان تەرخان کرد بۆ ڕیکلامەکانی فرۆشتن.

ئێمە بەندە بووین و پێیان وتین ئازاد و سەربەستین. بەندەیان بووین و سوێندیان خوارد کە سەرکەوتووین، فێریان کردین مەبەستی ژیان بریتییە لە خۆنیشاندان و خۆدەرخستن و سەرنجڕاکێشان و جوانبوون بە لای پیاوانەوە. باوەڕیان پێمان هێنا کە جەستەمان دروست کراوە بۆ بازاڕکردن و فرۆشتنی ئۆتۆمبیلەکانیان، بەڵام درۆیان کرد. جەستە و ڕۆحمان لەپێناو شتێکی باڵاتردا دروست کراوە، شتێکی زۆر باڵاتر، پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ﴾ (سورەتی الحجرات).

«بەڕاستی باشترینتان لای پەروەردگار کەسێکە کە لە خودا دەترسێت و پارێزکارە.»

کەواتە ئێمەی ئافرەتان ڕێزمان لێ نراوە، بەڵام ڕێزەکەمان نە پەیوەستە بە پیاوانەوە، نە پەیوەستە بە هاوشێوەبوونی ئەوانەوە، نە ڕازیکردنی ئەوانە. بەهای تۆ وەکو ئافرەت بە قەبارەی کەمەرت، یاخود ژمارەی ئەو پیاوانەی حەزیان لێتە ناپێورێت. بەهای تۆ وەکو مرۆڤ بە پێوەرێکی باڵاتر دەپێورێت: پێوەری چاکەکاری و خوداناسی. مەبەستی تۆ لە ژیاندا ئەوە نییە کە گۆڤارەکانی فاشیۆن دەیڵێن، شتێکی زۆر باڵاترە لەوەی بەلای پیاوانەوە سەرنجڕاکێش دەرکەویت.

کامڵبوون و تەواوبوونی ئێمە پەیوەستە بە پەروەردگار و پەیوەندیمان لەگەڵ ئەودا. هەر لە منداڵیمانەوە ئێمەی ئافرەتان فێر کراوین هەرگیز کامڵ نابین تاکو ئەو کاتەی پیاوێک دێت و کامڵمان دەکات هاوشێوەی ساندرێلا، فێر کراوین کە بێیارمەتین تاکو ئەو کاتەی شازادەیەک دێت و ڕزگارمان دەکات.

هاوشێوە جوانکیلەی خەوتوو پێمان وترا کە ژیان بە تەواوی دەست پێ ناکات تاکو ئەوەی شازادە چارمین دێت و ماچمان دەکات، بەڵام لێرەدا شتێکی گرنگ هەیە، هیچ شازادەیەک ناتوانێت کامڵت بکات، هیچ سوارچاکێک ناتوانێت ڕزگارت بکات، تەنها پەروەردگار نەبێت.

شازادەکەت کەسێکە پەروەردگار دەینێرێت تاکو ببێتە هاودەمت نەک ڕزگارکەرت. جوانی چاوەکانت نەک هەوا و ئۆکسجینی ناو سییەکانت. هەواکەت لە پەروەردگارەوەیە. ڕزگاربوون و کامڵبوونت پەیوەستە بە نزیکبوون لە پەروەردگارەوە، نەک نزیکبوون لە هەر شتێکی دروستکراوەوە، نەک نزیکبوون لە شازادە، یاخود فاشیۆن و جوانی و ستایلەوە.

بۆیە داواتان لێ دەکەم ئەو شتانە لەبیر بکەن. داواتان لێ دەکەم هەڵبسنەوە و بە جیهان ڕابگەیەنن کە بەندەی هیچ شتێک نین، نە فاشیۆن و نە جوانی و نە پیاوان. تەنها و تەنها بەندەی پەروەردگارن. داواتان لێ دەکەم بە جیهان ڕابگەیەنن کە نەهاتوونەتە ئەم جیهانەوە تاکو بە جەستەتان پیاوان لە خۆتان ڕازی بکەن. ئێوە لێرەن تاکو پەروەردگار لە خۆتان ڕازی بکەن، بۆیە تەنها خەندەیەک بکەن و بڵێن: (سوپاس بۆ هەوڵەکانتان، بەڵام پێویستمان بە یارمەتی ئێوە نییە)، بەو کەسانەی کە پێیان وایە کە چاکەی تۆیان دەوێت و دەیانەوێت ئازادت بکەن.

پێیان بڵێ کە لێرە نین بۆ ئەوەی خۆمان نمایش بکەین. جەستەت بۆ ئەوە نییە پیشانی هەمووانی بدەن. دڵنیا بینەوە لەوەی هەموو جیهان بزانێت کە هەرگیز خۆت دانابەزێنیت بۆ شتێک، یاخود جووتێک قاچ بۆ فرۆشتنی پێڵاو. ڕۆح و ئەقڵت هەیە و بەندەیەکی پەروەردگاریت. بەهای تۆ بە جوانی ڕۆح و دڵ و ئەخلاقتەوە دیاری

دەکرێت و دەپێورێت، بۆیە پێوەرەکانی جوانی ئەوان ناپەرستیت، ملکەچ و پابەندی فاشیۆنی ئەوان نابیت، ملکەچبوون و پابەندیت بۆ شتێکی زۆر بالایە.

بۆیە لە وەلامی ئەو پرسیارەی کە لەکوێ و چۆن ئافرەتان دەسەلات پەیدا دەکەن، دەگەڕێمەوە سەر وتەکەی هاوەڵی پەیامبەرمان. دەگەڕێمەوە سەر ئەوەی کە ئازادی ڕاستەقینە و دەسەلات تەنها لە ڕێی ڕزگارکردنی خۆمانەوە دەبێت لە هەموو گەورەکانی تر و پێناسەکانی تر و پێوەرەکانی تر.

ئێمەی ئافرەتانی مسوڵمان لەم بەندایەتییە بێدەنگە ڕزگار بووین، پێویستمان بە پێوەری جوانی و فاشیۆنی کۆمەڵگا نییە تاکو بەهامان هەڵبسەنگێنێت و دیاری بکات. پێویست بەوەناکات هاوشێوەی پیاوان بین تاکو ڕێزمان لێ بگیرێت، پێویست ناکات چاوەڕێی شازادەیەک بین ڕزگارمان بکات، یاخود کامڵمان بکات. بەها و ڕێز و ئازادی و کامڵبونمان پەیوەست نییە بە بەندەکانەوە، بەڵکوو پەیوەستە بە پەروەرێنی بەندەکانەوە.

## پەیامێک بۆ ئەو کولتوورەی پەروەردەی کردووم

گەورە دەبووم و چیرۆکی بەچکە قازە ناشرینەکەت بۆ دەخوێندمەوە. بۆ چەندین ساڵ هەستم دەکرد ئەو بەچکە قازە منم، بۆ ماوەیەکی زۆر فێرت کردم کە هیچ نیم جگە لە کۆپییەکی خراپی پێوەرەکەم کە پیاوانن، نەمدەتوانی خێرا ڕابکەم، یاخود شتی زۆر هەڵبگرم، هەمان بڕە پارەم پەیدا نەدەکرد و زۆر جار دەگریام. لە جیهانێکی پیاوانەدا گەورەبووم کە سەر بەو جیهانە نەبووم. کاتێک نەمتوانی وەک پیاوان وابم، دەمویست ڕازییان بکەم، مکیاژم دەکرد و تەنوورەی زۆر کورتم دەپۆشی.

ژیان و جەستە و شکۆم تەرخان کرد لەپێناو ئەوەی جوان دەرکەوم، دەمزانی گرنگ نییە چی ئەنجام دەدەم، بەها و نرخی من پەیوەستە بەوەی تاکو چەند پیاوان لە خۆم ڕازی دەکەم و قەشەنگ دەبم بە لایانەوە. بۆیە تەواوی ژیانم لە جوانکاریدا بەسەر برد، جەستەم پێشکەش کرد تاکو بیفرۆشن.

بەندەیەک بووم، بەڵام وا فێر کرابووم ئەوە ئازادییە. بەندەیەکت بووم، بەڵام سوێندت خوارد کە سەرکەوتنم بەدەست هێناوە. فێرت کردم مەبەستی من لەم ژیانەدا تەنها بریتییە لە خۆدەرخستن و

سەرنجڕاکێشان و جوانبوون بە لای پیاوانەوە. وات لێ کردم باوەڕ بکەم جەستەم بۆ فرۆشتنی ئۆتۆمبیلەکانتان دروست کراوە.

وا پەروەردەت کردم هەست بکەم بەچکە قازە ناشرینەکەم، بەلام ڕاستت نەکرد.

ئیسلام پێم دەڵێت کە من جیاوازم و بەو شێوەیە دروست بووم، جەستە و ڕۆحم بۆ مەبەستی تر دروست بوون. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓا۟ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ١٣﴾ (سورەتی الحجرات).

«ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە هەمووتانمان لە نێر و مێیەک دروست کردووە، (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە) و کردوومانن بە چەندەها گەل و تیرە و هۆزی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە، بەڕاستی بەڕێزترینتان لای پەروەردگار ئەو کەسانەتانن کە زۆرتر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خودایە، بێگومان خودا زانا و ئاگایە بە هەمووان(١٣)».

بەهای تۆ وەکو ئافرەت بە قەبارەی کەمەرت، یاخود ژمارەی ئەو پیاوانەی حەزیان لێتە ناپێورێت. بەهای تۆ وەکو مرۆڤ بە پێوەرێکی بالاتر دەپێورێت: پێوەری چاکەکاری و خوداناسی. مەبەستی تۆ لە ژیاندا جگە لەوەی گۆڤارەکانی فاشێون دەیڵێن شتێکی زۆر بالاترە لەوەی کە بە لای پیاوانەوە سەرنجڕاکێش دەرکەویت.

پەروەردگار فەرمانم پێ دەکات خۆم داپۆشم و جوانیم بشارمەوە و بە جیهان ڕایگەیەنم نەهاتووم بۆ ئێرە تاکو لە ڕێی جەستەمەوە پیاوان لە خۆم ڕازی بکەم، هاتوومەتە ناو ئەم جیهانەوە تاکو پەروەردگارم لە خۆم ڕازی بکەم. پەروەردگار شکۆی ئافرەتانی

بەرز ڕاگرتووە لە ڕێی فەرمانکردن بە خۆداپۆشینیان و دەرخستنیان تەنها بۆ ئەو کەسەی شایەنیەتی کە هاوسەرگیری لەگەڵدا دەکەن.

بۆیە ئەوانەی دەیانەوێت ئازادم بکەن یەک وتەم هەیە بۆیان، «سوپاس بۆ هەوڵەکانتان، بەڵام پێویستم بە یارمەتی ئێوە نییە».

من نەهاتووم بۆ ئێرە تاکو خۆم دەربخەم. جەستەم بۆ ئەوە دروست نەبووە پیشانی هەمووانی بدەم. کەلوپەلێک، یاخود جووتێک قاچ نیم بۆ پێڵاوفرۆشتن بەکاری بێم. من ڕۆح و ئەقڵم هەیە و بەندەیەکی پەروەردگارم. بەهای من لە ڕێی جوانی ڕۆح و ئەقڵ و ئەخلاقمەوە دەپێورێت و دیاری دەکرێت. پێوەرەکانی جوانی تۆ ناپەرستم، ملکەچی فاشیۆنەکەت نابم. ملکەچبوونم تەنها بۆ شتێکی بالاترە.

لە ڕێی سەرپۆشەکەمەوە ئیمانم دەردەخەم نەک جوانیم. بەهای من وەکو مرۆڤ پەیوەستە بە پەیوەندیم لەگەڵ پەروەردگارەوە نەک بە جوانی ڕووخسارمەوە. ئەوەی پەیوەست نییە بە بەهای منەوە، دایدەپۆشم. کاتێک تەماشام دەکەیت، جەستەم نابینیت. بەو شێوەیە لێمدەڕوانیت کە هەم: بەندەیەکی خالقەکەمم.

وەک ئافرەتێکی مسوڵمان ڕزگاربووم لەو جۆرە بەندایەتییە بێدەنگە، وەڵامی بەندەکانی پەروەردگار نادەمەوە لەسەر زەویدا، بەڵکوو وەڵامی خالقەکەیان دەدەمەوە.

## تێڕامانی ئافرەتان لەبارەی پێشنوێژییەوە

لە ڕۆژی هەینی، بەرواری (١٨/ ٣/ ٢٠٠٥)دا، (ئامینە وەدود)، یەکەمین پێشنوێژیی هەینی ئەنجام دا. لەو ڕۆژەدا ئافرەتان هەنگاوێکی گەورەیان نا تاکو وەک پیاوان دەرکەون، بەڵام ئایا بەم کارە لەو ئازادییە نزیکتر بووینەوە کە پەروەردگار پێی بەخشیوین؟ هەستناکەم وابێت.

لە یادمان کردووە کە پەروەردگار ڕێزی لە ئافرەتان ناوە لە ڕێی پەیوەندی بە پەروەردگارەوە نەک پیاوانەوە. بەڵێ! کاتێک فێمینیستەکانی ڕۆژئاوا خودایان سڕییەوە و لایان دا، هیچ شتێک نەما وەکو پێوەر دابنرێت جگە لە پیاوان.

لە ئەنجامدا فێمینیستەکانی ڕۆژئاوا ناچار بوون بەهای خۆیان دیاری بکەن لە ڕێی بەراوردکردنی خۆیان بە پیاوانەوە. بەم شێوەیە گریمانەیەکی هەڵەیان هەڵبژارد. قبووڵیان کرد پیاوان پێوەر بن بۆیان. واتا ئافرەتان هەرگیز نابنە مرۆڤی تەواو و کامل تاکو ئەو کاتەی هاوشێوەی پیاوانیان لێ نەیەت.

کاتێک پیاو قژی کورت دەکردەوە، ئەویش دەیویست قژی کورت بکاتەوە. کاتێک پیاو دەچوویە ڕیزی سوپاوە، ئەویش دەیویست بچێتە ڕیزی سوپاوە. ئەم شتانەی دەویست، چونکە پیاوان کە

بوونـە پێـوەر بـۆ ئافرەتـان هەیانبـوو.

ئـەوەی ئافرەتـان هەسـتیان پـێ نەکردبـوو، ئـەوە بـوو پـەروەردگار ڕێـزی لـە پیـاوان و ئافرەتـان نـاوە بەهـۆی جیاوازییانـەوە نـەک هاوشـێوەبوونیان. لـە بـەرواری (١٨/ ٣/ ٢٠٠٥)دا ئافرەتانـی مسـوڵمان هەمـان هەڵەیـان ئەنجـام دایـەوە.

لـە ١٤٠٠ سـاڵ لەمەوبـەرەوە چەندیـن زانـا هەبـوون هاوڕابـوون لەسـەر ئـەوەی دەبێـت پیـاوان پێشـنوێژی بکـەن، بـەڵام بۆچـی ئەمـە بوویـە گرفـت بـە لای ئێمـەی ئافرەتانـی مسـوڵمانەوە؟ ئـەو کەسـەی پێشـنوێژی دەکات بـە هیـچ شـێوەیەک باڵاتـر نییـە. هـەر شـتێک پیـاو ئەنجامـی بدات مانـای ئـەوە نییـە باشـتر و خێرتـر بێـت. پێشـنوێژیکردن باشـتر و خێرتـر نییـە تەنهـا لەبـەر ئـەوەی پێشـەوایەتییە. ئایـا ئـەوە ئەرکـی ئافرەتانـە، یاخـود شـتەکە زیاتـر ئیلاهییـە؟ بۆچـی پەیامبـەر داوای لـە عائیشـە، یاخـود خەدیجـە، یاخـود فاتیمـە نەکـرد پێشـنوێژی بکـەن لـە کاتێکـدا گەورەتریـن و بەڕێزتریـن ئافرەتـان بـوون؟ ئـەوان مـژدەی بەهەشـتیان پـێ درابـوو، بـەڵام هەرگیـز پێشـنوێژیان نەکـرد.

بـەڵام ئیسـتا دوای ١٤٠٠ سـاڵ تەماشـای پیـاوان دەکەیـن کـە پێشـنوێژی دەکـەن، وا دەزانیـن ئـەوە نادادپەروەرییە. وا بیـر دەکەینەوە لـە کاتێکـدا پەروەردگار هیـچ ئیمتیازێکـی نەداوە بـەو کەسـەی پێشـنوێژی دەکات. لـە لای پـەروەردگار ئیمـام باڵاتـر و لەپێشـتر نییـە لـەو کەسـەی کـە لـە دوایـەوە نوێـژ دەکات، لـە لایەکـی تـرەوە تەنهـا ئافرەتـان دەتوانـن ببنـە دایـک. پەیامبەرمـان موحەمـەد(ﷺ) ئیمتیـازی تایبەتـی داوە بـە دایکان. پەیامبەرمـان فێـری کردوویـن **«الجنه تحت اقدام امهات»**.

واتـا «بەهەشـت لەژێـر پێـی دایکاندایـە»، بـەڵام گرنـگ نییـە پیـاوان چـی دەکـەن هەرگیـز ناتوانـن ببنـە دایـک، ئـەی بۆچـی ئەمـە نادادپـەروەری نییـە؟

کاتێک پرسیار کرا، کێ شایستەترینە بۆ ئەوەی بە جوانی و نەرمی ڕەفتاری لەگەڵدا بکەین؟ پەیامبەر سێ جار وەڵامی دایەوە «دایکت!» پێش ئەوەی بفەرموێت «باوکت!» ئایا ئەوە شتێکی جنسییە؟ گرنگ نییە پیاوان چی بکەن، بەڵام هەرگیز ناتوانن پلەوپایەی دایکانیان هەبێت.

بۆیە کاتێک پەروەردگار بە شتانێک شکۆدارمان دەکات کە تایبەتە بە ئافرەتانەوە، زۆر سەرقاڵ دەبین بەوەی بەهای خۆمان بدۆزینەوە بەوەی هاوشێوەی پیاوان بین، بۆیە ئەو تایبەتمەندیانە بەرز نانرخێنین، یاخود هەر تێبینی ناکەین. پیاوانمان وەکو پێوەری هەڵسەنگاندنمان قبوڵ کردووە، بۆیە هەر تایبەتمەندییەکی ئافرەتانە بە کەم و سووک تەماشا دەکەین.

هەستیاربوون بە بێڕێزی دادەنرێت، بوونە دایک بە نزمبوونەوەی پلە و پایە دادەنرێت. لە ململانێی نێوان ئەقڵگەرایی، (کە بە تایبەتمەندی پیاوانە دادەنرێت) و هەست و سۆز، (کە بە تایبەتمەندی ئافرەتانە دادەنرێت)، ئەقڵگەرایی دەسەڵات دەگرێتە دەست.

کاتێک ڕازین بەوەی هەر شتێک پیاوان هەیان بێت و ئەنجامی بدەن باشتر بێت، ئەنجامەکەی کاردانەوەیەکی بێئاگایانە دەبێت. ئەگەر پیاوان هەیانبێت، ئێمەیش دەمانەوێت، ئەگەر پیاوان لە ڕیزەکانی پێشەوە نوێژ بکەن، وادەزانین ئەوە باشتر و خێرترە، بۆیە دەمانەوێت لە ڕیزەکانی پێشەوە نوێژ بکەین. ئەگەر پیاوان پێشنوێژی بکەن، وادەزانین ئیمام نزیکترە لە پەروەردگارەوە، بۆیە دەمانەوێت پێشنوێژی بکەین. ئەو بۆچوونەمان وەرگرتووە کە پێشەواییکردن لەم دونیایەدا ئاماژەیە بۆ نزیکبوون لە پەروەردگارەوە.

پێویست ناکات ئافرەتانی مسوڵمان خۆیان بەم شێوەیە کەم بکەنەوە. ئافرەتان پەروەردگاریان وەکو پێوەر هەڵبژاردووە. پەروەردگاریان هەیە بۆ ئەوەی ڕێز و بەهایان پێ بدات، پێویستیان بە پیاوان نییە. لەڕاستیدا لە ڕێبازەکەماندا بۆ شوێنکەوتنی پیاوان، ئێمەی ئافرەتان هەرگیز بۆ ساتێک لەو ئەگەرە ورد نەبووینەتەوە کە ئەو شتەی هەمانە باشتر و خێرترە بۆمان. لە هەندێک حاڵەتدا دەستبەرداری شتانێکی باڵا دەبین، تەنها لەپێناو ئەوەی هاوشێوەی پیاوان بین.

پەنجا ساڵ لەمەوبەر کۆمەڵگا پێی وتین پیاوان لەپێشترن، چونکە ماڵیان جێدەهێشت تاکو لە کارگەکاندا کار بکەن. ئەو کات ئێمە دایک بووین منداڵمان پەروەردە دەکرد، ئێستا پێمان دەڵێن وازهێنان لە پەروەردەکردنی کەسانی تر و کارکردن لەسەر ئامێرێک مانای ئازادی ئافرەتانە. ئەوەمان قبووڵ کردووە کە کارکردن لە کارگەدا لەپێشتر و باشترە لە پەروەردەکردنی بنچینەی کۆمەڵگا، تەنها لەبەر ئەوەی پیاوان ئەنجامیان داوە. پێشبینیمان دەکرد دوای کارکردن ببینە مرۆڤێکی باڵا –دایکێکی کامڵ –هاوسەرێکی کامڵ –ماڵڕێکخەرێکی کامڵ –پیشەیەکی کامڵمان هەبێت. دوای ئەوەی هیچ گرفتێک نەبوو لەوەی ئافرەت پیشەیەکی باشی هەبێت، بۆمان دەرکەوت کە قوربانیمان داوە تەنها لەپێناو ئەوەی بە شێوەیەکی کوێرانە لاسایی پیاوان بکەینەوە، بینیمان منداڵەکانمان بوونەتە غەریبە و ئینجا گرنگی ئەو ئیمتیازەمان بۆ دەرکەوت کە دەرستبەرداری ببووین.

لە ئێستادا ئافرەتانی ڕۆژئاوا دەیانەوێت لە ماڵەوە بمێننەوە و منداڵەکانیان پەروەردە بکەن، بە پێی بەشی کشتوکاڵی نەتەوە یەکگرتووەکان تەنها ٣١٪ی دایکان کە منداڵیان هەیە و ١٨٪ی دایکان کە دوو منداڵ، یاخود زیاتریان هەیە فول تایم کار دەکەن.

بە پێی توێژینەوەیەک کە لە لایەن (گۆڤاری پارێنتین)ـەوە لە ساڵی ٢٠٠٠ ئەنجام دراوە دەریخستووە کە ٩٣٪ـی ئەو ئافرەتانە دەیانەوێت لە ماڵەوە بن لە لای منداڵەکانیان، بەڵام بەهۆی خراپی باری داراییەوە ناچارن کار بکەن. ئەم بەرپرسیارێتیانە خراونەتە سەر ئافرەتان بەهۆی یەکسانی ڕەگەزی ڕۆژئاوای مۆدێرنەوە، بەڵام لە ڕێی جیاوازی ڕەگەزییەوە لە ئایینی ئیسلامدا لەسەر ئافرەتان لابراوە.

نزیکەی سەدەیەک لە ئەزموونی خایاند لە ڕۆژئاوادا تاکو ئافرەتان هەست بەو ئیمتیازە گەورەیە بکەن کە بەخشراوە بە ئافرەتانی مسوڵمان لە ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە. بە دەستبەرداربوونم لەو ئیمتیازەی هەمە وەکو ئافرەت، تەنها خۆم کەم دەکەمەوە بە هەوڵدان بۆ شتێک کە نیم. لەڕاستیدا نامەوێت وەک پیاوان وابم. وەک ئافرەتێک ناگەمە ئازادی ڕاستەقینە تاکو ئەو کاتەی واز لە لاساییکردنەوەی پیاوان نەهێنم، بەهای جوانیمان لەو جیاوازییەدایە کە لە لایەن پەروەردگارەوە پێمان بەخشراوە.

ئەگەر بژاردەیەکمان هەبێت لەنێوان دادپەروەری و هەست و سۆزدا، ئەوا هەست و سۆز هەڵدەبژێرم. ئەگەر بژاردەیەکمان هەبێت لەنێوان پێشەوایەتی دونیایی و بوونی بەهەشت لەژێر پێمدا، بەهەشت هەڵدەبژێرم.



## پیاوێتی و ڕووکاری ڕەقبوون

هەفتەی ڕابردوو خوشکەکەم پەیوەندی پێوە کردم. لە هاوینی ڕابردووەوە لە دەرەوەی وڵات دەیخوێند، بۆیە زۆر شادبووم کاتێک گوێبیستی بووم، دوای زانینی دەنگوباسی و تەندروستی، پرسیارم لە بارەی ماڵە تازەکەیەوە لێ کرد. هەستم بە دڵنیایی کرد کاتێک بیستم لە وڵاتێکی مسوڵماندا دەژی. بەداخەوە ئەو شتەی دواتر بۆی باس کردم بە تەواوی تووشی سەرسوڕمانی کردم.

باسی شوێنێکی کرد کە کچان بە سەختی دەتوانن ماڵەوەیان جێبهێڵن بەبێ ئەوەی بێزار بکرێن لە لایەن ئەو پیاوانەی کە بە لایاندا تێدەپەڕن. وتی فیکەلێکردن بۆتە شتێکی ئاسایی و باو، تەنانەت وەک یاسای لێ هاتووە. باسی کچێکی مسوڵمانی بۆ کردم کە دەیناسی، کچەکە لە تەکسییەکدا بوو، کاتێک گەیشتە شوێنی خۆی، کرێی تەکسییەکەی دایە دەستی شۆفێرەکە.

لە زۆربەی ئەم وڵاتانەدا هیچ پێوەرێکی جێگیر نییە بۆ بڕی کرێ، چونکە کرێ تاڕادەیەک ئارەزوومەندانەیە، بۆیە شۆفێرەکە تووڕە بوو. لە کۆتاییدا دەمەقاڵێکە گەیشتە ڕادەیەک کە شۆفێرەکە بە قۆڵ کچەکەی ڕاکێشا و چەند جارێک ڕایوەشاند. کچەکە تووڕە بوو و سوکایەتی بە

شۆفێرەکە کرد، دواتر شۆفێرەکە مستەکۆڵەیەکی لە ڕووخساری کچەکە دا.

لەم ساتەدا زۆر بێزار بووم. هەرچەندە ئەوەی دواتر خوشکەکەم وتی زۆر نائومێدی کردم، لەو نزیکانەدا دەستەیەک پیاوی لێ بوو کە ڕووداوەکەیان بینی و بەرەو لای ڕووداوەکەوە هاتن. بە شێوەیەکی سروشتی دەبوو یارمەتی کچەکەیان بدایە، بەڵام تەنها وەستابوون و تەماشایان دەکرد، لەم کاتەدا پرسیارێکم لا دروست بوو. لەناکاو هەموو پێناسەکانی پیاوێتیم لە خۆم پرسی کە دەمزانی و باوەڕم پێی هەبوو. سەرم سووڕما چۆن دەکرێت چەندین پیاو بوەستن و تەنها تەماشا بکەن، کاتێک ئافرەتێک بێڕێزی پێ دەکرێت، بەڵام هیچ هەڵوێستێکیان نەبێت.

پرسیارم لا دروست بوو کە پیاوبوون لە کۆمەڵگادا مانای چییە؟ ئایا پێناسەی پیاوێتی هێندە شێواوە کە کەم بکرێتەوە تەنها بۆ پاڵنەرێکی جنسی سنووردارنەکراو؟ ئایا وێنەی سوارچاکێک بە قەڵغانێکی درەوشاوەوە گۆڕدراوە بۆ کوڕانی سەر کۆڵان و جادەکان؟

بیرم دەکردەوە مانای پیاوی مسوڵمان چییە لەم سەردەمەدا؟ بیرم کردەوە ئەگەر پێناسە باوەکانی مسوڵمان ئەوانە بن کە پێویستە. لەم سەردەمەدا پیاو دەبێت ڕەق و بێهەست و زبر و نەبەزیو بێت. توندوتیژ و جەستە گەورەکراو لە دەربڕینی هەست و سۆز گاڵتەی پێ بکرێت. دواتر بڕیارم دا لە نموونەی پیاو ورد ببمەوە. بڕیارم دا لە پەیامبەر وردببمەوە.

یەکێک لە باوترین پێناسەکانی پیاوێتی بریتییە لە نەبوونی هەست و سۆز. بە گشتی وا بڵاوە کە گریان سیفەتی پیاو نییە و مانای لاوازییە. پەیامبەرمان بە شێوەیەکی جیاواز باسی کردووە. کاتێک کچەزا مردووەکەی پەیامبەر درایە دەستی پەیامبەر، چاوەکانی پڕ لە فرمێسک بوو. سەعدی هاوەڵی پێی فەرموو: ئەم گریانە چییە پەیامبەری خودا؟»

پەیامبەر فەرمووی: «**هَـذِهِ رَحْمَـةٌ جَعَلَهَـا اللهُ فِي قُلُوبِ عِبَـادِهِ، وَإِنَّمَا يَرْحَمُ اللهُ مِنْ عِبَادِهِ الرُّحَمَاءَ**».

«ئەمە ڕەحمەتێکە پەروەردگار دەیخاتە دڵی بەندەکانییەوە، پەروەردگار بەزەیی هەیە بەرامبەر بەندە بەبەزەییەکانی»، (**متفق عليه**).

لەم سەردەمەدا پیاوان دەبێت هەستی خەمبارییان بشارنەوە، لە سەرەتای تەمەنیانەوە فێر دەکرێن کە نابێت هیچ هەستێک دەرببڕن. لە سەردەمی پەیامبەردا چەند پیاوێک هەبوون کە هەمان بۆچوونی ئێستایان هەبوو. کاتێک پیاوێکی لادێی لای پەیامبەر بوو، پەیامبەر ماچی نێوچەوانی کچەزاکەی کرد. لەو کاتەدا پیاوە لادێیەکە بە سەرسامییەوە وتی: دە منداڵم هەیە، تاکو ئێستا هیچیانم ماچ نەکردووە». پەیامبەر تەماشایەکی کرد و فەرمووی: «**انـه من لا يَرحم لا يُرحم**»، «ئەو کەسەی ڕەحم و بەزەیی نەبێت، پەروەردگاریش ڕەحم و بەزەیی پێدا نایاتەوە»، (بوخاری).

لەڕاستیدا هەر لە بارەی دەرخستنی هەست و سۆزەوە، پەیامبەر زۆر بە جوانی و ڕوونی فەرموویەتی: **إِذَا أَحَبَّ الرَّجُلُ أَخَاهُ فَلْيُخْبِرْهُ أَنَّهُ يُحِبُّهُ**.

«کاتێک کەسێک برایەکی دینی خۆش دەوێت، پێویستە پێی بڵێت کە خۆشت دەوێت»، (رواه ابوداود).

پەیامبەرمان هەست و سۆزی زۆری بۆ هاوسەرە بەڕێزەکانی دەردەخست. عائیشە گێڕایەوە: «**كُنْتُ أَشْرَبُ فِي الإِنَاءِ وَأَنَا حَائِضٌ فَيَأْخُذُهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَيَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ فَيَشْرَبُ، وَكُنْتُ آخُذُ العَرْقَ فَأَنْتَهِشُ مِنْهُ فَيَأْخُذُهُ مِنِّي، ثُمَّ يَضَعُ فَاهُ عَلَى مَوْضِعِ فِيَّ فَيَنْتَهِشُ مِنْهُ**».

«پەیامبەر چێژی لە خواردنەکانی وەردەگرت هەرکاتێک لە تەنیشتیەوە دابنیشتایە. لە هەمان پەرداخدا ئاویان دەخواردەوە و پەیامبەر تەماشای دەکرد بزانێت عائیشە دەمی خستۆتە کوێی پەرداخەکەوە تاکو لەو

شوێنەوە لێی بخواتەوە. لەو ئێسقانەی دەخوارد کە عائیشە لێی خواردبوو، دەمی دەخستە شوێن دەمی عائیشەوە»، (رواه عبدالرزاق فی المصنف).

پەیامبەر هاوکاری هاوسەرەکانی دەکرد لە کاروبارەکانی نێو ماڵدا، بە پێچەوانەی ئەو بۆچوونە باوەی هەبوو لە بارەی پیاوێتییەوە. عائیشە گێڕایەوە: (كَانَ بَشَرًا مِنَ الْبَشَرِ يَفْلي ثَوْبَهُ وَيَحْلُبُ شَاتَهُ وَيَخْدُمُ نَفْسَهُ).

«پەیامبەر جلەکانی خۆی دەدورییەوە و بزنەکانی دەدۆشی و لە کاروبارەکانی تری ناوماڵدا هاوکاریی دەکرد»، (رَوَاهُ التِّرْمِذِيُّ).

یەکێک لە ئەفسانە باوەکان لەبارەی پیاوانەوە بریتییە لەوەی کە توند و ڕەق بێت. نەرمونیانی بە سیفەتی ئافرەتانە دادەنرێت، پەیامبەرمان فەرموویەتی: إِنَّ اللهَ رَفِيقٌ يُحِبُّ الرِّفْقَ، وَيُعْطِي عَلَى الرِّفْقِ مَا لَا يُعْطِي عَلَى الْعُنْفِ، وَمَا لَا يُعْطِي عَلَى مَا سِوَاهُ.

«پەروەردگار نەرمونیانە و نەرمونیانیشی خۆش دەوێت. ئەوەی لە پاداشتی نەرمونیانیدا دەیبەخشێت، نە لە پاداشتی توندوتیژی و نە لە پاداشتی هیچ شتێکی تردا نایبەخشێت»، (رواه مسلم). لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: «مَنْ يُحْرَمِ الرِّفْقَ يُحْرَمِ الْخَيْرَ».

«هەر کەسێک نەرمونیان نەبێت، خێر و چاکەی نابێت»، (رَوَاهُ مُسْلِمٌ). لەم سەردەمەدا زۆرێک لەو نەرمونیانییە لە پێناسەی پیاوێتی مۆدێرنەدا سڕدراوەتەوە. زۆر تۆقێنەرە کاتێک پیاوبێزارکردن و دەستدرێژیکردنە سەر ئافرەتان لەسەر شەقامەکاندا بە سیفەتی پیاوانە لە قەڵەم بدات، بەڵام گومان لە پیاوەتیبوونی دەکرێت کاتێک دەوەستێت و تەماشای کچێک دەکات کە لێی دەدرێت. ڕەنگە بپرسیت ئایا وێنەی پیاوێتی بە لای ئێمەوە هاوشێوەی چەتەیەکی ناو هۆلیودە، یاخود ئەوەی کە پەیامبەری نازدارمان وێنای کردووە؟

# ئوممەت

ئەم شوێنە تاریکە وێستگەی کۆتایی نییە. بیرت بێت تاریکی شەو پێش بەرەبەیان دێت. ژیانت کۆتایی نایات تاکو دڵت لە لێدان بەردەوام بێت، دڵت هێشتا نەمردووە، نابێت لێرەدا بمریت. هەندێک جار بنی زەریا وێستگەیەکی گەشتەکەیە، کاتێک لە نزمترین ئاستدا دەبیت، دوو بژاردەت لە بەردەمدا دەبێت، دەتوانیت لە بنی زەریاکەدا بمێنیتەوە تاکو نقووم دەبیت، یاخود دەتوانیت مرواری کۆ بکەیتەوە و دووبارە سەر بکەویتەوە، بەهۆی مەلەوانییەکەوە بەهێزتر بیت، بەهۆی گەوهەرەکانەوە دەوڵەمەندتر بیت.



## پاشگرەکە لابەرن

چ جۆرە مسوڵمانێکیت؟ پرسیارەکە نامۆ و سەیر دیارە، بەڵام سەیر نییە بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێت ئیسلام بەش بەش بکەن و بە سەریدا سەربکەون. وەڵامی ئەم پرسیارە بووەتە شتێکی زۆر گرنگ، لەوەیش ناخۆشتر و بێزراوتر ئەو لق و پۆپانەن کە خۆمانی پێ جیا دەکەینەوە.

هەرگیز لەگەڵ خوشک و برا خوێنییەکانماندا ناکۆک نین، بەڵام کاتێک ئەندامێکی خێزانەکە هەڵەیەک دەکات تەنانەت هەڵەیەکی گەورە، یاخود تێڕوانینێکی جیاواز لە ئێمەی هەبێت کەمێکمان بڕیار دەدەین لەو خێزانە دابڕێین و ناومان بگۆڕین، بەڵام لە ئێستادا ئەو شتە بەسەر خێزانە مسوڵمانەکەماندا پەیڕەو ناکرێت.

لەم سەردەمەدا ئێمە چیدی مسوڵمان نین. ئێمە مسوڵمانی پێشکەوتووخواز، ئیسلامی، کۆنەپەرست، سەلەفی، ڕەسەن، کۆچەرین. هەر یەک لەم گرووپانە زۆر لەوانی تر دابڕاوە، بە ڕادەیەک بیرمان چۆتەوە کە هەمان ئایین پەیڕەو دەکەین.

جیاوازی ڕاستەقینە لەناو ئومەتەکەماندا بوونی هەیە. هەڵەیەکی زۆر زەق و بەرچاو هەیە، لەناو ئیسلامدا جیاوازی نەک ئەوەی قبوڵ

کراوە، بگرە وەکو میهر و بەزەیی پەروەردگار تەماشا دەکرێت، تووشی شکست دەبین کاتێک خۆمان جیا کردەوە و دوورەپەرێز بووین لەو کەسەی ناکۆک بێت لەگەڵماندا. کاتێک ئەم جیاکارییەمان قبووڵ کرد و بەردەوامیمان پێ دا، ئەنجامەکەی مەترسیدار دەبێت. لە ئەنجامدا کەمپی خۆمان دروست دەکەین، تەنها لە کۆبوونەوە و کۆنفرانسەکانی خۆماندا ئامادە دەبین. دواتر تەنها قسە بۆ ئەو کەسانە دەکەین کە هاوڕامانن. گفتوگۆی نێوان ئوممەتەکە کۆتایی پێ دێت و نامێنێت.

جیاوازییەکانمان زەقتر دەبن، تێڕوانینەکانمان توندڕەوانەتر دەبێت. وای لێ دێت گرنگی نادەین بەوەی چی بەسەر گرووپە مسوڵمانەکانی تری سەرانسەر جیهاندا دێت، چونکە پەلەکان لە جەستەکە دادەبڕین هەر وەک چۆن پەیامبەرمان فێری کردووین کە مسوڵمانان وەک جەستەیەک وان. ئەوانەی تر کە هێشتا برامانن دەبنە غەریبە، تەنانەت ڕقمان لێیان دەبێتەوە بە ڕادەیەک حەز ناکەین چیدی بە هەمان ناوی خێزانی بانگ بکرێین، تەنانەت دەچینە پاڵ دوژمنانمان دژی ئەوان. لەناکاو ئەو جیاوازییەی کە ڕەحمەت بوو، دەبێتە نەفرەت و چەکێک بۆ تێکشکانی ئیسلام. دوژمنانمان بانگی یەکتر دەکەن تاکو هێرش بکەنە سەرمان هەروەک چۆن خواردنێک دەخۆن و بانگهێشتی ئەوانی دی دەکەن تاکو لە خواردنەکەیان بخۆن. (ابو داود).

لە بەرواری [١٨ـی ئازاری ٢٠٠٤]دا، ڕاند ئەمریکیی دەوڵەمەند ڕاپۆرتێکی بڵاو کردەوە بۆ بەشارستانیکردنی ئیسلام لە ڕێی سڕینەوەی و دروستکردنەوەی بە شێوازی عەلمانیەتی ڕۆژئاوا. لە ڕاپۆرتەکەدا کە بە ناوی [ئیسلامی دیموکراتی شارستانی: هاوبەشەکان و سەرچاوەکان و ستراتیژەکان] (چێریل بێرنارد)

نوسیویەتی «مۆدێرنە نەک کۆنەپەرستی ئەو شتەیە کە لە ڕۆژئاوادا گرنگە. ئەمەیش پێویستی بە جیاکردنەوە و گۆڕین و فەرامۆشکردنی هەندێک بەشی شەریعەتی ڕەسەنی ئایینەکەیە.»

بێرنارد ستراتیژییەکی سادە و ئاسانی پێشنیار کردووە بۆ جیاکردنەوە و گۆڕین و فەرامۆشکردنی بەشەکانی ئیسلام: جیاکردنەوە و دابڕین و دەستبەسەرداگرتن. پێشنیار دەکات گرووپە ئیسلامییەکان بە شەڕ بدرێن دوای ئەوەی گرووپ گرووپ جیا کرانەوە. لەنێو ستراتیژەکانی تردا، پێشنیار دەکات هانی ناکۆکی بدرێت لەنێوان مسوڵمانە مۆدێرنەکان و کۆنەپەرستەکان و نەهێڵرێت یەک بگرنەوە و ئاشتەوابن پێکەوە.

بێرنارد دەیەوێت ئیسلامێکی شارستانی دیموکرات دابهێنێت کە کەمتر دواکەوتوو و بێکێشەترە لە ڕێگای سەرکەوتن لەم جیاکردنەوەیەدا و پاڵپشتیکردنی مسوڵمانی مۆدێرنە و پێشکەوتووخوازە. بە تایبەت هیواخوازە ئیسلامێک دروست بکات کە ڕادەستی ئەجێندای مۆدێرنە بێت.

ئەگەر یەکەمین هەنگاو بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئیسلام بریتی بێت لە بەکارهێنانی ئەو گرووپانەی کە هەن، با بڵێین دەستتان خۆش و مەمنوون نەبووین، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُواْ وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾﴾ (سورەتی ال عمران).

«هەمووتان هەوڵ بدەن بە توندی دەست بگرن بە ئایینی خوداوە و پەرتوبڵاو مەبن، یادی خودا و ناز و نیعمەتەکانی بکەنەوە، کاتی خۆی دوژمنی یەکتر بوون، ئەوەبوو دڵەکانتانی بەهۆی نیعمەتی

ئیسـلامەوە پەیوەسـت کـرد بـە یەکـەوە و هەمووتـان بوونـە بـرای یەکتر، ئێوە لەسـەر لێواری چاڵێکی ئاگر وەسـتابوون و خەریـک بـوو بکەونـە نـاوی، بـەڵام خـودا لـەو ئاگـرە ڕزگاری کـردن، بـەو شـێوەیە خـودا ئایەتەکانـی خۆیتـان بـۆ ڕوون دەکاتـەوە، بـۆ ئـەوەی هیدایـەت وەرگـرن(١٠٣)».

هەرچەنـدە سوپاسـگوزارین بـۆ بەشارسـتانیکردنی خۆمـان و ئایینەکەمـان کـە دەبێت بـە خەڵکانی دیکـەی بگەیەنین، بەڵام چاکسـازی تەنهـا لـە شـتانێکی خراپبـوو و بەسـەرچوودا دەکرێـت. تەنهـا شـتانی تێکشـکاو و ڕووخـاو چـاک دەکرێنـەوە.

لـە چاکـەی خۆتانـە کـە بـە مۆدێرنـە، یاخـود میانڕەو بانگمـان بکـەن، بـەڵام بەبـێ ئـەم قسـە دووبارانەیـش دەتوانیـن وابیـن. ئیسـلام خـۆی میانـڕەوە، بۆیـە تاکـو زیاتـر پابەنـدی بنەماکانـی ئیسـلام بیـن، زیاتـر میانـڕەو دەبیـن. ئیسـلام خـۆی بـە سروشـت جیهانییـە و بـۆ هەمـوو سـەردەمەکان گونجـاوە. ئەگـەر بەڕاسـتی ئیسـلامی بیـن، هەمیشـە مۆدێرنـە دەبیـن.

ئێمـە مسـوڵمانی پێشـکەوتووخواز، پارێـزگار، سـەلەفی، مۆدێـرن، ئیسـلامی، کۆنەپەرسـت و وەهابـی نیـن. ئێمـە کۆچـەری و ڕەسـەن نیـن. سـوپاس بەبێ ئـەو پاشـگرەی ئێوەیش دەتوانین وابکەین. ئێمـە تەنهـا مسـوڵمانین.



## مسوڵمان بە، بەڵام مسوڵمانێکی میانڕەو

سیناتۆر (جۆن کێری) لە یەکەمین گفتوگۆی سەرۆکایەتیدا لە ساڵی (٢٠٠٤)دا دەستی بە وتەکەی کرد. لە وەڵامی یەکەمین پرسیاریدا ڕوونی کردەوە پێویستە ئەمریکا مسوڵمانە ئیسلامییە توندڕەوەکان دابڕێ.

«پلانێکی باشترم هەیە تاکو بتوانین شەڕی دژەتیرۆر بکەین لە ڕێگای دوورخستنەوەی مسوڵمانە ئیسلامییە توندڕەوەکانەوە پێش ئەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دابڕن.»

سەرەتا وتەکەی دووبارە و تەنانەت نارۆشنبیرانە دیار بوو. موسوڵمان شوێنکەوتەی ئایینی ئیسلامە، بۆیە ئیسلامییە. بەکارهێنانی دەستەواژەی «مسوڵمانی ئیسلامی»، هاوشێوەی بەکارهێنانی دەستەواژەی «ئەمریکیی ئەمریکا»یە. ئایا وتەکەی جۆن کێری دووبارە بوو؟ یاخود وتەکەی زیاتر لەوە هەڵدەگرێت کە خۆیشی دەیزانێت؟ ئایا هەموو مسوڵمانێک ئیسلامییە؟ ڕاستییەکەی نەخێرە. هیچ نەبێت مسوڵمانە باشەکان وانین. گریمانەکە ئەوەیە ئیسلام بە گرفت دەزانن. ئەگەر ئیسلام وەک بیروباوەڕێک لە ناوەڕۆکدا توندڕەو بێت، ئەوا کەم ئیسلامیبوون شتێکی باشترە.

بۆیـە مسـوڵمانی میانـڕەو کـە ناوێکـی گونجاوتـرە تاڕادەیـەک مسـوڵمانە و بۆیـە کەمێـک خراپـە. وەک ئەوەیـە بڵێیـن کەسـێک تاڕادەیـەک ڕەشپێسـتە بۆ ئەوەی زۆر توندوتیژ نەبێت. بە پێچەوانەوە مسـوڵمانێک کـە زۆر ئیسـلامییە، ئـەوا زۆر بـە تونـدڕەو دادەنرێـت، پێویسـتە مسـوڵمانی ئیسـلامی تونـدڕەو لـە ناوچەکـە نەهێڵدرێـت.

لـە ڕاسـتیدا (مۆنـا مایفیڵـد)، زۆر بـاش لـەم یاسـایانە تێگەیشـتبوو کاتێک بەرگری لـە مێردەکـەی دەکرد کە بە هەڵـە تۆمەتبـار کرابـوو بـە تەقینەوەکـەی ئیسـپانیا. (مۆنـا مایفیڵـد) لـە بـارەی مسـوڵمانبوونی مێردەکەیـەوە بـە ڕۆژنامەکانـی ڕاگەیانـد «پەرتووکـی پیرۆزمـان لـە ماڵـەوە هەیـە، مێردەکەم کەسـێکی تونـدڕەو نییـە، تەنها بڕوای وابـوو کـە ئایینـی ئیسـلام شـتێکی جیـاواز و زۆر تایبەتـە.»

(مۆنـا مایفیڵـد)، هەوڵـی دا بـاس لـە پابەندبوونـی مێردەکـەی بـکات بـە ئایینـی ئیسـلامەوە لەپێنـاو سـەلماندنی بێتاوانـی مێردەکـەی. تەنانەت هەسـتی کـرد کـە پێویسـتە مسـوڵمانبوونی مێردەکـەی بـە تاکـە تـاوان ئەژمـار بکرێـت.

بەڕێوەبـەری مزگەوتەکـە (شـەهریار ئەحمـەد)، هەمـان ڕێگـەی گرتـە بـەر بـۆ بەرگریکـردن لـە (مایفیڵد). (شـەهریار ئەحمـەد) بـە ڕۆژنامەنووسـانی ڕاگەیانـد: «مایفیڵـد بەشـداری نوێـژی هەینیانـی دەکـرد، قاچەکانـی تـەڕ دەکـرد، لەسـەر کومبـار دادەنیشـت و گوێـی لـە وتـارەکان دەگـرت. ئـەو پێنـج نوێژە فەرزەکـەی لـە مزگەوتـدا نەدەکرد هاوشـێوەی مسـوڵمانێکی پابەنـد.»

ئەمـە ئاماژەیەکـە بـۆ ئـەوەی کـە تاوانبـاری، یاخـود بێتاوانـی (براندۆن مایفیڵـد)، تاڕادەیـەک پەیوەسـتە بـەوەی تـا چەنـد نوێـژی لـە مزگەوتـدا ئەنجـام دەدا. (شـەهریار ئەحمـەد)، ئامـاژەی بەوەیـش دا: «ئـەو کەمتـر پابەنـدی ئاییـن بـوو.»

ئەم نموونانەی «کەمتر پەیوەست بوو بە ئایینەوە»، ئەو شتەیە کە مسـوڵمانان پێویسـتە بەو شـێوەیە دەرکـەون و لـە سـەرانسـەری میدیاکانـدا بوونـی هەیـە. (ئیرشـاد مانجـی) ڕاگەیانـدکار و نووسـەری پەرتووکـی «کێشـەی ئیسـلام»، یەکێکە لـە بەناوبانگترین ئەو نموونانە. (ئیرشـاد مانجـی)، لـە هەمـوو ڕاگەیاندنەکانـەوە دەردەکەوێت. تەنانـەت خەڵاتـی «oprah's chutzph»ـی بەدەسـت هێنـا بـۆ «جەربەزەیـی و ئازایەتییەکـەی».

هەرچەنـدە (ئیرشـاد مانجـی) خـۆی بـە «مسـوڵمانێکی ناپابەنـد» نـاو دەبات، میدیاکان بـە نموونـەی مسـوڵمانێکی پابەنـد نـاوی دەبـەن. (دانێل پایپس)، ئەندامێکـی دەسـتەی (پەیمانگای نەتـەوە یەککرتـووەکان بـۆ ئاشـتی)، بـە مسـوڵمانێکی ئـازا و میانـڕەو و مۆدێرنـە نـاوی دەبات. لـە هەمـووی سـەیرتر بۆچوونەکانـی (ئیرشـاد مانجی)یـە، هیـچ پەیوەندییەکـی بـە ئیسـلامەوە نییـە، هـەروەک چـۆن بۆچوونەکانـی (دانێـل پایپـس) هیـچ پەیوەندییەکـی بـە ئاشـتییەوە نییـە. بابەتێکـی (واشـنتۆن پۆسـت) بـاس لـە بۆچوونـی (ئیرشـاد مانجـی) دەکات لـە بـارەی نوێژەوە کە بنچینـەی بیروبـاوەڕی ئیسـلامە: "وتـی لەبـری ئەو نوێـژەی مسـوڵمانانی تـر ئەنجامـی دەدەن، ئـەم بـە شـێوازی تایبەتـی خـۆی نوێـژ دەکات.

دوای شـۆردنی قـاچ و دەسـت و ڕووخسـاری، لەسـەر بەڕەیەکـی سـوور دادەنیشـێت و ڕوو دەکاتـە قیبلـە. لـە کۆتاییـدا ئیرشـاد وازی لەمەیش هێنـا، چونکـە نایەوێت بکەوێتـە نـاو ملکەچبوونێکـی گەمژانـە و نەریتییـەوە".

(ئیرشـاد مانجـی)، ئـازادە لـە بۆچوونـی لـە بـارەی نوێـژەوە کـە لـە لایـەن ١,٥ ملیـار کەسـەوە لـە سەرانسـەری جیهانـدا ئەنجـام دەدرێت. هەروەهـا ئـازادە لـە وازهێنـان و پەیڕەونەکردنـی ئـەم ئەرکانـە، بـەڵام

(ئیرشـاد مانجی) تەنها ئافرەتێکی ئاسـایی نییە کە بڕیاری داوە واز لە نوێژ بهێنێت. بڕیـاری تایبەتـی خـۆی بـۆ وازهێنـان لـە پایـە گرنگەکانی بیروباوەڕەکـەی کاتێـک بیروباوەڕەکـەی ئیسـلام بێـت، بریتییـە لـە شـەڕی ڕزگاربـوون. شـەڕێک دژی زۆرداری. ئـەو ئـازا و جەربـەزە، نموونەیەکـە بـۆ چاولێکـردن لـە لایـەن ئەوانـەی کـە مسـوڵمانی زۆر ئیسـلامی نیـن.

کردنـە نموونـەی ئەمـە هاوشـێوەی ئەوەیـە، داوا لـە کەسـێک بکەیـت کـە زۆر ڕەشـپێسـت، یاخـود زۆر جوولەکـە نەبێـت، ئەگـەر ئەمانـە لەناوەڕۆکـدا خـراپ، یاخـود توندوتیـژ بـن و هەرکەسـێک کـە هـەوڵ بدات تاڕادەیـەک ڕەشـپێسـت بێـت، یاخـود جوولەکە بێـت، جەنگاوەرێکی ڕزگارییـە. بـۆ نموونـە (ئیرشـاد مانجـی) بـە (واشـنتۆن پۆسـت)ـی ڕاگەیانـد «توندوتیـژی بـەردەوام دەبێـت، بۆچـی ئـەم توندوتیژییـە لەپێنـاوی ڕزگاریـدا نەبێـت؟»

بەڵـێ! ڕزگاری شـتێکی باشـە. (ئیرشـاد مانجـی)، بـە شـێوەیەکی باشـتر وتـی. دەکرا (جۆن کێری) بە شـێوەیەکی ژیرانەتر وای بوتایە، بـەڵام مامۆسـتایەکی کارگێـڕی کار لـە کۆلێـژی (شـاهانەی ڤالـی لـە کالیفۆڕنیـا) بـە شـێوەیەکی ڕێکتـر وتـی: «تاکە ڕێگایـەک بـۆ کۆتاییهێنان بـە تیـرۆری ئیسـلامی، بریتییـە لـە لەناوبـردن و سـڕینەوەی ئایینـی ئیسـلام.»

بـەڵام گرنـگ نییـە چـۆن و بـە چـی شـێوەیەک دەیڵێیـت، شـتێک گومانـی تێدا نییـە: لـە ئێسـتادا کاتێـک دێتـە سـەر باسـی ئایینـی ئیسـلام، تاکـو ئایینـی ئیسـلام و پەیڕەوکارانـی کەمتربێـت بـە لای نەیارانـەوە شـتێکی باشـترە.

## تراژیدیایەکی وەسفنەکراو و حاڵی ئومەتەکەمان

شوێنێک لە هزری مرۆڤدا هەیە کە خۆمانی تێدا دەشارینەوە کاتێک هیچ شوێن و پەناگەیەک شک نابەین خۆمانی تێدا حەشار بدەین. لەوانەیە بەشێک لە دڵیش هەبێت کە هەمیشە تراژیدیاکان بە زیندوویی تێیدا بمێننەوە. هەرچەندە ئەو تراژیدیایە بە لای خەڵکی سوریا و فەلەستینەوە بریتی نییە لە دیمەنێکی هزری، یاخود دڵ، بەڵکوو تاکە ڕاستییەکە کە دەیژانن. کاتێک تەماشای ئەو قەسابخانەیە دەکەم کە لەم خاکانەدا ڕوودەدەن، دڵنیا نیم لە خۆم بۆ کوێ هەنگاو بنێم و بۆ کوێ بڕۆم. بە دوای شوێنێکدا دەگەڕێم لە زیهنمدا کە بتوانم لە ڕێیەوە لەم بێمانایییە تێبگەم و وا خەیاڵ بکەم ئەو کارەساتانە ڕوونادەن. لەنێوان خەمباری و تووڕەیی و نائومێدیدا ئەمسەر و ئەوسەرمە،

بەڵام لە کۆتاییدا دەگەڕێمەوە سەر یەک پرسیار: بۆچی؟ بۆچی ئەم کارەسات و نەهامەتییانەمان بەسەردا دێت؟ بۆچی لە سەرانسەری جیهاندا تووشی نەهامەتی دێین؟ بۆچی ناتوانین بیوەستێنین و ڕێگری لێ بکەین؟ بۆچی لە ڕووی سیاسییەوە لاوازین، تەنانەت لەو وڵاتەی کە خۆمان تێیدا هاووڵاتین؟ بۆچی پڕ بە دەم هاوار دەکەین و نامە دەنووسین و بانگی نوێنەران دەکەین لە کۆشکی سپی تەنها بۆ ئەوەی

ڕێگەیان بدەین لەم وتە بێمانا و سواوانە بەردەوام بن، «ئیسرائیل مافی خۆیەتی بەرگری لە خۆی بکات.»

بۆچی گەیشتووین بەم قۆناغە؟

پێویستە بوەستین و ورد ببینەوە لەوەی ئومەتەکەمان گەیشتووە بە کوێ و چی بەسەردا هاتووە. سەردەمانێک مسوڵمانان ڕێزلێگیراو بوون لە جیهاندا، لە لایەن دۆستەکانمانەوە خۆش دەویستراین و دوژمنەکانمان لێمان دەترسان. لەم سەردەمەدا بووینەتە گرووپێکی بەئامانجکراو و خراپ و نەویستراو لە سەرانسەری جیهاندا. لە دەنگدانێکی نوێدا زیاتر لە نیوەی ئەمریکییەکان وتیان: «ئیسلام هیچ پەسەند نییە»، بە لایانەوە، ٤٣٪ وتیان «کەمێک پەسەندە».

نەک ئەوەی کە نەویستراوین، بەڵکوو لە زۆر شوێندا دەچەوسێنرێینەوە و دەکوژرێین و موڵکەکانمان لێ داگیر دەکرێت. نەک ئەوەی تەنها لە ڕووی جەستەییەوە دەچەوسێنرێینەوە، بەڵکوو لە مافەکانمان دابڕاوین و تۆمەتبار دەکرێین و بێتاوان دەخرێینە زیندانەوە. لە ڕاستیدا ڕقی بەربڵاو دژی مسوڵمانان زۆر زیادی کردووە کە دروشمی دژی مسوڵمانان بۆتە شتێکی قبوڵکراو و پەسەندکراو. تەنانەت وای لێ هاتووە لە لایەن هەندێک کەسەوە بەکار دێت تاکو لە ڕووی سیاسییەوە سەرکەوتن بەدەست بهێنێت.

ئەم بارودۆخەی ئیستای ئومەتەکەمان ١٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر زۆر بە ڕوونی باس کراوە. پەیامبەرمان بە هاوەڵانی فەرموو خەڵکی بانگی یەکتر دەکەن تاکو هێرش بکەنە سەرتان، هەروەک چۆن خواردن دەخۆن و کەسانی تر بانگهێشت دەکەن بۆ ئەوەی لە خواردنەکە بخۆن.»

کەسێک وتی: ئایا بەهۆی کەمی ژمارەی مسوڵمانانەوەیە؟

وەڵامی دایەوە: نەخێر، بەڵکوو ژمارەیان زۆر زۆرە، وەک کەفی

سەر دەریا وان، بەڵام پەروەردگار ترسی ئێوە لە دڵی دوژمنان ناهێڵێت و (وهـن) دەکەوێتـە دڵەکانتـان.

کەسێک پرسی: ئەی پەیامبەر (وەهن) چییە؟

وەڵامی دایـەوە: خۆشەویستی ئـەم دونیایـە و ڕقلێبوون لـە مـردن».
(فەرمـوودەی صـحیح لـە لایـەن ابـو داود و احمد)ـەوە.

هـەروەک پەیامبـەر فەرمـووی و پێشبینی کـرد، خەڵکی بانگی یەکتـر دەکـەن بـۆ ئـەوەی هێرش بکەنـە سـەرمان هـەروەک چـۆن کەسێک بانگهێشتی کەسـانی تـر دەکات بـۆ بەشداربوون لـە خواردنەکـەی. لـەم فەرموودەیـەدا پەیامبەرمـان بـەو شـێوەیە وەسـفی کردووین کـە وەک کەفی سـەر دەریامـان لێدێت. ئەگـەر تەماشـای شـەپۆلی دەریـا بکەیـت، چینێکی تەنکی کـەف دەبینی، تەنانـەت هێزی تـەواوی نییـە لـە ڕێگەکـەی بـەردەوام بێت، بەڵکوو بـەو شـوێنەدا دەڕوات کـە ئاوەکە هەڵی دەگرێت.

ئەمـە بارودۆخـی ئێمەیـە وەک چـۆن پەیامبەرمـان وەسـفی کردبـوو. پێویستە بگەڕێینـەوە سـەر پرسـیاری بۆچـی؟ پەیامبەرمـان وەڵامێکـی ڕوونـی ئـەم پرسـیارە دەداتـەوە. ڕوونـی دەکاتەوە کە دڵـەکان پڕ دەبن لە وەهن. کاتێک پرسـیار کرا لە بارەی مانای وشـەکەوە، فەرمووی بریتییە لـە خۆشەویسـتی دونیـا و ڕقلێبـوون لـە مـردن. پەیامبـەر لێرەدا باسـی ئـەو کەسـانە دەکات کـە تـەواو وابەسـتەی ئـەم دونیایـە بـوون، تووشـی لەخۆباییبوون، ماددەپەرستی، کورتبینی و بێئاگایی لە چاوپێکەوتنەکانیان لەگەڵ پـەروەدگار بـوون. باسـی کەسـانێک دەکات کـە هێنـدە وابەسـتەی ئـەم جیهانـە بـوون، کـە تەنانـەت ئەخلاقیـان لەدەسـت داوە.

لەنـاو سـنووری ئـەم ئەخلاقیەتەدایـە کە بارودۆخـی خەڵکی ناگۆڕێت جـا لـە باشـەوە بـۆ خـراپ بێـت، یاخـود لە خراپـەوە بۆ باش. پـەروەردگار پێمـان دەفەرموێت: ﴿لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٞ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ

ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ۝١١﴾ (سورەتی الرعد).

«بۆ خودا هەیە فریشتەی بێشومار کە بە نۆرە بەدوای یەکدا دێن تا چاودێری ئادەمیزاد بکەن لە بەروپشت و لە هەموو لایەکەوە بیپارێزن بە فەرمانی خودا، بێگومان بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێک ناگۆڕێت هەتاکو ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن، کاتێکیش خودا بیەوێت بەڵایەک بەسەر هەر میللەتێکدا بهێنێت، ئەوە هیچ هێزێک ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ کەسێک ناتوانێت جگە لە خودا فریایان بکەوێت و ڕزگاریان بکات.»

بەهۆی ئەخلاق و کەسایەتییانەوەیە کە بارودۆخی خەڵکی دەگۆڕێت لەوپەڕی دەسەڵاتەوە بۆ کەفی سەر دەریا. ئەویش تەنها بە گۆڕینی دڵەکان و کەسایەتییەکان دەکرێت کە ئەوەی وەک کەفی سەر دەریا وایە دووبارە بەهێز بێتەوە و بگەڕێتەوە دۆخی پێشووی. لەگەڵ ئەوەیشدا ئێمەی مسوڵمان نابێت هەرگیز نائومێد ببین. نصر (سەرکەوتن)ـی دینی پەروەردگار بەڵێن دراوە.

باسەکە ئەوەیە، ئایا من و تۆ دەبینە بەشێک لەم سەرکەوتنە، یاخود نا؟ پەروەردگار لە قورئاندا ئەمەمان بیر دەهێنێتەوە و دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ۝١٣٩﴾ (سورەتی ال عمران). «ئەی ئیمانداران کۆڵ مەدەن و سارد مەبنەوە و خەفەت مەخۆن، چونکە هەر ئێوە سەربەرز و سەرفراز و سەرکەوتووترن، ئەگەر ئیمانداری چاک و ڕاست و دروست بن(١٣٩)». تەنها بە ئیمانێکی ڕاستگۆیانە و هەوڵدانمان پەروەردگار بارودۆخمان دەگۆڕێت. بۆیە لەپێناو ئەو خوێنڕژانەی ناو سوریا و فەلەستین و تەواوی جیهان، پێویستە ئومەتی ئیسلام بەئاگا بێتەوە و بگەڕێتەوە لای پەروەردگار.

## دەرچەی دەریای سووری ئێستا : تێڕامان لە میسر

کاتێک پەیامبەر موسا لە بەردەم دەریای سووردا ڕاوەستابوو، زۆردارێک و سوپاکەی لە دوایەوە بوون. قەومەکەی پەیامبەر موسا بوونە دوو بەش و دوو بەرە. تەماشای پێشەوەیان دەکرد و تەنها شکستیان دەبینی ﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ٦١﴾ (سورەتی الشعراء).

«کاتێک دوو دەستەکە چاویان بەیەک کەوت، قەومەکەی موسا وتیان: بە دڵنیاییەوە دەستبەسەر دەکرێین و تێدا دەچین»، بەڵام پەیامبەر موسا تێڕوانینێکی جیاوازی هەبوو. چاوەکانی دەیتوانی لەنێو خەیاڵاتەکانی دژواری و ناڕەحەتییەکانی ئەم ژیانەدا ببینێت. بە چاوی دڵ کە وابەستەبوو بە پەروەردگاری باڵادەستەوە تەماشای بارودۆخەکەی کرد و تەنها پەروەردگاری لە بەرچاو بوو: ﴿قَالَ كَلَّآۖ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ٦٢﴾ (سورەتی الشعراء).

«پەیامبەر موسا فەرمووی نەخێر! پەروەردگار لەگەڵمدایە و هەر خۆی ڕێنوێنیم دەکات». پەروەردگار قسەکەی پەیامبەر موسای هێنایە دی. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ

﴿كَٱلطَّوۡدِ ٱلۡعَظِيمِ ٦٣ وَأَزۡلَفۡنَا ثَمَّ ٱلۡأٓخَرِينَ ٦٤ وَأَنجَيۡنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجۡمَعِينَ ٦٥ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ٦٦﴾ (سورەتی الشعراء).

«ئەوسا وەحیمان نارد بۆ موسا: کە بە عەصاکەت بماڵە بە دەریاکەدا، دەریا شەق بوو و هەر ڕێگە و شەقامێکی دەورە درا بە شەپۆلی گەورەی ئاو، کە وەک کێوی گەورە و مەزن وابوو(٦٣)، پاشان ئەوانی ترمان لەو شوێنە نزیک کردەوە(٦٤)، مووسا و هەموو ئەوانەیش کە لەگەڵیدا بوون ڕزگاربوون(٦٥)، پاشان ئەوانی ترمان نوقمی دەریا کرد(٦٦)».

ئەمڕۆ لە میسر لە بەردەم دەریای سووردا ڕاوەستاوین. ئەمڕۆ زۆردارێک و سوپاکەی لە دوامانەوەن، ئەمڕۆ کەسانێک هەن تەنها شکست دەبینن، لەگەڵ ئەوەیشدا هەندێک هەن دەتوانن لەناو بەربەستەکەوە تەماشای ڕێگاکە بکەن و هیوای گەیشتن بە پشتەوەی بەربەستەکە دەخوازن. ئەمڕۆ لە میسردا هەندێک کەس هەن دەڵێن: [ان معی ربی سیهدین].

«پەروەردگارم لەگەڵدایە و بە دڵنیاییەوە هەر خۆی ڕێنوێنیم دەکات»، سەرەڕای بوونی زۆردارێک لە پشتیانەوە. ڕەنگە کەسانێک بپرسن بۆچی لە کاتێکی بەهاداری وەک ئێستادا باسی چیرۆکێکی کۆن دەکەین؟ بۆچی شتانێک کە هەزاران ساڵ ڕوویانداوە پەیوەست دەکەین بە ئێستاوە؟ هۆکارەکە ئەوەیە کە ئەوە تەنها چیرۆکێکی کۆن نییە، بەڵکوو نیشانە و بەڵگەیەکی هەمیشەیی و پەندێکە بۆ هەموو کاتێک گونجاوە. پەروەردگار لە ئایەتی دواتردا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ٦٧﴾ (سورەتی الشعراء).

«بەڕاستی لەمەدا بەڵگە و نیشانەیەک هەیە، بەڵام زۆربەیان باوەڕی پێ ناکەن»، نیشانە و بەڵگەی ڕاستەقینەی پەروەرین و

نهێنییەکانی ئەم جیهانەیە. نیشـانەیەکە لەبارەی ئەوەی زۆردار هەرگیز سـەرناکەوێت، بەربەسـتەکان تەنهـا خەیاڵاتـن و دروسـت کـراون بـۆ تاقیکردنـەوە و ڕاهێنـان و خاوێنکردنەوەمـان. نیشـانە و بەڵگەیەکە کە سـەرکەوتن لێـوەی سـەرچاوە دەگرێـت. بـاس لـە تـام و چێـژی ئـەو سەرکەوتنە دەکات لـە کاتێکدا هەسـت دەکەیـن کەوتووینەتـە نـاو تەڵـە و شکسـت و بێهێزییـەوە. هەندێـک ڕەنگـە بپرسـن بۆچـی سـەرکەوتن بـە ئاسـانی بەدەسـت نایـات ئەگـەر بەڕاسـتی پەروەردگارمـان لەپشـت بێـت؟ ڕەنگـە هەندێـک بپرسـن بۆچـی پـەروەردگار سـەرکەوتنمان پـێ نابەخشـێت بەبـێ قوربانیـدان و جەنـگان؟ پـەروەردگاری مـەزن لـەم ئایەتـەدا وەڵامـی ئـەم پرسـیارانەمان بـۆ دەداتـەوە و دەفەرموێـت:
﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ ٩٤﴾ (سـورەتی الاعـراف).

«لـە هیـچ شـار و وڵاتێکدا هیـچ پەیامبەرێکمـان نەناردووە کە خەڵکەکـەی بـە درۆیـان زانـی بێـت و بـە گوێیـان نەکردبێـت، مەگـەر خەڵکی ئـەو شـوێنەمان بـە تەنگانـە و نەخۆشـی گیـرۆدە کـردووە، بـۆ ئـەوەی دابچەڵکێـن و تێبفکـرن و دەسـت بکـەن بـە نـزا و پاڕانـەوە و لاڵانـەوە.»

لێـرەدا پـەروەردگار دەفەرموێـت: کـە مەبەسـت لـە بـەڵا و نەهامەتییـەکان بـۆ گەیشـتنە بـە حاڵەتـی [تـدروا]. [تـدروا] بریتییـە لـە ملکەچبـوون لـە بـەردەم پەروەرێنـدا –بـەڵام تەنهـا ملکەچبـوون نییـە. بـۆ تێگەیشـتن لـە مانـای [تدروا]، خـۆت بێنـە پێـش چـاو لـە ناوەڕاسـتی زەریایەکـدا، وایدابنـێ بـە تەنهـا لـە بەلەمێکدایـت و زریانێکـی بەهێـز و گـەورە دێـت و شـەپۆلەکان لـە چواردەورتـدا هاوشـێوەی شـاخیان لێدێـت. دەگەڕێیتەوە بـۆ لای پەروەردگار و داوای یارمەتـی لـێ دەکەیـت. لـە چ حاڵەتێکـی پێویسـتی و خـەم و پەیوەسـتبوون و ملکەچبوونـدا دەبیـت؟ ئـەوە [تدروا]یـە.

پەروەردگاری باڵادەست دەفەرموێت: کە پەروەرێن خۆی بەلا و نەهامەتییەکان دێنێت تاکو ئەو خەڵاتەمان پێ ببەخشێت. پەروەردگار هەرگیز نایەوێت باری سەرشانمان قورس بکات، بەڵکوو ئەو حاڵەتانە دەخولقێنێت تاکو بگەینە حاڵەتی نزیکی لە خۆی کە بەبێ ئەو نەهامەتیانە گەیشتن پێی سەخت دەبێت.

ملکەچبوون و نزیکبوون و وابەستەبوون بە پەروەردگارەوە، ئەو شتەیە کە بە خەڵکی میسر بەخشراوە لە ئێستادا. پەروەردگار هەر خۆی باڵادەستە. پەروەردگار ئاماژە بە مەبەستێکی تری نارەحەتییەکان دەدات و دەفەرموێت: ﴿وَقَطَّعْنَاهُمْ فِي الْأَرْضِ أُمَمًا ۖ مِنْهُمُ الصَّالِحُونَ وَمِنْهُمْ دُونَ ذَٰلِكَ ۖ وَبَلَوْنَاهُم بِالْحَسَنَاتِ وَالسَّيِّئَاتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿١٦٨﴾﴾ (سورەتی الاعراف).

«سەرئەنجامیش نەوەی ئیسرائیلمان کرد بە چەند بەشەوە لەسەر زەویدا، هەیانە چاک و لەخواترسە، هەشیانە وانییە و لە پلەیەکی نزمدایە و بە چەندەها خۆشی و ناخۆشی تاقیمان کردنەوە بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێی ڕاست دروست(١٦٨)».

خودا لە سورەتی (ال عمران)دا دەفەرموێت: ﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ ۚ وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ ۗ وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ ﴿١٤٢﴾﴾ «ئەگەر زام و سەختی و ناخۆشییەک تووشی ئێوە هاتووە، ئەو خەڵکەیش تووشی هەمان زام و سەختی و ناخۆشی هاتن، ئێمە ئەو ڕۆژگارانە دەستاودەست پێ دەکەین لەناو خەڵکیدا تاکو ئەوانەی باوەڕیان هێناوە پەروەردگار دەریانبخات و هەندێکتان بکات بە شایەت و بە پلەی شەهیدی بگەن، بێگومان پەروەردگار

ستەمکارانی خۆش ناوێت(١٤٠)، بێگومـان پـەروەردگار تاقیتـان دەکاتـەوە تاکو ئەوانـەی ئیماندارن پاک و بێگەردیـان بـکات، کافرانیش نابـووت و ڕیسـوا بـکات(١٤١)، یاخـود وا گومانتـان بـرد هـەروا بـە ئاسانی دەچنـە بەهەشـتەوە؟ کـە هێشتا پـەروەردگار دەرینەخسـتووە کامتـان هـەوڵ و کۆشـش و جیهـادی کـردووە و کامتـان خۆڕاگـر و ئارامگـر بـووە(١٤٢)].

لێـرەدا پـەروەردگار مەبەسـتی سـەرەکی ناڕەحەتییـەکان بـە [تمحیـص] نـاو دەبـات. [تمحیـص] هەمـان وشـەیە بـەکار دێـت بـۆ باسـکردنی گەرمکـردن و پاڵاوتنـی زێـڕ. زێـڕ کانزایەکی بەنرخە تەنانەت بەبـێ گەرمکردنـی، بـەڵام پـڕە لـە خڵتـە. بـە پاڵاوتنـی (گەرمکردنـی) زێڕەکـە، خڵتـەکان لـە زێڕەکـە جیـا دەکرێنـەوە. پەروەردگاریـش لـە ڕێـی ناڕەحەتییەکانـەوە بـاوەڕداران هاوشـێوەی زێـڕ پوخـت و پاڵاوتـە دەکات.

ئایـا میسـرییەکانیش پوخـت و پاڵاوتـە دەکرێـن؟ ڕۆژانـی پێـش ڕاپەڕینەکـە، جیهـان گەنجانـی میسـریان بـە هـۆکاری لەناوچـوون دەزانـی. بڕوامـان وابـوو ئاڕاسـتە و مەبەسـتەکانیان لـە یـاد کـردووە. بڕوامـان وایـە کـە بڕیاریـان داوە ژیانیـان لەسـەر شـەقامەکاندا بەسـەر بـەرن و فیکـە لـە کچـان بکـەن، یاخـود لە قاوەخانەیەکدا نێرگەلە بکێشـن. لـە ڕێـی ئـەم ناڕەحەتییـەوە گەنجانـی میسـر لـە مـردن گەڕێنرانـەوە.

لـە ئێسـتادا ئـەم گەنجانـە لەسـەر شـەقامەکان دژی زۆرداری دەوەسـتن و لەسـەر ئەژنـۆ نـزا دەکـەن و دەسـتەکانیان ڕووەو ئاسـمان بـەرز کردۆتـەوە و هانـا بـۆ پـەروەردگار دەبـەن. هەمـان ئـەو کەسـانەی کـە چەندیـن ڕۆژی پێشـوو بـە دەگمـەن نوێژەکانیـان ئەنجـام دەدا، ئێسـتا لـە بـەردەم تانکـی سـەربازیدا کڕنـووش بـۆ پەروەرێنیـان دەبـەن.

چەنـد ڕۆژێـک پێـش ڕاپەڕینەکـە، تەنگژەکان لەنێـوان میسـرییە

مسولْمان و مەسیحییەکاندا زۆر پەرەی سەندبوو. ئێستا مسولْمانان و مەسیحییەکانی میسر شان بە شانی یەکتر دەوەستن بۆ بەرگریکردن لە یەکتری و وڵاتەکەیان. هەمان ئەو کەسانە پێشتر متمانەیان بە یەکتر نەبوو، ئێستا وەک برا و خوشک و یەک جەستە بەرگری لە شەقامەکانیان و ماڵەکانیان و چواردەوریان دەکەن. لە ڕێی ئەم نارەحەتییەوە کەسێک کە پێشتر تەنها لەپێناو مۆبایل و نێرگەلە و جگەرە دەژیا، ئێستا ئامادەیە ژیانی خۆی بکاتە قوربانی لەپێناو خەڵکەکەیدا. پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت:

﴿قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُ ۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾﴾ (سورەتی یونس).

«ئەی پەیامبەر پێیان بڵێ کێ هەیە لە ئاسمانەوە و لە زەوییەوە، ڕزق و ڕۆزیتان بۆ فەراهەم بهێنێت و پێتان ببەخشێت، کێ هەیە خاوەنی دەزگاکانی بیستن و بینین بێت؟ ئەی کێ زیندوو لە مردوو دەردەهێنێت و مردوو لە زیندوو دەردەهێنێت؟ کێیە کە هەموو کار و فەرمانەکان جێبەجێ دەکات و گۆڕانکارییان بەسەردا دەهێنێت؟ خەڵکی دەڵێن: الله پەروەردگاری مەزن، هەموو ئەو کارانە و زیاتریش زۆر بە ئاسانی ئەنجام دەدات لە ڕێگای یاسا و بەرنامەکەیەوە کە خۆی دایڕشتووە، کەواتە پێیان بڵێ: ئایا ناترسن لە سەرئەنجامی یاخیبوونتان، ئایا ناترسن لە خەشم و قینی پەروەردگار؟»

تەنها پەروەردگار دەتوانێت مردوو زیندوو بکاتەوە. پەروەرێن ئێمەی لە مردن گەڕاندەوە. بزانە هەموو ساتێکی ئەم ڕووداوانە مەبەستێکی قووڵ و بەپێزی لە پشتە. بۆ دەیان ساڵ خەڵکی میسر

لە ژیانێکی پڕ ترسدا ژیاون. کاتێک ڕێگە دەدەیت ترس کۆنترۆڵت بکات، دەبیتە بەندە.

پەروەردگار خەڵکی میسری لەم بەندایەتییە ڕزگار کرد لە ڕێی تووشکردنیان و زاڵکردنیان بەسەر گەورەترین ترسدا. پەروەردگار خەڵکی میسری ڕزگار کرد، تەماشای نێوچاوانی ستەمکارەکەیان کرد، بە ستەمکارەکە و تەواوی جیهانیان ڕاگەیاند کە ئەوان چیدی لە ترسدا ناژین. کەواتە (حسنی موبارەک)، بمینێتەوە، یاخود بڕوات، بژی، یاخود بمرێت، هیچ گرنگ نییە. خەڵکی میسر ئازادییان بەدەست هێناوە.

حسنی موبارەک هیچ گرنگییەکی نییە. هیچ نییە جگە لە ئامرازێک -ئامرازێک کە پەروەرێن بە هۆیەوە پلانەکەی بۆ خەڵکی میسر و تەواوی ئوممەتەکە جێبەجێ دەکات. ئامرازێکە بۆ پوختکردن و پاڵاوتن و ئازادکردنی خەڵکی میصر و ئومەتەکە. گرنگ نییە کە ئیستا لە میسر بین، یاخود نا. میسر تەنها باڵێکی لەشمانە. پاکبوونەوەی میصر، واتا پاکبوونەوەی تەواوی ئوممەتەکە، واتا پاکبوونەوەی من و تۆ. دەرفەتە لە خۆمان بپرسین کە بە چییەوە پەیوەستین؟ لە چی دەترسین؟ هەوڵ بۆ چی دەدەین؟ بۆ کوێ دەڕۆین؟

کاتێک جەستەیەک لە خەوێکی قووڵ، یاخود لە حاڵەتی بێهۆشیدایە، تەنها لە ڕەحمی بێسنووری پەروەردگار خۆیەتی کە بەئاگای دەهێنێتەوە. ئەم ژیانەمان پەرست، خاوەندارێتی شتەکانمان لە ئازادی و سەربەستی ڕۆح بە لاوە گرنگتر بوو، لە هیچ نەترساین جگە لە پەروەرێنمان، بۆیە پەروەرێن ئازادی و سەربەستی پێ بەخشین.

ئایا چەند لە خەڵکی ئەزموونی ئەم ڕووداوانە دەکەن لە

ژیانیاندا؟ چەند کەس ئەزموونی کرانەوەی دەریایەک و خراپیەکانی ستەمکاریک دەکەن؟ ئایا پێویست نییە لە خۆمان بپرسین بۆچی دەبێت تووشی ئەم ڕووداوانە ببین؟ پێویست نییە لە خۆمان بپرسین کە دەبێت فێری چی ببین و چی بگۆڕین؟ چونکە ئەگەر بۆ ساتێک وا بیر بکەینەوە هەموو ڕووداوەکە پەیوەستە بە خەڵکی میسرەوە، لێرەدا شتێکی گرنگمان لە یاد کردووە. خەوتبووین و پەروەردگار بەئاگای هێناینەوە. مردبووین و پەروەردگار ژیانی پێ بەخشینەوە.

باوەڕمان وابوو کە دوژمنەکانمان لە دەرەوەی خۆمانن، دەسەڵاتیان بە سەرماندا هەیە. ئەمانە هەمووی خەیاڵاتە. دوژمنەکە لەناو خۆماندایە، هەموو دوژمنە دەرەکییەکان تەنها ڕەنگدانەوەی نەخۆشییەکانی خۆمانن. ئەگەر بمانەوێت بەسەر ئەو دوژمنانەدا زاڵ بین، پێویستە سەرەتا بەسەر دوژمنی ناوەوەی خۆماندا زاڵ بین، بۆیە قورئان دەفەرموێت: ﴿لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٌ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ۝١١﴾ (سورەتی الرعد).

«بۆ خودا هەیە فریشتەی بێشومار کە بە نۆرە بەدوای یەکدا دێن تا چاودێری ئادەمیزاد بکەن لە بەروپشت و لە هەموو لایەکەوە بیپارێزن بە فەرمانی خودا، بێگومان بارودۆخی هیچ قەوم و گەلێک ناگۆڕێت هەتاکو ئەوان ئەوەی بە خۆیان دەکرێت نەیگۆڕن و نەیکەن، کاتێکیش خودا بیەوێت بەڵایەک بەسەر هەر میللەتێکدا بهێنێت، ئەوە هیچ هێزێک ناتوانێت بەری بگرێت، هیچ کەسێک ناتوانێت جگە لە خودا فریایان بکەوێت و ڕزگاریان بکات.»

پێویستە سەرەتا زاڵ بین بەسەر ڕەزیلی، خۆویستی، هاوەڵ

بـۆ پەروەردگارپەیداکـردن، تـرس، خۆشەویسـتی زۆر، هیـوا و پشتبەسـتن بە هـەر شـتێکی تر جگە لـە پەروەردگار. پێویسـتە بەسـەر خۆشەویسـتی دونیـادا زاڵ ببین کە سـەرچاوەی هەموو نەخۆشـییەکان و چەوسـاندنەوەکانمانە. پێش ئـەوەی فیرعەونـی نـاو ژیانمـان لەنـاو بەرین، پێویستە فیرعەونی نـاوەوەی خۆمـان لەنـاو بەرین. جەنگەکەی میسـر جەنگێکـە بـۆ بەدەسـتهێنانی ئـازادی و سەربەسـتی، بـەڵام ئازادبـوون لـە چـی کەسـێک و شـتێک؟ کێ چەوسـێندراوەتەوە؟ ئایـا مـن و تـۆ ئازادیـن؟ چەوسـاندنەوەی ڕاسـتەقینە چییـە؟

(ابـن تیمیـە) وەڵامـی ئـەم پرسـیارەی داوەتـەوە و فەرموویەتـی: «ئـەوەی لـە زیندانی ڕاسـتەقینەیە کەسـێکە دڵی بە ڕووی پەروەرێندا داخسـتووە و کەسـی زیندانی ئەو کەسـەیە ئارەزووەکانی کردوویانەتە بەنـدە»، (ابـن القییـم -الوابیـل).

کاتێـک لـە ناخـەوە ئـازاد بوویـت، هەرگیـز ڕێگـە بـە کـەس نادەیـت ئازادییەکـەت لـێ بسـێنێتەوە و زەوتـی بکـات. کاتێـک ناخـت ئـازاد بـوو، پـەروەردگاری زاڵمـەکان و خراپـەکارەکان دەبینیـت، چونکـە تەنهـا کەسـانێک دەبنـە بەنـدە کـە هۆگـری شـتە دونیاییەکانن. تەنهـا دەتوانیـت ئـەو کەسـانە بترسـێنیت کـە لـە لەدەسـتدانی شـتەکان دەترسـن. تەنهـا دەسـەڵاتت بەسـەر ئـەو کەسـانەدا هەیـە کـە پێویسـتیان بـە شـتێکە و شـتێکیان دەوێـت کـە توانـای لێسـەندنەوەیانت هەیـە، بـەڵام تەنهـا یـەک زات هەیـە هیـچ کـەس ناتوانێـت لێتـی بسـێنێتەوە ئەویـش پەروەردگاری باڵادەسـتە.

کاتێـک بـۆ ئازادکردنـی میسـر دەجەنگیـن، بـە مانایەکـی گشـتی و پێوەرێکـی ڕاسـتەقینەتر جەنگێکـە بـۆ ئازادکردنـی خۆمـان. بریتییـە لـە جەنگـی ئازادکردنـی خۆمـان لـە زوڵمـی نەفـس و هـەوا و ئـارەزووی خۆمـان. جەنگـی ئازادکردنـی خۆمـان لـە وابەسـتبوون و پشتبەسـتنە

هەڵەکانمـان بـە هەمـوو ئـەو شـتانەی کۆنترۆڵمـان دەکـەن و ئـەو شتانەی کە دەیانپەرستین جگە لـە پەروەرێنمـان. جەنگی ئازادکردنی خۆمانـە لـە بەندایەتـی خۆمـان.

جا گرنگ نییە بەندەی دۆلاری ئەمریکی، هـەوا و ئـارەزوو، پلـە و پۆسـت، سـەروەت و سـامان، یاخـود تـرس بیـن، پاکبوونـەوەی میسـر پاکبوونـەوەی هەموومانـە.

بۆیـە سـەرکەوتنی ڕاسـتەقینە بەهـۆی دوو هـۆکارەوە بەدەسـت دێـت کـە لـە قورئانـی پیـرۆزدا ئامـاژەی پـێ دراوە: ئارامگرتـن و تـرس لـە پـەروەردگار ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ۝﴾ (سـورەتی ال عمـران).

«ئـەی ئەوانـەی باوەڕتـان هێنـاوە، خۆگریـن و خۆڕاگریـی و ئارامگری بەسـەر خۆتاندا بهێنن، نەبـەزن لـە خۆگری مانەوەتـان لـە سـەنگەردا، هـەوڵ بدەن هەمیشـە لـە سـەنگەری خەبـات و کۆششـدا بن، لـە خـوا بترسـن و پارێـزگار بـن بـۆ ئـەوەی سـەرفرازیی هەمیشـەیی بەدەسـت بهێنـن(٢٠٠)».

ئەگـەر ئێسـتا تەماشـای میسـر بکەیـن وەک ئـەوەی نمایشـێک بێـت کە لـە دەرەوەی خۆماندا ڕوودەدات بەبێ پاککردنـەوە و وردبوونـەوە لێی و گۆڕینـی خۆمـان و ژیانمـان، ئـەوا مەبەسـتی سـەرەکیمان لـە یـاد کـردووە. لـە کۆتاییدا بزانـە:

هەموو ڕۆژێک دەریایەک لە پێش چاوەکانماندا ناکرێتەوە.

# هۆنراوە

پـەروەردگار دەزانێـت و ئـاگادارە کاتێـک گەڵایـەک لـە درەختەکـەی بەردەبێتـەوە، جگـە لـەوە پـەروەردگار دەزانێـت کاتێـک فرمێسـک لـە چاوانـت دەڕژێـت، هـەر فرمێسـکێک کـە لـە چـاوت دەڕژێـت، بزانـە کـە دڵـە شـێواوەکەت ئاسـوودە و ئـارام دەکاتـەوە.



# پەیامێک بۆ تۆ

سەختە ڕوونکردنەوەی ئازادی و سەربەستی، چونکە زۆر قووڵ و ڕاستەقینەیە. بە تەماشاکردن لەنێو ئاڵۆزییەکان، سندووقە بەتاڵ و وێنە خاڵییەکانەوە، تۆ دەبینم ئەی دونیا. پەردە لەسەر پەردە دەدەیت بەسەر چاوەکانمدا. هەوڵ دەدەیت بەدەستم بهێنیت، فریوم بدەیت، بمکەیتە بەندەی درۆکانت.

ڕاستییەکە ئەوەیە کە نەتتوانی تەنانەت دڵۆپە ئاوێکیشم پێ بدەیت کاتێک لە بەردەم دەرگاتدا وەستابووم و دەپاڕامەوە. بەرامبەرت کەوتمە سەر ئەژنۆ و نائومێد بووم لەوەی کە پڕم بکەیت.

ئەوەی ئێستا دەیبینم تەنها قەترەیەک، ڕووناکییە کە تەنها خەنجەرلێدانی بەردەوامی نائومێدی دەتوانێت هەڵیبکۆڵێت.

لێرەدا وەستاوم، دەورە دراوم بە پیاوەکانت و سوپای درۆکانت کە نێردراون بۆ ئەوەی کۆت و زنجیرم بکەن، بەڵام چیدی نابمە زیندانی تۆ. چیدی نابمە ئەو کیژۆڵەیەی کە بە شەوان بەئاگا بوو و بیری لە تۆ دەکردەوە، چیدی ئەو منداڵە دڵشکاوە نیم کە فرمێسکەکانی بۆ تۆ دەڕشت، خۆشەویستییە یەکلایەنەکەم چیدی ناتوانێت تێکم بشکێنێت.

ناتوانیت لەناوم بەریت. ملکەچی بەڵێنە درەوشاوە و درۆینەکانت نابم. چیدی ئەو بەردەستە دڵسۆزەت نیم کە لە بەردەم تاجە درۆینەکەتدا چۆک دابدەم. فرمێسکەکانم چیدی بۆ بەدەستهێنانی تۆ نارێژم، دڵم چیدی پەناگەی تۆ نییە، چیدی ناتوانیت لێرە بژیت.

ڕێگەیەکی دوورم بڕیوە تاکو بگەم بە ئێرە، هەندێک جار بیابانی لێبوو، تاکە شتێک کە پێویستم بووبێت دڵۆپە ئاوێک بووە کە نەتتوانی پێمی بدەیت، هەندێک جار زریان هەڵیکردووە، تاکە شتێک پێویستم بووبێت کەمێک ڕووناکی بووە تاکو ڕێگەکەم نیشان بدات. چەندین جار داوام لێ کردیت، بەڵام نەتتوانی پێمی بدەیت، چونکە تەنها خۆبەزلزانی و شانازیکردن و فریودانت لا دەست دەکەوێت. بۆیە بەردەوام خۆم لە بیابانی وشکی بێ ئاو و تاریکی بێ ڕووناکیدا دەدۆزییەوە، بەڵام چیدی بەندەی تۆ نیم، چونکە پیاوێک هات و لە بەندایەتی تۆ ڕزگاری کردم، بەرەو بەندایەتی پەروەردگار ئاراستەی کردم.



## خەم دەخۆم

سەرم هەڵبڕی
جارێکی تر
تاکو تەنها ببینم
خۆرەکە ئاوا بووە،
درەختەکان نوستوون،
و هەمووان بەرەو ماڵەوە ڕۆیشتوون
خەم دەخۆم.
ئەو ئاسمانەی کە ساماڵ بوو
ئێستا بە تەم داپۆشراوە
چیدی ڕێگاکەم نابینم
بۆچی هەوڵ بدەم لە کاتێکدا هەموو شتەکان زۆر ناڕوون و لێڵن؟
خەم دەخۆم.
ئیمڕۆکە خەم دەخۆم
بۆ شتە لەدەستچووەکان.
کەسە لەیادکراوەکانم

هێشتا لەسەر ئەژنۆن
لە بەردەم خودایەکی بەفرین لە بەهاردا
خەم دەخۆم.
ئەو نزایەیان لە یاد کردووە
و لە یادیان کردووە هانا بۆ کێ بەرن.
گەوهەرە بەنرخەکە شوێنی گیراوەتەوە بە
نەریتە دونیاییەکان،
و هێما بەتاڵەکان.
دڵەکانیان ماندوون
بێزارن، ڕزیون
خەم دەخۆم.
کەسانێکین
تێکشکاوین، بەڵام داگیر نەکراوین.
تاڕادەیەک
هەست دەکەم خوێنەکەم دەگەڕێتەوە.
دەوەستمە سەر پێ.
هەوڵ دەدەم.
و لە پشتی خەمەکەمەوە،
دەبینم
کەسانێک هەن ناتوانیت بیانکەیتە بەندە.
دڵسۆزییەک کە ناتوانیت بیکڕیت.
ڕەنگە خاکێک داگیر بکرێت،
بەڵام ڕۆح داگیر ناکرێت.
لە پشتی فرمێسکەکانمەوە
تێدەگەم

ئیمڕۆکە خەڵکەکەم دەگرین.
بەڵام سبەی... مەرگ دەمرێت،
کاتێک فرمێسکەکانیان خاکێک دێننە بوون
کە تێیدا [وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾]
«هیچ ترس و خەمێکیان نابێت»، (سورەتی البقرە).



## تەنها بیرکردنەوەکانم

ئیمڕۆکە خەمبارییەکی سەیر هەیە. لەو جۆرە نییە کە بە تەنهایی جێت دەهێڵێت. خەمبارییەکی ئارامە، ئەو جۆرەیە کە لە ئاستێکی دیاریکراوی تێگەیشتن و پەسەندکردنەوە سەرچاوە دەگرێت. ئیمڕۆکە تەماشای ئەم وێنەیەم کرد و هەموو کاتێک تەماشام کردووە، فرمێسکەکانم چاوەکانمیان پڕ کردبوو. خۆرئاوابوون دەبوو لە کەناری دەریا، زۆر سەرنجڕاکێش بوو، ئەم ئایەتەم کەوتەوە یاد: ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَـٰذَا بَاطِلًا سُبْحَـٰنَكَ ...﴿١٩١﴾﴾ (سورة آل عمران).

«پەروەردگارا، ئەم هەموو شتەت بێ هۆ دروست نەکردووە، پاکی و بێگەردی بۆ تۆ...»

هەموو ئەم خەمباری، ڕووداو، خەندە، ئاشتی، ئازار، خۆشەویستی، لەدەستدان و قوربانیدانە بێ هۆ نییە، بەبێ مەبەست نییە. هەڵەیەک نییە، یاخود چەند ڕووداوێکی بێ مەبەست و لەخۆڕا نییە.

تەماشای وێنەکەم کرد و لەناکاو هەستم بە غەریبییەکی قووڵ کرد کە لە یادم نەماوە.

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ

عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾ (سورەتی الأعراف).

«یادی ئەو کاتەیش بکەرەوە کە پەروەردگارت پشتاوپشتی نەوەی ئادەمی کۆکردەوە و کردنی بە شایەت بەسەر خۆیانەوە و پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ هەموو وتیان: نابێت تۆ پەروەردگاری ئێمە نەبیت، بەڵێ، شایەتیمان داوە کە تۆ پەروەردگارمانیت، ئەمەیش بۆ ئەوەی نەوەکو لە ڕۆژی قیامەتدا بڵێن: بەڕاستی ئێمە لەمە بێئاگا بووین.»

زۆر بە قووڵی بیری کەسێکم دەکرد. بیرکردنی پەروەردگاری باڵا و لەگەڵئەودابوون. بیرکردنی ئەو کاتەی کە بوونی هەبووە، یاخود دەبێت، کاتێک کە زۆر دڵنیام لێی وەک ئەوەی پێشتر هەبوووبێت. بۆیە کاتێک پەروەرێنمان لە قورئانی پیرۆزدا لەبارەی ڕۆژی دواییەوە دەدوێت، زەمەنی ڕابردوو بەکار دێنێت.

کاتێک ئاشقی کارێکی هونەری دەبین، شەیدا و ئاوێزانی نیگارکێشەکە دەبین، من خوێندکاری پێشانگە وێنەییەکانی خۆرئاوابوونی زەریای ئارام، دەرکەوتنی مانگی چواردەی کەنارەکە، پەڵە هەورەکانی سەرووی فڕۆکەخانە، دارستانەکانی پایزی ڕاڵی و کرێوەی بەفرەکانم. من شەیدا و ئاوێزانی نیگارکێشەکەم.

﴿وَتَذَرُونَ ٱلْأٓخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾﴾ (سورەتی القیامة). «لەو ڕۆژەدا ڕووخسارەکان دەدرەوشێنەوە و تەماشای پەروەرێنی خۆیان دەکەن.»



# تێڕامان لە خۆشەویستی

هەموو ئەم خۆشەویستییە، هەموو پارچەیەکی خۆشەویستیی لە جیهاندا. ئەو خۆشەویستییەی کە هۆنراوەی پێ دەنووسنەوە. خۆشەویستی ڕۆمانە سەرنجڕاکێشەکان، خۆشەویستی ناو گۆرانییەکان، ئەو خۆشەویستییەی هەوڵیان دا لە فیلمێکدا نمایشی بکەن، خۆشەویستی دایکێک بۆ منداڵەکەی و منداڵ بۆ باوکی، ئەو خۆشەویستییەی کە ڕزگارت دەکات، ئەو خۆشەویستییەی دەتکاتە بەندە، خۆشەویستییەک کە بەدەستی دەهێنیت، خۆشەویستییەک کە لە دەستی دەدەیت، خۆشەویستییەک کە بە دوایدا ڕادەکەیت، خۆشەویستییەک کە لەپێناویدا دەژیت. خۆشەویستییەک کە دەزانیت لەپێناویدا دەمریت. خۆشەویستییەک کە خوێن لە پیاوان دەچۆڕێنێت. خۆشەویستییەک کە شمشێرەکان لەپێناویدا کوشتاریان کردووە. خۆشەویستی نێو چیرۆکە خەیاڵییەکان و تراژیدیاکان، هەمووی تەنها ڕەنگدانەوەن.

زایەڵەی تاکە سەرچاوەیەکن، زایەڵەی تاکە خۆشەویستییەک کە دەیزانیت و دەیزانم، چونکە دەمانزانی پێش ئەوەی بتوانین و بزانین، خۆشویستراوین پێش ئەوەی بتوانین خۆشمان بوێت. پێمان

بەخشـرا پێـش ئـەوەی بتوانیـن ببەخشـین، یاخـود بزانیـن بەخشـین چییـە. خۆشەویسـتییەکە کـە دڵمـان بـە شـێوەیەک دروسـت کـراوە دەیزانێـت و پێـی ئاشـنایە، خۆشەویسـتییەکە کـە سـەرچاوەی هەمـوو خۆشەویستییەکانە، خۆشەویستییەکە کە لـە پێش هەمـوو شـتەکانەوە هەبـووە، لـەدوای هەمـوو شتەکانیشـەوە دەمێنێـت.

خۆشەویسـتییەکە کـە لـە پێـش هەمـوو زایەڵەکانـەوە هەبـووە، لـە دوای هەموویشـیانەوە دەمێنێـت.



## ئیمڕۆ نزام بۆ ئارامی کرد

ئیمڕۆ نزام بۆ ئارامی کرد
هەزاران جار بێئاگا بووم و بەئاگا هاتمەوە
دەزانم گوێت لە من بوو
دەزانم کە بە تەنها نەبووم لەو ژوورەدا
لە ترسی ترس و
تەنهاییدا دەلەرزیم.
دەستەوئەژنۆ هاوارم دەکرد
و ڕووخسارم ڕووەو زەوی.
ئەگەر بمتوانیایە نزمتر ببمەوە، سوێند بە پەروەرێنم دەمکرد
چونکە ئەوە ئەوپەڕی لاوازییە، ڕاستەقینەترین لاوازی
ئەو لاوازییەی کە هیچ نازانێت، بزانە هیچ گەلایەک، فرمێسکێک
و خەندەیەک
بێ پەروەرێن نابن.
ئیمڕۆ شتێک فێر بووم
جارێکی تر
ئەمە دونیایە. شوێنی حەوانەوە نییە. تەنها بریقەدار و درەوشاوەیە

شوێنێکە کە تێیدا تووشی سەرما و برسیەتی دەبیت
شوێنێکە کە تێیدا هەست بە نیگەرانی و ترس دەکەیت
شوێنێکە کە سارد دەبێت
هەندێک جار زۆر سارد دەبێت.
شوێنێکە کە دەبێت ئەو کەسانە جێبهێڵیت کە خۆشت دەوێن
کە تێیدا ناتوانیت پەیوەست بیت، چونکە تەنانەت ئەگەر
پەیوەستیش بیت،
نابێتە هۆی مانەوەیان، تەنها دەبێتە هۆی ئازار کاتێک کە
نامێنێتەوە.
شوێنێکە کە دڵخۆشی و خەمباری تاکە یاریزانن
چاوەڕێی نۆرەی دواترن لە یارییەکدا.....
ململانێ دەکەن بۆ شوێنی خۆیان لەسەر شانۆ
شوێنێکە کە هێزی ڕاکێشانی زەوی دەتکەوێنێت، لاوازی وا دەکات
خوێنت لێ بڕژێت
شوێنێکە کە خەمباری تێیدا بوونی هەیە، چونکە پێویستە
و فرمێسکەکان دەڕژێن، تاکو شوێنێکت بیر بهێننەوە کە تێیدا
ناڕژێن
شوێنێک کە تێیدا ناڕژێن
و ئەوە تاکە شت نییە؟ ئایا بەهەشت ئەو شوێنە نییە؟
ئەو شوێنەی پەروەردگار چەندین جار وەسفی کردووە بە دوو
شێوە؟
﴿وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾﴾ (سورة البقرة)
هیچ ترس و خەمبارییەکیان تووش نابێت
بەڵام هێشتا لێرەم، وانییە؟
برینی سەر گۆشتەکەم ئەوەم بیر دێنێتەوە

سووتاوی سەر قۆڵم برینێکی جێهێشتووە کە خۆشم دەوێت.
خۆشم دەوێت، چونکە بیرم دەهێنێتەوە چەندە لاوازم
چەندە مرۆڤم
دەسووتێم، خوێنم لێ دەڕژێت، دەشکێم و بریندار دەبم.
بەڵێ، ئێستاکە من لێرەم. لێرە دەکەوم، لێرە دەگریم.
لێرە هاوشێوەیە، کە ژوورەکەت پڕ کردووە و
بەهۆی پابەندیمەوە پلەت بەرز کردوومەتەوە و زانیارییەکی
دەقیقم
هەیە لە بارەی
لاوازیم و پێویستییەکی زۆرم بە تۆ.
پاشان خۆت گرنگیت پێ دا.
بە دڵنیاییەوە گرنگیت پێ دا
هاوشێوەی یونس و موسا و دایکی موسا، گرنگیت پێ دا.
تۆ ئارامی ئارامانی
بەهێزی بەهێزانی
فەنەری ڕاستی لەم زریانی درۆیانەدا
بۆیە ئیمڕۆ نزام بۆ ئارامی کرد.



# له ململانێی ژیاندا

ئیمڕۆ بیرم له تۆ دەکردەوە
بیرم له تۆ دەکردەوە و ئەو وتانەم بیر هاتەوە که پێتوتم
بە جوانترین شێوە
دڵه نائارامەکەمت ئارام کردەوە
و هەناسەمت ئاسانتر کرد
ئەو وتانەت پێ وتم و هێشتا له مێشک و دڵمدا هەڵمگرتوون
بەرزم دەکەنەوە و پڕم دەکەن و ماندوویم ناهێڵن
چونکه زیاتر له ئازار، ماندووم
وا هەست دەکەم لەم چیرۆکەدا بۆ هەزاران ساڵ ژیاوم
و ئێستا ئامادەی نوستنم
ئامادەم دەستبەرداری ببم
ئێستا ئامادەم چیرۆکەکه کۆتایی پێ بهێنم
ئامادەم هەست بە ئارامی
و دەنگت بکەم
پێم دەڵێن تەواو بووم، سەرکەوتوو بووم و لێرەم
بەڵام ئەم شوێنه دەزانم

پێشتر من لێرە بووم
ئێستا دەڕۆم دەنوم
دەڕۆم بنوم
تکایە مەپرسە
تکایە مەپرسە
تەنها بهێڵە بنوم
تەنها بهێڵە بنوم و وتەکانت لەسەر زارم بن

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدْحًا فَمُلَٰقِيهِ ۝٦﴾ (سورەتی الانشقاق)

«ئەی ئینسان بەڕاستی تۆ خۆت زۆر ماندوو دەکەیت، زۆر ڕەنج و زەحمەت دەکێشیت، سەرئەنجامیش دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ لای پەروەردگارت، تاکو پاداشتی ڕەنج و هەوڵەکەت وەربگریت(٦)»



## ئارامی

خۆر لە بەرەبەیاندا گەلێک سەرنجڕاکێشە. حاڵێک بەسەر درەختەکاندا دێنێت کە لە هیچ ساتێکی تری ڕۆژدا نایبینیت. بڕوام وایە هەموومان هەمان شتمان دەوێت: ئارامییەکی تەواو. ڕەنگە تەنها لە چرکەساتێکی ئەو ئارامییەدا چاوەکانت دابخەیت و هەست بە باشی بکەیت.

بۆ چرکەساتێک هەست بە نیگەرانی نەکەیت و خەمبار نەبیت و ئاوێزانی شتێک نەبیت کە نیتە و ناتوانیت هەتبێت. تەنها بۆ ئەوەی لەوێ بیت، ئارام و بێدەنگ لە ناخەوە، ڕەنگە ئەوە قەشەنگی و جوانی ئەم ساتەی ڕۆژ بێت: ئارامی

بە هیوای ئەوەی ئیمڕۆ ڕۆژێکی جیاواز بێت.



## بمره پێش مەرگت

پێم بڵێ کە دەتوانم خۆم ون بکەم
پێم بڵێ کە دەتوانم خۆم لە ئامادەبوونتدا ون بکەم
لە ساتی سەرنجڕاکێشی ملکەچبوونی ڕاستەقینەدا
پێم بڵێ کە دەتوانم بۆ هەمیشە بە تێکشکاوی بمێنمەوە
لە تۆدا
بۆ تۆ
لەگەڵ تۆ
پێم بڵێ کە دەتوانم بۆ هەمیشە لێرە بمێنمەوە
دوورم، بەڵام هێشتا لێرەم
ئایا پەیامبەرمان نەیفەرموو: «بمره پێش مەرگت»؟
لە سەرەتادا هەستم کرد تەنها بیرهێنانەوەیەک بێت
بۆ بیرهێنانەوەی چاوپێکەوتنمان لەگەڵ تۆ
بەڵام دواتر بیرم کردەوە چۆن بتوانم بمرم پێش مەرگم:
ڕۆحێکت هەبێت کە چیدی لەم ژیانەدا نییە –هەرچەندە
لاشەکە دەبێت بمێنێتەوە
دڵێک کە ئازادە لە کۆت و بەندی دونیا– تەنانەت

کاتێک قاچەکان دەبێت بە شەقامەکانیدا بڕۆن
نەفسێکت هەبێت کە لە ئارامییەکی تەواودا بێت و قایلە بە
پەروەرێنی -هەرچەندە بەرگە تێکشکاوەکە دەمێنێتەوە
ڕۆحێک کە پێشتر لەوێ بووە– تەنانەت پێش ئەوەی لەوێ بێت
ڕۆحێکی دابڕاو
نەفسێکی (مطمئنە)، بە ڕاستەقینەترین و ڕوونترین ماناکەی
وەک زانایەکی گەورە فەرموویەتی: «ئەوەی
نەچێتە بەهەشتی ئەم دونیایەوە، ناچێتە
بەهەشتی ئەو دونیا.»



# ڕزگارم بکە

هیچم نییە کە هیوا و ئومێدم پێی هەبێت، جگە لە بەخشندەییت ئەی پەروەرێن. لە دەرگات وەستاوم بە دڵێکی شکاوەوە، هێشتا تۆ کراوەیت. لەم زریانە ڕزگارم بکە. بێکەسترین بەندەی تۆم. بزر بووم و لە ناوەڕاستی دارستانێکدا دەسوڕێمەوە و هەوڵ دەدەم ڕێگاکەم بدۆزمەوە، بەڵام هەموو درەختەکان هاوشێوەن، هەموو ڕێگەکان دەگەڕێنەوە خاڵی سەرەتا. هیچ کەسێک لەم دارستانەدا ڕێگاکەی نادۆزێتەوە، جگە لەوانەی کە تۆ ڕزگاریان دەکەیت. پەروەرێنم بمپارێزە، چون بەڕاستی ناتوانم خۆم بپارێزم.



## دڵم پەرتووکێکی ئاوەڵایە

دڵم پەرتوکێکی ئاوەڵایە،
بە چیرۆکەکەم دەست پێ دەکات.
پێیان بڵێ پەندەکەت وەرگرت.
هەموو کاتێک وەریدەگریت،
بە دوای کامڵیدا دەگەڕێیت لە شتێکی ناکامڵدا.
بە دوای پەناگەیەکدا گەڕایت لە خانوویەکی پووشینیدا.
کاتێک زریانەکە هەڵیکرد،
ڕووت و تەنها بوویت.
دانەپۆشراو.
چەندین ساڵت بەسەر برد لە خواردندا
بەڵام ئەوە تەنها هەوا بوو
و سەرسام بوویت کە بۆچی هێشتا خاڵیت.
چیرۆکیان بۆ گێڕایتەوە
و بڕوات پێ کردن...
پاشان چاوەڕێی پەریی ددان[٢] بوویت

٢) پەریی ددان(tooth fairy) دیمەنێکی خەیاڵییە زیاتر لە ئەفلامکارتۆنەکاندا هەیە،

تاکو گۆڕانکاریت تێدا بکات.
ئیستایش هەموو شتێک دەبەخشیت
بۆ بەڕاست گەڕاندنی چیرۆکەکە.
واز بهێنە
چیرۆکێکی باشتر هەیە
کە تەنها چیرۆکێکی ڕووت نییە
بەڵکوو ڕاستییە.
بەڵام تێیدا پاڵەوانەکە هەرگیز نامرێت
خوێنی لێ نایەت، یا ناگرییێت
نموونە ڕاستەقینەکە بدۆزەرەوە
لەبەری بکە.
لەسەر دڵت هەڵی بکۆڵە.
و پاشان
پێشکەشی جیهانی بکە، تاکو بیخوێننەوە.
دڵت پەرتووکێکی ئاوەڵایە.

---

کە پەرییەکە و ددانێکی پێیە.



## برینەکە

خەمبار مەبە بەهۆی برینەکەوە،
چونکە تەنها بۆ ئازادکردن و سەربەستی تۆیە،
لەو کۆتوبەندەی تۆی بەستووە بە زەوییەوە
و کۆتوبەندەی کردوویتی بە سێبەری خەڵکییەوە
ئاوی تراویلکە تینوێتی ناشکێنێت
بەڵام زۆر سەرنجڕاکێشە بە لای کەسانی تینووەوە
زۆر دەترسم کە هەرگیز نەزانم ژیانێکی تر هەیە
جیاواز! زۆر جیاواز!
ئەگەر دەستبەرداری ببم، پلەم بەرزتر دەکەیتەوە؟
لە سەرووی خەم و ویست و لەدەستدانەوە
لە سەرووی هەموو ئەو شتانەی تاکو ئێستا زانیومن
بەرزترم بکەرەوە، لە زەوی دامببڕە
هاوشێوەی ڤاکسینێک[٤] کە نەخۆشت دەخات تاکو بەهێزتر بیت
برینەکە کاتییە، ئازادییەکە هەمیشەیی.

---

٤ ) ڤاکسین(vaccine): واتە پێکوتە، بە عەرەبی واتە لوقاح.



## خەڵوەت

ئێسکەکانم دەیانەوێت بتوێنەوە
ماسوولکەکانم دەیانەوێت ئازاد بن
جەستەم دەیەوێت بوەستێت لە
ڕۆیشتن،
هەوڵدان،
جەنگان،
بۆ هەوا،
بۆ ژیان.
ئەندێشەم وێنەیەکی بۆ کێشاوم،
بەڵام لە ئێستادا تەنها خەیاڵاتە،
درەختەکان چەماوە و ماندوو و داخراون
هاوشێوەی دڵم
بەڵام هێشتا بیرکردنەوەکانم دەدوێن،
دەڕۆن،
هەوڵ دەدەن،
دەجەنگن،

بۆ هەوا،
بۆ ژیان.
چۆن دەتوانیت وێنەیەکی بەو شێوەیە ڕوون،
ڕاستەقینە بسڕیتەوە؟
پێم بڵێ چۆن خۆمی تێدا بسڕمەوە،
و هەنگاوە ماندووەکانم دابنێم تاکو پشوویەک بدەن.
دەبینم
هەڵدەکەوم،
و ناڕۆم
هەنگاو دەنێم
قسە ناکەم.
ئازارێک لە سینەمدایە
لە بێدەنگی و ئازار و نائارامی هاتۆتە بوون
کێ لەوێیە جگە لە من تاکو باسی بکەم؟
کێ دەزانێت جگە لە من تاکو ناوی بنێم؟
بەداخەوەم بۆ بێباکیم،
ماندوویی و بێهێزیم لە بەری بەیان،
ئێستا بە دارستانەکاندا دەسووڕێمەوە
هەوڵ دەدەم خەڵوەتەکەم بدۆزمەوە
ئایا سروشم بۆ هاتووە؟
دەنگی کێیە کە دەیبیستم؟
دەنگی خۆم توند و بێزارکەرە.
کێی تر ناوم دەزانێت؟
تەنها بەهۆی میهری ئەوەوەیە
کە دڵ دەتوانێت بدوێت

کاتێک ئەقڵ و جەستە
سڕن،
تەنها پەلکێشم دەکەن.
تکایە وەرە،
ئەگەر تەنها بۆ ئارامکردنی بیرکردنەوەکانم بێت،
بەنێو دارستانەکاندا دەسووڕێمەوە
بە باڵەکانم
هێشتا بەدوای خەڵوەتدا دەگەڕێم.
چیدی
ناڕۆم،
هەوڵ نادەم،
ناجەنگم.
هەواکەم بەدەست هێنا
ژیانم بەدەست هێنا.



## بەردەوامم لە هەنگاونان

هەموو ڕۆژێک لە چاوپێکەوتنەکەمان نزیکتر دەبمەوە.
وا هەست دەکەم هەزاران ساڵە بەم ڕێگەیەدا هەنگاو دەنێم
بەرەوڕووی تۆ...
و هێشتا لەوێ نیم.
زۆر نزیکم، کەچی هێشتا زۆر دوورم
بەڵام بەردەوامم لە هەنگاونان،
سەرەڕای فرمێسکەکان،
سەرەڕای بایەکە،
سەرەڕای ئەژنۆ لاوازەکانم و ئێسکە شکاوەکانم،
سەرەڕای هەڵئاوساوی و برینەکانم، کە دڵمیان بەم ڕۆژە گەیاندووە،
بەردەوامم لە هەنگاونان...
بەرەوڕووی تۆ.
تەنها یەک ئاڕاستە هەیە،
یەک ئاڕاستە:
بەرەوڕووی تۆ.
لە لای تۆوە، بەرەوڕووی تۆ.

هیچ شتێکی ترم نییە.
هیچ شتێک.
ئەوەیش هەژاری منە.
بەردەوامم لە هەنگاونان
چونکە لەدوای هەموو ڕۆژئاوابوونێکەوە، هەڵهاتنێک هەیە،
لە دوای هەموو زریانێکەوە، پەناگەیەک هەیە،
لە دوای هەموو کەوتنێکەوە، هەڵسانەوەیەک هەیە،
لە دوای هەموو فرمێسکێکەوە، سڕینەوەی چاوان هەیە.
لە هەر شوێنێکدا کە بریندار کراویت، چاکبوونەوەیەک هەیە،
و دروستبوونەوەیەکی پێستیش هەیە بەهێزتر لەوەی کە هەبوو
بەردەوامم لە هەنگاونان
چونکە سوێند بە پەروەردگار هیچ شک نابەم جگە لە میهری تۆ.
هیچ شک نابەم جگە لە پەیمانی تۆ
وشەکانت
پەیمانەکە بریتییە لە
﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَـٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ٦﴾ ئەی
ئینسان بەڕاستی تۆ خۆت زۆر ماندوو دەکەیت، زۆر ڕەنج و
زەحمەت دەکێشیت، سەرئەنجامیش دەبێ بگەڕێیتەوە بۆ لای
پەروەردگارت، تاکو پاداشتی ڕەنج و هەوڵەکەت وەربگریت(٦)»
(سورەتی الانشقاق).



## یاسەمین موجاهید

خاتوو یاسەمین موجاهید بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە (دەروونناسی) و بڕوانامەی ماستەری لە (ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندن) لە زانکۆی (ویسکۆنسین مادیسۆن)دا بەدەست هێناوە. دوای تەواوکردنی خوێندنەکەی، وانەی خوێندنە ئیسلامییەکانی وتووەتەوە، وەکو بەڕێوەبەری لاوان خزمەتی کردووە. هەروەها وەکو مامۆستای نووسین لە زانکۆی (کاردینال ستریچ) کاری کردووە، وتاربێژی نێودەوڵەتی و وانەبێژی بانگهێشت کراوە بۆ هەریەک لە زانکۆکانی ئۆکسفۆرد، هارڤارد، یەڵ، ستانفۆرد، چەندان زانکۆی تر لە سەرانسەری جیهاندا. وەکو دەستەی نووسەران لە بەشی ئیسلامی ڕۆژنامەی (ئینفەوکەس نیوز)دا کاری کردووە. لە ئیستادا مامۆستایە لە (پەیمانگای المغریب)، هەروەها نووسەرە لە (هوفینگتۆن پۆست)، خاتوو یاسەمین موجاهید وتاربێژێک و نووسەرێکی نێودەوڵەتییە، لە زۆربەیَ بەرهەمەکانیدا جەخت لەسەر پەرەپێدانی ڕۆحی و کەسی دەکاتەوە. دەتوانن سەردانی سایتەکەی خاتوو یاسەمین بکەن (**yasaminmogahed.com**) بۆ بینینی کۆکراوەی نووسین و هۆنراوە و وانەکانی.

## Yasmin Mogahed

کتێبی "دڵت بێنەوە" لەسەرووی جوانیەوەیە...زۆر سوپاس خاتوو یاسەمین بۆ ئەم پەرتوکە سەرنجڕاکێشە. دیدگای منت لەبــارەی ئەم ژیــانەوە بە تەواوی گــۆڕی، فێــرت کــردم دەســتبەرداری ئەو خەیاڵاتــانە بــم کە تێیــدا دەژیــم، و تەنهــا سەرنجم لەسەر ڕۆژی دوایی بێت، سوپاس بۆ بەڕێزتان واتان لێکردم بڕوام بە دەرفەتی دووەم و سێیەمیش هەبێت..دەزانم کامــڵ و بــێ کەموکــوڕی نــیم. بەڵام هەوڵــدەدەم بــبم بە کەســێکی باشــتر. وتەکانــت ســوکنایین یارمەتیــان داوم بە خەنــدەوە بە ئــارامی بنــووم تەنــانەت لە نــاڕەحەترین شەوەکانی ژیانمدا. هەر بۆیە هیوای باشترینت بۆ دەخوازنم.

**دالیا ئی.ئێن.**

پەرتــوکی "دڵــت بێــنەوە" تێڕوانینێکــی تەواو جیــاوازی پێبەخشیم لەبارەی مەبەستی ئەم ژیانەوە، بڕوانــاکەم کەسێک هەبێــت ئەم پەرتــووکە بخــوێنێتەوە و کەڵــک لە داناییەکــانی وەرنەگرێت.

**گۆڤاری سیستەرز.**

٧٠٠٠ هەزار دینار
ISBN: 978-9922-626-24-6
9 789922 626246

07501269689
07511408868
hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com
سلێمانی - بازاڕی ئاویاریک- نهۆمی یەکەم
... (ژمارە ٦٦)